ناوی کتێب: کوورەی شۆڕش کێی سوتاند؟

نووسەر: جمعە کانی لەلەیی

ناوەرۆك: لێکۆڵینەوە-ژیاننامە

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

هەڵەبڕ: مامۆستا مستەفا چاوشین

دیزاین: محەمەد جەبار

شوێنی چاپ: تاران

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ساڵی چاپ: ٢٠٢١

ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٢٨١) ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە.

# پێرست

# کورتەیەك لەسەر نووسەر



-لەساڵی ١٩٧٣ لەگوندی (کانی لەلە)ی سەر بە ناحیەی تەق تەق لەدایکبووە.

-دەرچووی پەیمانگای تەکنیکی کۆیە - بەشی کارگێری یاسایە.

**-چوار کتێبی بەچاپ گەیاندووە :**

* کەرکووك لەبەردەم شاڵاوی بەعەرەب کردن دا، لێکۆڵینەوەی سیاسی، لە ساڵی ٢٠٠١

* مەملەکەتی دڕکاوی، ڕۆمان ، لەساڵی ٢٠١٥

*ڕەش و سپی، ڕۆمان ، لەساڵی ٢٠١٩

*کوورەی شۆڕش کێی سوتاند؟ لێکۆڵینەوە-ژیاننامە، لەساڵی ٢٠٢١

-پێنجەم کتێبی ئامادەیە بۆ چاپ بەناوی دزەکانی شار، ڕۆمان.

-تا ئێستا زیاتر لە ٦٣٠ وتاری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاوکردۆتەوە.

# پەیڤێکی کورت لەجیاتی پێشەکی

بەرلەوەی هیچ قسەیەك لەسەر ژیان و ڕابردووی شەهید ئەحمەد قەمبەری بکەین ' پێویست دەکات لە ڕووی مێژووییەوە تیشك بخەینە سەر شۆڕشەکانی ئەم دواییەی کوردستان، ئامانج و مهامە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکانی بخەینە بەر شەن و کەو کردن و بگەڕێینەوە بۆ هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارەی تیایدا شۆڕش کڵپەو تین و تاوی سەند و درێژەی کێشا، هەروەها ئاکام و دەرەنجامە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ئابوریەکانی هەڵبسەنگێنین و ئەو شوێنەوارو دەرکەوتانە باس بکەین کە لە دوای ڕاپەڕین ڕەنگی دایەوە لە ژیانی ئیداری و شێوازی حکومڕانێتی و تەنانەت ڕەوشت و ئاکاری تاك بەتاکی کۆمەڵگەی کوردستان.

لە بنچینەدا دەکرا کورد لەگەڵ حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم ڕێکبکەوتایەو پەنای بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش نەبردایە، سەرکردایەتی ئەوسای کورد بە هیچ شێوەیەك لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەنجامەکانی هەڵگیرساندنی شۆڕش نەکرد و زیان و قازانجەکانیان بە یەکتر بەراوورد نەکرد تا بۆیان

دەربکەوتایە قازانجی کورد لە ڕێککەوتنە یان هەڵگیرساندنی شۆڕش ؟ ئایا دەسکەوت و مافە نیشتیمانی و نەتەوەییەکانمان لەپێکهاتن بەدەست دەهات یان لە شۆڕش هەڵگیرساندن ؟

بڕوای تەواوم بەوە هەیە گەر سەرکردەکانی کورد لەساڵی ١٩٦١ بە ئۆتۆنۆمیەکی سادە ڕازی بونایە هەرگیز گەلەکەمان توشی جینۆساید کردن نەدەبوو.

لەم کتێبەدا وێڕای ژیان و بەسەرهاتی شەهید ئەحمەد قەمبەری، کەمێك لەسەر شۆڕشەکانی کوردستان و هۆکارو ئاکام و ئامانج و ئەنجامەکانی و شێوازو ڕێبازی حکومڕانیمان دەدوێین.

جمعە کانی لەلەیی

# کورد و چەمکی شۆڕش

وا پێناسـەی شـۆڕش کـراوە کـە بریتیـە لـە سـەرهەڵدان و فشـارێکی فـراوان و ئامانجـداری بەشـێك لـە کۆمەڵگە، مەبەسـت لێی گۆڕینی بارودۆخێکـە بـۆ بارووودۆخێکـی نـوێ و باشـتر، پێناسـەی شـۆڕش بــە شـێوە زانسـتی و هەمەلایەنەکـەی تەنهـا لــە کاری چــەك و بزووتنـەوەی چەکـداری و یـەك شـێواز و ڕێـگا کـورت نەکراوەتـەوە بەڵکـو ماناکـەی فراوانـترە و چەندیـن بـواری تـر لەخـۆ دەگرێـت وەك شۆڕشــی فەرهەنگــی و ڕۆشــنبیری، شۆڕشــی پیشەســازی، شۆرشـی ئەلکترۆنـی، شۆڕشـی ژینگەیـی، شۆڕشـی زانسـتی، شۆڕشـی تەندروسـتی و شۆڕشـی تەکنەلـۆژی و .......... هتـد.

لای کـورد چەمکـی شـۆڕش بریتـی بـوە لـە کـردەو جوڵانەوەیەکـی چەکدارانـەی گەلێکـی ژێردەسـتەو سـتەملێکراو تـا ئـەو دەوڵەتانـەی داگیــرو دابەشــیان کــردوەو ڕۆڵەکانــی دەچەوسـێننەوەو زەوی و ئاسـمان و داهاتەکانـی بـۆ بەرژەوەنـدی خۆیـان بـەکار دەهێنــن، ملکـەچ و ناچــار بکــەن بــە گێڕانــەوەی هەمــوو ئــەو مافانــەی بەدرێژایـی ژیانـی ڕابـردوو زەوتیـان کـردوە.

سەرکردەکانی کورد پێیان وا بوە بارودۆخی سیاسی کوردستان لەدوای هاتنی بەعسیەکان بۆ سەر دەسەڵات ئەوەی گەرەك بوە کە ڕۆڵەکانی کورد شۆڕشی چەکداری هەڵگیرسێنن، هەر بۆیە یەك ماناو پێناسەیان داوە بە شۆڕش کە بریتی بێت لە دەستەو تاقمێکی چەکدار بە چەشنێك هەموو جمووجۆڵ و ئاراستەکانی لەپێناوی بەدەستهێنانەوەی گشت مافە خوراوەکان بێت. لەڕاستیش دا ناکرێت یەك حزب بەپێناسەو خاوەنی شۆڕش بزانین، دەشێت شۆڕشی کوردستان بریتی بوبێت لە چەکدارو هەژموونی سیاسی و سەربازی چەندین حزب و ڕێکخراو کە هەوڵ و تەقەڵلایان دابێت بۆ بەدەست هێنانی یەك ئامانج و ستراتیژی دەستنیشانکراو.

بەپێی ئەو ناساندن و پێناسەیەی بۆ شۆڕش و سەرهەڵدانی چەکداری کراوە لە باشووری کوردستان و بۆ سەردەمی تازە تەنها سێ جولانەوە دەچنە خانەی هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە ، ئەوانیش بریتین لە شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی حەفید، شۆڕشی ئەیلوول، شۆڕشی نوێ. گەرچی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود قسەی زۆرو لێکدانەوەو باس و ڕاڤە کردن هەڵدەگرێت بەلام ئێمە لەم باسەدا خۆمانی لێ دەبوێرین و تەنها کورتەیەك لەسەر شۆڕشی ئەیلوول و نوێ باس دەکەین کە لەیەك کاتدا پیاوی پاك و دڵسۆزو تێکۆشەریان تیابوو

هەروەهـا كەسـانی بوودەڵـەو نابـووت و بەرژەوەندخـوازو دزو ناپاكیشـی تیـا بـوو، لـەم دوو شۆڕشـە هەندێـك كـەس و خێـزان و بنەماڵـە فـرە قازانجیـان كـرد ' هەندێـك كـەس و خێـزان و بنەماڵـەش بـۆ هەتا هەتایـە ئاگـری كوانـووی ژیانیـان كوژایـەوەو تیـای چـوون.

دەمەوێـت بڵێـم پێویسـتە بەچـاوی ڕەخنـەو دەستنیشـان كردنـی كەمووكورتـی و ناتەواویەكانـەوە مێـژووی دوورو نزیكـمان بخوێنینـەوەو قسـە لەسـەر شۆڕشـەكان و ئـاكارو ئامانـج و سـتراتیژیەتیان بكەیـن نـەك شـاردنەوەو داپۆشـینی عەیـب و عـارو كەمووكـوڕی و ناشـیرینیەكانیان و پیاهەڵدانێـك كـە لەشـوێنی خۆیـدا نەبێـت، هەندێـك كـەس پێـی وایـە نوسـینەوەی كەمووكورتـی و عەیـب و عـارو خراپیەكانـی هـەردوو شـۆڕش دەچێتـە خانـەی خزمـەت كـردن بـە دووژمـن و لەكەداركردنـی ناوبانگـی شـۆڕش و شـكاندنی شـكۆو گەورەیـی كـوردو ناشـیرین كردنـی مەسـەلەی كـورد' بۆیـە پێویسـت نـاكات بەهیـچ شـێوەیەك هەڵسـەنگاندنیان بـۆ بكەیـن، پێچەوانـەی ئـەم بۆچوونـەش ئەوەیـە وا باشـترە مێـژوو بـە مـەدح و پیاهەڵـدان نەنوسرێتـەوەو عەیـب و كەمووكوڕیـەكان پەردەپـۆش نەكرێـن و ناشـیرینی و پیسـی و خەوشـەكانی پەنـا نەدرێـن ' بەلایەنـی كـەم بـۆ ئـەوەی نـەوەی تـازە چـاو لەخراپەكاریەكانـی نـەوەی كـۆن نەكـەن و هەمـان هەڵـە دووبـارە

نەکەنەوەو نەبن بەخاوەنی هەمان خەسڵەت و خوو کە زیانی گەورەی بە کوردو ناوبانگی شۆڕش و گیانی شۆڕشگێڕێتی گەیاندوە.

هەردوو شۆڕش بەدەر نین لەخەوش و خراپەو کاری ناپەسندو ڕفتارو ئاکاری دوور لە گیانی شۆڕشگێڕێتی و مەرامی تایبەتی و شەخسی، بەڵکو پڕ بوە لە کارگەلێك کە تا ئێستاش ماکە خراپەکانی بەسەر ژیانمانەوە ماونەتەوە نەسردراونەتەوەو نەوە دوای نەوە دەگوازرێتەوە بۆمان، تەنانەت دوای ڕاپەڕینیش کاری کردۆتە سەر شێوازو ڕێبازی حکومڕانێتیمان، بۆیە پێویست دەکات بە جورئەتەوە هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەین و بیانخەینە ڕوو، هیچ نا بۆ ئەوەی خراپ و باش، پاك و پیس، جوان و ناشیرین لە یەکتر جیا بکرێنەوەو ئێستامان بەو هۆش و هەستە ناڕاستە نەبەین بەڕێوەو نەوەکانی داهاتوی پێ فریو نەدەین و ئەوان هەمان هەڵە دووبارە نەکەنەوە.

لە دەیان بۆنەی جیاجیادا بەشێك لە سەرکردەکانی شۆڕش بەنوسین و وتاری ناو رۆژنامەو گۆڤارو نوسینەوەی یاداشت و یادەوەریەکانیان، چ لە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی و کۆڕو سمینارو کۆبوونەوەکانیان هەڵوێستی خۆیان و ساڵانی پێشمەرگایەتیان بە خەڵك فرۆشتۆتەوەو دەڵێن ئەم ئازادی و دیموکراسی و ئەم سەدان دەسکەوتەی هەیە بەری ڕەنج و

تێکۆشـان و پێشـمەرگایەتی ئێمـە بـووە ، گـەر ئێمـە نەبوینایـە ئـەم دەسـکەوتانەش نەدەهاتنـە دی. بـەم گوتـارە منـەت ئاسـاو بـەم فرۆشـتنەوەی هەڵوێسـتانەیان زۆرینـەی خەڵکیـان ڕازی کـردوە بـە ژیانێکـی مەمرەو مـەژی و خۆشـیان لـە هیچیـان کـەم نەبـوەو ویسـتویانە ڕازی بـوون و شـکور بـوون بـەو بەشـەی بۆیـان دیـاری کـراوە بکـەن بـە بیرکردنـەوەی تێکـڕای کۆمەڵگـە ، و تاکەکانـی کۆمەڵگـە تـا مـاون شـەرعیەت بـدەن بـە بیرکردنـەوەو شـێوازی بەڕێوەبـدن و ژیانـی شـاهانەی ئـەوان ، لەکاتێکـدا بەشـێك لـەوان بـوون شـەڕی براکوژیـان بـە خەڵـك کـرد، هەندێکیـان بـوون خەڵکیـان فێـرە دزی و شـڕەخۆری و لادانـی کۆمەڵایەتـی کـرد، بەشـێك لـەوان بـوون ناپاکـی و خیانـەت و ڕاوەرووت و شـەڕو ماڵویرانیـان داهێنـا.

ئەگـەر بەگژاچوونـەوەی حکومەتـی عێـراق و ڕاپەڕیـن و شـەڕی چەکداری بەدەسـکەوتی گـەورەی خۆیان بزانن ئـەوا دەبێت ئەوان و خەڵکیـش لـەو ڕاسـتیە تێبگـەن کە لـە ئەجامـی کاری چەکدارانەی ئـەوان هـەزاران خێـزان لـە پرۆسـەکانی ئەنفـال و کیمیـا بـاران و هێرشـی جیاجیای سـەربازی و ڕەشـبگیری ناوشـارەکان و ڕووخاندنی ٤٥٠٠ گونـدی کوردسـتان و سـوتاندنی هـەزاران دۆنـم ڕەزو بـاغ و زەوی و زاری کشـتوکاڵی و شـەڕی چەنـد بـارەی براکـوژی توشـی گەورەتریـن ئافـات و زیانـی گیانـی و مـاددی بـوون.

ئەگەر بەراوردێکی واقعیانەی شۆڕشی ئەیلوول و نوێ بە شۆڕشەکانی کوباو نیکارۆگواو چین و ئەنگۆلاو سلڤادۆرو مۆزەنبیق و شۆڕشەکانی تری جیهان بکەین ئەوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە شۆڕشەکانی کوردستان بەشێکی زۆر کەم لە ئامانجە نەتەوەیی و نیشتیمانی و سیاسی و ڕۆشنبیری و کەلتوریەکانی هێناوەتە دی، دەکرا دەسکەوتەکان زۆرتر بن بۆ نموونە دروستکردنی زمانێکی یەکگرتووی نوسین و خوێندن لە سەرتاسەری هەرێمی کوردستان، دروست کردنی سوپایەکی یەکگرتووی تۆکمەی نیشتیمانی بەجۆرێك حکومەت خاوەنی بوایە نەك سەرکردەو حزبەکان، دراوی محەلی ڕێگە پێدراو، ئابووریەکی نیمچە سەربەخۆی نیشتیمانی پتەو، کوردستانێکی بەهێز .

گەر ئازاد کردنی هەرێمی کوردستان بە یەك لە دەسکەوتە نەتەوەیی و نیشتیمانیەکانی تەنها خۆیان بزانن ئەوا توشی هەڵە دەبن چونکە جگە لەوەی کۆمەڵانی خەڵك و ڕێکخستنەکان و هێزە چەکدارەکان شان بەشانی شۆڕش بەشداریان لە ڕاپەڕین کرد، هەلومەرجی سیاسی جیهان و ناوچەکەش زەمینەی ڕاپەڕینی خۆش کرد، بە واتایەکی تر گەر حکومەتی عێراق کوەیتی داگیر نەکردایەو کەللە ڕەقی نەکردایە لە بەرانبەر ئەمریکاو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پێمان

وانیە زەمینەی ڕاپەڕین ساز ببوایە تا ئەوان ئەمڕۆ شۆڕش کردن بە خەڵك بفرۆشنەوەو شۆڕشگێڕێتی خۆیان بکەن بە ئامرازی دادۆشینی ئابووری کوردستان بۆ خۆیان و بێبەش کردنی هاوڵاتیان لێی. ڕاستیەکی بەرجەستە کراویشە کە بەهۆی ناپەسەندی ئیداری سەرکردەو فەرماندەکانی شۆڕشەوە کۆمەڵگەی کورد زۆر بەهای گەورەو بەنرخی لەدەست دا کە بە دەیان ساڵی پەروەردەی ڕاست و دروست و تێکۆشان و هەوڵ و ماندووبونی زۆر قەرەبوو ناکرێنەوەو ناگەڕێنەوە شوێنی جارانیان بۆ نموونە خۆشویستنی نیشتیمان و گەل.

ئاخر چۆن دەکرێت تەواوی هێزی پێشمەرگەو سەرکردەو فەرماندەکان لە هەردوو شۆڕشدا بە فریشتەو فریادڕەس بزانین و واش بیانخەینە ڕوو کە چەك هەڵگرتن و شاخ پێوانی هەندێکیان لەپێناوی مەسەلەی کوردو ڕزگاری و سەربەستی گەلی کورد بوە ؟ لەپاڵ ئەوەی بەشێکیان لەو کەسانە بوون کە خۆشەویستی نیشتیمان و چەوسانەوەی گەلەکەیان تاکە هۆکارو پاڵنەر بوە تا ببن بەپێشمەرگە بەڵام سەدانیشیان لەو کەسانە بوون کە بۆ مەرامی تایبەتی و لەپێناوی مەسەلەیەکی تایبەتی خۆیان چەکیان هەڵگرتبوو و بووبوون بەپێشمەرگە نەك تێکۆشان و بەرخۆدان، لەناو ئەم جۆرە خەڵکانەدا کە ئێستا لە ژیاندا ماون لە دوای ڕاپەڕینەوە بوون بە ئەندامی مەکتەبی

سیاسی و سەرکردایەتی حزبەکان و فەرمانـدەی بـەرزو بەرپرس و گـەورەی وڵات و چارەنوسی لایەکی ئـەم مەملەکەتەیـان پێ سپێردراوە، هەمانـە بـە کوێـرە خوێندەواریەکـەوە بـوە بەوەزیـرو پەرلەمانتـارو بـوە بـە بەشێك لـە سیسـتەمی حکومڕانـی وڵات، هەمانـە خانەنشـین کـراوە بـە پلـەی وەزیـرو بەڕێوەبـەری گشـتی، هەشـمانە لـە بگـرەو بەردەکانـی شـاخ تیـا چـوە.

## شۆڕشی ئەیلوول

گەرچی شارەزایانی سیاسی دەڵێن هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول پەرچەکرداری فیودالزمی کوردی بوو دژ بەیاسای چاکسازی کشتووکاڵی کە عەبدولکەریم قاسم دوای ڕووخاندنی ڕژێمی پاشایەتی کردیە ئەرکی لەپێشینەی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بڵێین شۆڕشی ئەیلوول لەڕووی بابەتی و مێژووییەوە کاریگەری خۆی هەبوە لەسەر بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری عێراق و ناوچەکەو کاری کردە سەر ژیانی کۆمەڵگەی کوردستان، تەنانەت ئاراستەی سیاسی و کۆمەڵایەتی گەلی کوردیشی دەستنیشان کرد بۆ ئەو قۆناغە.

شارەزایان دەڵێن بارزانی دوای گەڕانەوەی لە ڕووسیا ویستی دواین ساڵەکانی تەمەنی خۆی بەو مووچەیەی کە عەبدولکەریم قاسم بۆی دیاری کردبوو لە بەغدای پایتەخت بباتە سەر، بەڵام لە کتوپڕێکدا بەغدای بەجێهێشت و گەڕایەوە ناوچەی بارزان و کەوتە دژایەتی کردنی عەبدولکەریم قاسم، دواتر هەڵگەڕایەوە لەبەغداو دواتریش هەڵگیرساندنی شۆڕشی لێ کەوتەوە، دەتوانین تێکچوونی پەیوەندیەکانی بارزانی و قاسم

بـۆ دوو فاکتـەری سـەرەکی بگێڕینـەوە:

**یەکـەم** : ئـەو سـەردەمە ، جیهـان لەنـاو جەنگـی تـازە هەڵگیرسـاوی سـارد دا خـۆی بینیـەوە، قاسـم هـەر لەتەمەنـی گەنجێتـی خۆیـەوە لـە ژێـر کاریگـەری بیـری چـەپ و مارکسـیزم دا بـوە ، ئـەم سـەرەتاو پێشـینە سیاسـی و ئایدیۆلۆژیـەش بەرچـاو ڕوونـی دایـە ئەمریکیـەکان کـە دەوڵەتـی عێـراق بـە لایەنگـری یەکێتـی سۆڤیەت بزانـن لـە جەنگـی سـارد دا ، بۆیـە ئەمریکیـەکان ختوکەی بارزانیـان دەدا تـا شۆڕشـی پـێ هەڵگیرسـێنن ، بـە لایەنـی کـەم بۆ ئـەوەی قاسـم بـە شـەڕی کـوردەوە سـەرقاڵ بکـەن و نەپرژێتـە سـەر جێبەجـێ کردنـی ئەجێنـدای شـوورەوی.

**دووەم** : دەرەبـەگ و ئاغاکانـی کوردسـتان ، ئەوانـەی خاوەنـی زەوی فـراوان و موڵکـی چەندیـن گونـد بـوون بـە یاسـای چاکسـازی کشـتووکاڵی کـە یـەك لـە بڕگەکانـی یاسـاکە دابـەش کردنـی زەوی ئاغـاکان بـوو بەسـەر جوتیاراندا نـاڕازی و سـەغڵەت بـوون، هـەر بۆیـە پەنایـان بـۆ بارزانـی بـرد تـا شۆڕشـی پـێ هەڵبگیرسـێنن و پەیوەندیەکانـی کـورد و بەغـدا تێکبـدەن و دەوڵەتـی عێـراق نەتوانێـت ئـەو یاسـایە لـە کوردسـتان جێبەجـێ بـکات.

دەتوانیـن بـە پرسـیارێکی سـادە لێکۆڵەرانـی سیاسـی بهێنینـە دەنـگ : ئەگـەر بارزانـی شۆڕشـی هەڵنەگیرسـاندایەو دوای نسـکۆی

شۆڕشــی ئەیلــوول  درێــژە  بــە خەباتــی  چەکــداری  نەدرایــە  ئایــا کــورد جینۆســاید  دەکــرا ؟ ئایــا  کــورد  دەیتوانــی  لەگــەڵ  ڕژێمــە یــەك لــەدوای  یەکەکانــی  عێــراق  هــەر لــە ســەدەمی  عەبدولکەریــم قاســمەوە  تــا ســەردەمی  ســەددام حوســێن  بەئاشــتی  بــژی ؟ وڵامەکە بــۆ توێــژەران  بەجێدەهێڵــم .

لــە شۆڕشــی  ئەیلــوول دا  زۆربــەی  فەرماندەی  بەتالیــۆن و هێزەکان و فەرمانــدە  بــاڵاکان   ژیــان و جلوبــەرگ و خــواردن و پێداویســتیەکانیان جیــاواز بــوون  لــە ژیــان و جلوبــەرگ و خواردنــی پێشــمەرکە،  کــە دەچوونــە گوندێــك  بــۆ  دابــەش بــوون و  نــان خــواردن  دەبــوو بەرپرســی  ئــەو هێــزە  لــە ماڵێکــی  دەوڵەمەنــد  نانیــان  بــۆ  ئامــادە بکرایــە،  هەندێــك جــار خەوتــن و تــراش و خۆشۆرینیشــیان  دەکەوتــە ئــەو  شــوێنە،  لــە بۆســەو  هێــرش و پەلامــاری دووژمنــدا  زۆربــەی فەرمانــدەکان  لــە دواوەی  بــەرەی  جەنــگ و  بۆســە  دانانــەوەو  لــە دووری  هێــرش و پەلامارەکانــی  دووژمــن  بوون و خۆیــان  نەدەچوونە دەســتەی  هێــرش کردنــە  ســەر مۆڵگاکانــی  دەوڵــەت ' بەڵکــو  تەنهــا پێشــمەرگەو سەردەســتەکانیان  دەنــارد،  لــەداوەت و نــان خواردنــە تایبەتیەکانیشــدا  چ لــە بارەگاکانیــان  یــان لەنــاو  مزگــەوت  یــان  لــە دیوەخانــەکان  بوایــە  پێشــمەرگەکان  تەنهــا  لــە خــوارەوەی  ژوورەکان و بگــرە ســەر پێڵاوەکانیــان  جێــی دانیشــتنیان  بۆ  دەکرایــەوە،  زۆربەی جاریــش پاشــماوەی  بەرپرســەکان  دەدرا  بــە پێشــمەرگە  یــان  هــەر

خواردنیـان بـۆ نەدەمایـەوە تەنهـا نـان و ماسـت و چایـەك یـان نـان و ماسـتاوێك نەبێـت، کـەم فەرمانـدەی هێـزو بەتالیـۆن لـە شۆڕشـی ئەیلـوول شـەهید یـان برینـدار بـوون، زۆربـەی ئەوانـەی شـەهید بـوون یـان برینـدار بـوون تەنهـا پێشـمەرگەی ئاسـایی و بێ پلـەو پایـە بـوە، کـوڕو بـرازاو خـوارزاو خزمـی بەرپرسـە گـەورەکان نەدەچوونـە بەرەکانـی جەنـگ و بۆسـە دانانـەوە بەڵکـو لـەدەوری بەرپـرس و فەرمانـدەکان کـۆ دەبوونـەوە، برسـێتی و توێنێتـی و سـەرماو گەرمایـان نەدەبینـی، کـەر هـاوکاری و مووچـەش هەبوایـە ناویـان لەپێشـەوەی لیسـتەکان بـوون.

ئـەو سـەردەمە بەتایبەتـی لـە دوای دەسـتپێکردنی گفتوگـۆی شـۆڕش و حکومـەت و وەرگرتنـی بڕێکـی زۆری هـاوکاری دارایـی لـە شـای ئێـران و ئەمریکیـەکان ' سـەرکردایەتی شـۆڕش بڕیاریـدا بـۆ هـەر پێشـمەرگەیەك وەك یارمەتـی مانگانـە پێنـج دیناریـان پـێ بـدات، بـۆ سەردەسـتە شـەش دینـارو بـۆ فەرمانـدەی هێـز نـۆ دینـارو بـۆ فەرمانـدەی بەتالیـۆن سـێزدە دینـارو بـۆ فەرمانـدەی بـاڵا هـەژدە دینـارو بـۆ ئەندامـی کۆمیتـەی ناوەنـدی بیسـت و پێنـج دینـارو بـۆ ئەندامـی مەکتەبـی سیاسـی سـی و دوو دینـار بـۆ هـەر مانگێـك تەرخـان کـرا بـوو، لـەو سەردەمەشـدا فەرمانـدە دەستڕۆیشـتوەکان نـاوی کـوڕو بـرازاو خـوارزای خۆیـان بەپێشـمەرگە نوسـیبوو و مانگانـە مووچەکانیـان

وەردەگرت و بڕێکی کەمیان لە مووچەکە دەدایە ئەوانەی ناویان نوسرابوو بۆ ئەوەی پێشمەرگە بن کە جۆرێك بوو لە بندیوار *، هەندێك جار بڕێك قەمسەڵەو قاتی کوردی و پێڵاو دابەش دەکرا کە ئەمریکیەکان یان شای ئێران لەو گەمە سیاسیەیاندا بۆ شۆڕشیان دەنارد ' لەو دابەش کردنەش فەرماندە دەستڕۆیشتوەکان بەشە قەمسەڵەو جلوبەرگیان بۆ ئەوانە وەردەگرت کە بەپێشمەرگە ناونوس کرابوون، دواتر لە گوندەکان دەیانفرۆشتەوە.

لەو سەردەمەدا بەتایبەتی پێش ساڵی ١٩٧٠، هێزی پێشمەرگە خاوەنی هیچ دسپلینێکی سەربازی نەبوو و بەشێوەی هەڕەمەکی لە یەکەی جیاجیا کۆ کرابوونەوە، هیچ خولێکی هۆشیاری و ڕۆشنبیریان نەدەبینی جگە لە کۆبونەوەی ناو بەناوی فەرماندەکان نەبێت ئەویش تەنها قسەی نیمچە بازاڕی بوو، لەکاتێکدا دەبوو شۆڕش خاوەنی دامەزراوەیەکی

* زاراوەی بندیوار لەدوای ساڵی ١٩٩١ بەدواوە کەوتە ناو ئەدەبیاتی سیاسیەوە لەکوردستان ' سێ جۆرە کەس دەکەونە ناو چوارچێوەی ئەم پێناسەیە، یەکەم: ئەوانەی فەرمانبەرن لە دامودەزگاو دامەزراوە حکومیەکان و هێزەکانی پێشمەرگەو ناوخۆ و مووچەی تەواوەتی وەردەگرن بەڵام دەوام ناکەن . دووەم: بەشێك لە بەرپرس و فەرماندەکان لە لیستی مووچەدا ناوی وەهمیان تۆمار کردوەو بەو ناوە وەهمیەوە مووچەی زیادە ( جگە لە مووچەی خۆیان ) وەردەگرن. سێیەم : ئەوانەی فەرمانبەرن لە دامودەزگاو دامەزراوەکانی حکومەت و دەوام ناکەن و بەشێك لە مووچەکایان دەدەن بە بەرپرسەکانیان ( بەپێی ڕێکەوتنی نێوان بەرپرس و فەرمانبەرەکە ئەو ڕێژەیە دیاری دەکرێت کە لە مووچەکە دەدرێت بە بەرپرسەکە.

ڕۆشنبیری نیشتیمانی بوایە بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگە بە بیرو هۆشی نەتەوەیی و دسپلین و زانستی سەربازی پەروەردە بکردایە تا ببن بە هێزێکی تۆکمەو لەشکان نەهاتوو، ببن بە ئەندامی دڵسۆزو کاراو کاریگەری شۆڕش و کۆمەڵگەی کوردستان و کاریگەریان هەبوایە لەسەر گۆڕینی ئاستی تێگەیشتن و بیرو هۆشی تەواوی کۆمەڵگە.

دەیان بەڵگەو نموونەی زیندوو و قێزەون هەن کە فەرماندەو پێشمەرگەی ئەو سەردەمە ئەنجامی داون و بووبوونە مایەی ئازاردان و بیزارکردن و تەنانەت ڕاکردنی خەڵك بەرەو شارەکان و ئەو شوێنانەی دەستی پێشمەرگەی پێ نەدەگەیشت، کێ دەوڵەمەند بوایە بە زۆر پارەیان لێ دەسەند، گەر نەشیدایە کێشەیان بۆ دروست دەکرد، کێ خاوەنی مەڕو ماڵات بوایە دەبوو پارە بدات یان ساڵانە چەند سەر مەڕو بزنێك بە شۆڕش ببەخشێت بەمەیان دەگوت (مەڕانە)، کێ زەوی و دەغڵ و دانی زۆری بوایە گەنم و جۆیان لێ دەسەند یان لەبری ئەوە پارەیان لێ وەردەگرت، ئەوە جگە لەوەی زۆرێك لە فەرماندەو پێشمەرگەکان گێچەڵی سێکسیان بە کچان و ژنانی لادێکان دەکردو لە ژێر زەبروزەنگ و هەڕەشە ناچاریان دەکرد بچنە ژێر باری داواکانیان.

سـەدان کەسـیان بەتاوانـی جیاجیا دەسـتگیرکردو لـە گرتووخانەکانی ڕایـات و مەمـی خـەلان ئەشـکەنجەیان داو تاوانـی جاسووسـی و شـیوعێتی و جەلالـی و مارکسـی و خوانەناسـیان دەخسـتە پاڵیـان و چەندینیـان لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا مـردن و دەیانـی تریشـیان گوللـە بـاران کـرد. سـەدان کەسـیان ناچـار کـرد پەنـا بـۆ سـێبەری دەوڵـەت ببـەن و هەندێکیـان بەناچـاری دەبـوون بـە جـاش و پیـاوی ئەمـن و ئیسـتخبارات ' لـە ئەنجامـی بێزارکـردن و لەناچاریـدا بەدڵسـۆزی کاریـان بـۆ دامـوودەزگا ئەمنیـەکان دەکـردو دژی نیشـتیمان و گەلەکـەی خۆیـان دەوەسـتانەوە.

لـەدوای سـاڵی ١٩٧٠ گەرچی سـەدان مامۆسـتای زانکـۆو پەیمانگاکان و دەیـان پزیشـك و جێگـر پزیشـك و کارمەنـدی تەندروسـتی و دەیـان ئەندازیـارو هـەزاران خوێنـدکاری ناوەنـدە باڵاکانـی خوێندن و سـەدان ئەفسـەرو جێگـر ئەفسـەر پەیوەندیـان کـرد بـە هێـزی پێشـمەرگەوە بـەڵام چونکـە سـەرکردایەتی شـۆڕش خاوەنـی هۆشـیاریەکی قووڵـی سیاسـی نەبـوو نەیانتوانـی کەڵك لە تواناو هزرو شـارەزایی و ڕادەی ڕۆشـنبیری و هێزی مرۆیی ئەو خەڵکە وەرگرن و ئاراسـتەیان بکەن تـا ببن بـە هێزێکی نوێ و کاریگەر، هەتا شۆڕشـیش هەرەسـی هێنا نەتوانـرا سـوود لـەو هەمـوو توانـا جۆربەجۆرانـە وەرگیرێـت کـە بۆ پاڵپشـتی شـۆڕش و مەسـەلەی کورد ڕوویان لە شاخ کردبوو، دواجار پەرتەوازەیـی و هەڵوەشـانەوەی ئـەو هێـزە گەورەیەی لـێ کەوتەوە .

# شۆڕشی نوێ

لەشۆڕشـی نوێشـدا * تـا سـەرەتای سـاڵی هەشـتاکان سـەرکردایەتی و فەرمانـدە بـاڵاکان و فەرمانـدەی هەرێـم و کەرتـەکان وەك پێشـمەرگە دەژیـان تەنانـەت لەخـواردن و جلوبـەرگ و لەپەلامـارو لەشکرکێشـی و لـە شـەهید دان و بریـندار بوونیـش لەگـەڵ پێشـمەرگەی سـادەدا وەك یـەك بـوون و جیاوازیەکـی ئەوتـۆ نەدەبیـنرا چونکـە شـێوەی پـەروەردە کردنـی ئەنـدام و ئاراسـتە کردنی هێـزی پێشـمەرگە لەسـەر بنەمـای شۆڕشـگێڕێتی ڕاسـتەقینە بونیـات نرابـوو، بـەڵام دوای سـاڵی ١٩٨٠ شـەڕی ئێران-عێـراق بـوە هۆکارێـك تـا سـەدان و بگـرە هـەزاران ڕاکـردووی سـەربازی بـبن بـە پێشـمەرگەو سـەدان گەنجـی تـر بـە هـۆکاری جیاجیا ڕوو لەشـاخ بکـەن و شـاخ و پێشـمەرگایەتی وەك پەناگەیـەك بـۆ خۆشـاردنەوە و هێنانـەدی ئامانجـی تایبەتـی خۆیـان بەکاربهێنـن ' پرۆسـەی چاودێـری کردنـی هەمـوو هێـزی پێشـمەرگەو سزادانیشـیان لەسـەر ڕفتـاری نابەجـێ و هەڵسـوکەوتی دوور لەپێشـمەرگانە و کەمووکوڕیەکانیـان بـوە کارێکـی گـران، تەنانـەت ئـەم زۆری و

---

* مەبەست لـە شۆڕشـی نـوێ، هێـزی پێشـمەرگەی تـەواوی ئـەو حـزب و ڕێکخراوانەیـە کە لەدوای نسکۆ دامەزرابوون و بوونیان هەبوو

بۆریـە لەلایـەك و لاوازبـوون و کەمبوونـەوەی دەسـەڵاتی حکومەتـی بەعـس لـە ناوچـەکان و فـراوان بوونـی ناوچەی ئازادکـراو لەلایەکی تـر، هەروەهـا ململانێـی سـەرکردەو فەرمانـدە بـاڵاکان لەسـەر پێگـەو دەسـەڵات و مەسـئولیەت و بۆیـاغ کردنـی ململانێکانیـان بـە ململانێـی فیکـری و ئایدیۆلـۆژی کـە دواجـار پەرتەوازەیـی و ناتەبایـی لـێ کەوتـەوە بـوە هـۆی ئـەوەی سـەرکردەکانیش خۆیـان لـێ بگۆڕێـت و بیرکردنـەوەو ئایدیایـان کاڵ بێتـەوەو ڕادیکاڵیەتیـان نەمێنێـت، هـەر بۆیـە شۆڕشـیش بەشـێك لـە سـەرەتاکان و خـوو و ڕەوشـت و دسـپلین و پرانسـیپەکانی خـۆی لەدەسـت دا.

تـا ژمـارەی هێزەکانـی پێشـمەرگە زیـادی دەکـرد لادان و خـراپ ڕفتارکـردن و دوورکەوتنـەوە لەپرانسـیپە جوانەکانـی شـۆڕش و ئامانجـە ڕەواکانیـش زیـادی دەکـرد، بەتایبەتـی دوای شکسـت هێنانـی گفتووگـۆی شـۆڕش و حکومـەت لـە سـەرەتای ١٩٨٥ کـە ژمـارەی هێزەکانـی پێشـمەرگە ( هێـزی گشـت لایەنـەکان ) لـە دە هـەزار کـەس تێپـەڕی، ئـەم لادان و خـراپ ڕفتـار کردنانـەش تەنهـا پێشـمەرگەی سـادەو سـاکاری نەگرتبـوەوە بەڵکـو زۆرێـك لـە بەرپـرس و فەرماندەکانیشـی گرتبـوەوەو بـوون بـە بەشـێك لـەو خراپەکاریانـە. لەسـەرەتای هەڵگیرسـاندنی شۆڕشـی نوێـدا هێـزی پێشـمەرگە وا پـەروەردە کرابـوون کـە لەدابـەش بـوون و چوونـە مـاڵان کەمتریـن ئـەرك و خەرجـی بخەنـە سـەر شـانی خەڵـك،

هەروەها پێیان دەگوترا هەموو ژن و کچێکی ئەم کوردستانە بە دایك و خوشکی خۆتان بزانن، خواردن و چێشتی تایبەتی بە هیچ خێزانێك دروست نەکەن و لە مالآن نابێت لە یەك چای زیاتر بخۆنەوە، داوای شتی ناپێویست و زیادە لە خەلك مەکەن، زۆربەی کات بە پێ جەولەی گوندو ناوچەکان بکەن، تێروانین و تەماشاتان بۆ خێزانەکان باوك و برایانە بێت، بەلآم لە دوای سالی ١٩٨٥ وە تا سالی ١٩٨٨ ئەم شێوازی مامەلەیەیان لەگەل خەلك گۆڕاو زۆربەی پێداویستیەکانیان بەزۆرداری دەخستە سەر شانی خەلك، بۆ نموونە بردنی سەیارەو تراکتۆری هاولآتیان بۆ جەولەو کاری پێشمەرگانە، وەرگرتنی بەنزینی زۆرە ملێ لە خاوەن سەیارەکان، تەنانەت بە زۆر هەندێك خەلکیان ناچار دەکرد تا ببێتە هاوکارو لایەنگریان، هەندیك جاریش قەمسەلەو جلی کوردی و پێلآو و پێداویستیە شەخسیەکانیان بە خەلك دەکرد.

وێڕای ئەوەی هێزی پێشمەرگە ( کەم نەبێت ) خاوەنی بارەگاو شوێنی حەوانەوەو نان خواردنی خۆیان نەبوون و لە مالآن نانیان دەخواردو نوێنیان لەوان وەردەگرت و خۆیان پاك دەکردەوە کەچی سەرانەو پارەشیان لە خەلك وەردەگرت بۆ نموونە بڕێك پارە کە لە ١٠ دیناری سویسری کەمتر نەبێت و لە ١٠٠ دینار زیاتر نەبێت لە هەموو خاوەن تراکتۆرو

سـەیارەو دەڕاسـەو مەکینـەی ( ئـاش) و مەکینـەی ئـاو و خـاوەن مێگـەل و گاوگۆلکێـك وەردەگـرت و ناویـان نابـوو تراکتۆرانـە، سـەیارانە، مەکینانـە، مەڕانـە...... هتـد. زۆر جـار وا ڕێککەوتـوە مەفرەزەکانـی حزبـی سۆشیالسـت و یەکێتیـی و شـیوعی و پارتـی لـە یـەك هەفتـەدا ئـەم سـەرانەو پـارە وەرگرتنانەیـان خسـتۆتە سـەر شـانی دانیشـتوانی یـەك گونـد، واتـە خەڵکـی گوندەکـە لەیـەك هەفتـەدا چـوار جـار پـارەو سـەرانەیان دەدایـە حزبـەکان، ئەمـەش بارگرانیەکـی تـر بـوو کـە حزبـەکان بـێ ئـاگادار بـوون لەیەکـتر پارەیـان لـە خەڵـك دەسـەند .

حکومەتـی عێـراق لـە چوارچێـوەی داڕشـتنی پلانـی (پشـتێنەی ئەمنـی دەوڵـەت) [1] لـەدوای سـاڵی ١٩٧٧ دانیشـتوانی هەمـوو ئـەو گوندانـەی ڕاگواسـت کـە بـە قوڵایـی بیسـت کیلۆمەتـر کەوتبوونـە سـەر سـنورەکان، لـە بەرانبـەردا بـۆ هـەر خێزانێـك بڕێـك پـارەی تەرخـان کـرد وەك قەرەبـوو تـا بتوانـن لـە ئـۆردوگا زۆرەملێـکان بـۆ ژیانـی خۆیـان بـەکاری بهێنـن لەبـری ئـەو زەرەرو زیانـەی بەریـان کەوتبـوو لـە جێهێشـتنی خانـوو و زەوی کشـتووکاڵی و ڕەزو بـاخ و بیـرو کانـی و کارێزەکانیـان، سـەرکردایەتی شـۆڕش بـڕی ٥٪ ی ئـەو پارەیەیـان لـە خەڵـك سـەند کـە لـە ئەنجامـی چۆڵکردنـی گوندەکانیـان لـە حکومەتـی عێـراق وەرگرتبـوو[1] هەروەها شـاخەوان

---

١- پشکۆ نەجمەدین، ئەزموون و یاد، ل٥٦

عباس لە گێڕانەوەی یادەوەریەکانی خۆیدا دەڵێت: پیاوێکی ڕژێمیمان دەستگیر کرد بەڵام دواتر ڕایکرد لە بری ئەوە (٥٠٠) دینارمان لە ئامۆزایەکی سەند وەك سزادان، لەو بڕە پارەیە هەر پێشمەرگەیەك بڕی ١٠ دیناری پێ درا[1] .

پێشمەرگەی دێرین مستەفا کەریم عومەر لە گێڕانەوەیەکی زارەکیدا گوتی : زۆر جار جاشمان بە مەبلەغێك پارە ئازاد دەکرد کە لە ٢٠٠٠ دینار کەمتر نەبێت و لە ٥٠٠٠ هەزار دینار زیاتر نەبێت، بۆ ڕەفیق حزبی و ئەفسەرانی ڕژێم کە بەڕەگەز عەرەب بوون سزاکە زیاتر بوو و دەگەیشتە ١٥ تا ٢٠ هەزار دینار، هەروەها بۆ ئەفسەرو ڕەفیق حزبیە کوردەکان بڕی سزاکە کەمتر بوو دەگەیشتە ١٠ هەزار دینار ' بەشێك لەو پارەیەش بەسەر پێشمەرگەکاندا دابەش دەکرا[2].

زۆر جار بۆ جەولەی پێشمەرگانەو چوونیان بۆ ئەنجامدانی چالاکیەك بەتایبەتی دوای ساڵی ١٩٨٥ تراکتۆرو سەیارەی هاوڵاتیانیان دەبرد، گەر خاوەنەکەی لە ترسی گیران و گیانی خۆی ئامادە نەبوایە ئەوا بە زەبری لێدان دەیانبرد یاخود سەیارەو تراکتۆرەکەیان لێ دەسەندو کارەکەی خۆیان

---

١- شاخەوان عەباس، سەفەری کوردایەتی بیرەوەریەکانی شارو شاخ ١٩٧٤-١٩٨٠ ، ل١٣

٢- گفتوگۆ لەگەڵ پێشمەرگەی دێرین مستەفا کەریم عومەر (هیوا) لە ڕێککەوتی ٢٠١٩-٧-٢٢

پـێ ڕاهــی دەکـرد، هەنـدێ جـار تراکتۆرەکـە یاخـود سـەیارەکە لــەو کردەیــەدا لەلایــەن حکومەتــی عێراقــەوە دەســتی بەســەرا دەگیـراو دواتـر خاوەنەکەشـی دەسـتگیر دەکـرا، هەندێـك جاریـش تراکتــۆرو ســەیارەکە دەکەوتــە بــەر هێرشــی هەوایــی کۆپتــەرو فڕۆکـەو دەسـوتێنرا. هەروەهـا بـە زۆرداری سـوتەمەنی بەنزینیـان لـە هاوڵاتیانــی خـاوەن ئۆتۆمبیـل دەسـەند بـۆ کارپێکردنــی ئـەو ئۆتۆمبیلانــەی لــە حکومــەت گرتبوویــان .

لـە ناوەڕاسـتی هەشـتاکان بـەدواوە هێـزی پێشـمەرگە دەسـتی نەدەپاراسـت لـە لێـدان و وێـران کردنـی دامـودەزگا دەوڵەتیـەکان ، هەندێـك جـار دەسـتی ئـەم هێرشـانە دەگەیشـتە دەزگا خزمەتگوزاریەکانـی میریـش ، هەندێـك جاریـش تـاڵان کـردن ، وەك ئـەوەی لەگرتنـی بێتواتـە ڕوویـدا, لـەم بارەیـەوە شـەهید ڕێبـاز دەڵـێ: لـە شـەڕی بێتواتـە گەلـێ کـردەوەی ناشۆڕشـگێڕانە کـرا کـە هەرگیـز نەدەبوایـە هێـزی پێشـمەرگە بیـکات. هەندێـك لـە پێشـمەرگەکان هەڵسـووکەوتی جاشـانەیان دەکـرد زۆر بـێ ئابڕوانە چاویـان لـە مافـوور، مـەڕو بـزن، مریشـك و هێلکـەی ئـەو جوتیارانـە بــوو. بــە بــڕوای مــن ڕاوەڕووت و بێگوێــدان لــە نــاو هێــزی پێشـمەرگەی کوردسـتان دەسـتی پـێ کـرد، هەندێـك پێشـمەرگەو مەسـئولەکان ئـەو چـەك و تەقەمەنیەیـان شـاردەوە کـە بەخوێنـی چەندیــن پێشــمەرگە دەسـتکەوتبوو.

هەرچەنــدە ســەرکردایەتی شــۆڕش ماوەیــەك خــۆی تــوڕەو تونــد کـرد و پەیمانـی دا ئـەو پاتەخـۆرو بـێ ئابڕوانـە سـزا بـدات کەچـی پـاش ماوەیـەك وەکـو هەمیشـە دیـزە بەدەرخونـە کـرا. ئـەو کارە ناشـۆڕگێڕانەیە ئەوەنـدە کاری لەمێشـك و هەسـتم کـرد وەخـت بـوو یەکجـاری واز لەپێشـمەرگایەتی بهێنـم چونکـە بەچـاوی خـۆم دەمبینـی هەندێـك لـە لێپـرسراوان تەلەفزیـۆن، سـەماوەر، مافـوورو شـتی ناومالْیـان پەنـا دەدا[1].

لەکاتێکـدا دەزگا خزمەتگوزراریــەکان کاریــان ئــەوە بــوو خزمــەت بگەیەنـن بـە هاولاتیـان و دوور بـوون لـە کاری چـەك و چەکـداری، پاسـاویش بـۆ ئـەو کردەوانـە ئـەوە بـوو دەیانگـوت: دەمانەوێـت وەك چـۆن لـە ڕووی سیاسـی و سـەربازیەوە شکسـت بەدەوڵەتـی عێـراق بهێنیـن ئاوهـاش لـە ڕێگـەی لێـدان لـە ئامانجـە ئابـوری و پـڕۆژە خزمەتگوزاریــەکان ، ژێرخانــی ئابــوری عێــراق هەڵتەکێنیــن بـۆ ئـەوەی دەوڵـەت ناچـار بکەیـن مافەکانـی کـورد بسـەلمێنێت، ئەمـەش سیاسـەت و ڕێگایەکـی هەڵـە بوو بـۆ ناچارکردنی دەوڵەت تـا دان بنێـت بـە مافەکانـی کـورد دا، هەروەهـا نـاو و ناوبانگـی بزووتنــەوەی ڕزگاری خــوازی کوردســتانیش لــە ناوخــۆو دەرەوە ناشــیرین کردبــوو، بــۆ نموونــە ئۆتۆمبیلــی فەرمانگەکانــی ئــاو و کارەبــاو دەزگا تەندروســتیەکانیان دەڕفانــدو بــۆڕی ئــاوی نێــوان

---

١- ڕێباز، قەندیل بەغدای هەژاند، ل٢٤٨

شارەکانیان دەتەقاندەوەو هێڵی کارەبایان دەبڕی و محاویلەی کارەبایان دەدایە بەر ڕێژنەی گوللە. جارێکیان مەفرەزەیەکی پێشمەرگە کەرەستەو داو و دەرمانی مستەوسەفی گوندێکی نزیك هەولێریان تالان کردو هێنایانە گوندی قەمبەر، حکومەت لەو کردەوەیە خۆش نەبوو، بۆ ڕۆژی دواتر دوو کۆپتەری بەڕێ کرد بۆ دۆزینەوەی، دواجار کۆپتەرەکان لە گوندی قەمبەر نیشتنەوەو هەموو کەلوپەل و داو و دەرمانەکانیان بردەوە .

زۆرجار هەندێك لە فەرماندەو پێشمەرگەی لاسار دوور لە ڕەوشتی مرۆڤایەتی و بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە بەو ئاکارەیان ناوبانگی شۆڕش و کەسێتی خێزانەکان ( ئەو خێزانانەی شەو و ڕۆژ خزمەتی هێزی پێشمەرگەیان دەکرد ) لەکەدار دەکەن ، چاوی تەماعیان دەبڕیە جوت بوونی ناشەرعی و ژنانیان ناچار دەکرد بکەونە ژێر ویست و ئارەزوویانەوە، زۆربەی جارەکانیش بەبێ سزادان و دەرکردن تێدەپەڕی، دەیان نموونەی لەم جۆرە هەن تەنها یەکیان باس دەکەین : ساڵی ١٩٨٦ یەك لە فەرماندەی هێزەکانی پێشمەرگە لە یەکێك لە گوندەکانی کوردستان زۆر هاموشۆی ماڵێك دەکات بۆ نان خواردن و پشوودان، لە ئەنجامی ئەو زۆر هامووشۆکردنە ، فەرماندەکە تەماع لە ژنی ماڵەکە دەکات و داوای لێ دەکات ڕێکبکەوێت لەگەڵیدا بەڵام ژنەکە ڕەتی دەکاتەوە، فەرماندەکە زۆر هەوڵی

پێوه دەدات و سۆزو خۆشەویستی بۆ دەردەبڕێت تا قەناعەتی پێ بهێنێت بەڵام ژنەکە هەر ڕازی نابێت ' دواجار بۆ ئەوەی ژنەکە ڕازی بێت هەڕەشەی کوشتنی پیاوەکەی لێ دەکات ' هەمدیسان ژنەکە ڕازی نابێت ' بۆیە ژنەکە بەناچاری ئەم چیرۆکەی بۆ پیاوەکەی گێڕایەوە بۆ ئەوەی ئاگاداری گیانی خۆی بێت، ئیتر ئەو خێزانە بۆ پاراستنی ژیان و کەرامەتی خۆیان موڵك وماڵیان بەجێهێشت و سەڵتەخێزان هەڵاتن بۆ شار، تەنانەت لەوێش فەرماندەکە یەخەی بەرنەدان و نامەی هەڕەشەی بۆ دەناردن، ئیتر پیاوەکە هیچ چارەی نەماو بوە جاش ' یەك ساڵ دوای ئەوە پیاوەکە ( ئەو پیاوەی بەدڵ و بەگیان خزمەتی هێزی پێشمەرگەی دەکرد ) لەکاتی گەڕانەوەی لە ڕەبیە کەوتە ناو بۆسەی هێزی پێشمەرگەو بە جاشی کوژرا، ناوبراو شەش منداڵی بە هەتیوی بەجێهێشت. کوڕێکی ئەو پیاوە کە ئێستا مامۆستایەو گەنجێکی ڕۆشنبیرە ئەم چیرۆکەی لەزاری دایکیەوە بیست، ئێستا ئەو گەنجە چیرۆکەکەی کردۆتە کتێبێك بەناونیشانی ( شۆڕش و جەستەی دایکم ) . تەنانەت یەکێك لە کادرەکانی ئەو سەردەمە بەناوی پشکۆ نەجمەدین لە یادەوەریەکانی خۆیدا دەڵێت : فەرماندە هەبوو خۆی گوتویەتی لەهەر ناوچەیەك ژنێکم هەیە.

زۆر جــار هەندێــك لــە فەرمانــدەو پێشــمەرگەكان هاوســەرگیری زۆرداره‌كیـان ئەنجـام دەدا، لـە یەكێـك لـە گوندەكانـی كوردسـتان چونــە خوازبێنــی كچێكــی پانــزە ســاڵە بــۆ پێشــمەرگەیەك كــە تەمەنـی سـی و دوو سـاڵ بـوو ، كچەكـەو بـاوك و دایكـی كچەكـە ڕازی نەبــوون ، جیـاوازی تەمەنیـان تاكـە هـۆكار بـوو بـۆ ئـەم نـاڕازی بوونەیـان ، بـەڵام هەڕەشـەو چاوسـوور كردنـەوە هەموویانـی ناچـار كـرد ئـەم هاوسـەرگیریە ئەنجـام بدرێـت.

لەگــەڵ ئەوەشــدا ســەدان فەرمانــدەو پێشــمەرگەو ســەركردەش هەبـوون لـە ژیانـی پێشـمەرگایەتیاندا كەمتریـن لادانیـان نەبـوەو بگـرە بەگـژ حاڵەتـی وا دا چوونەتـەوەو خاوەنـی پەروەردەیەكـی دروســت بــوون، بــۆ ئەمــەش چەنــد نموونەیــەك بەســە، دلاوەر كویخـا شـەریف یەكێـك بوە لەپێشـمەرگەكانی سـنووری كەركووك، لەڕوخسـاردا گەنجێكـی قـۆزو باڵابـەرز بـوەو چەندیـن جـار بەهـۆی جوانـی و شـان و شـەوكەتیەوە گێچەڵـی پـێ كـراوە بـەڵام چونكـە خاوەنــی ڕەوشــتێكی بــەرزو دســپلینی پێشــمەرگانە بــوو خــۆی تەسـلیمی حـەزو ئارەزووەكانـی نەكـرد بەڵكـو تـا شـەهیدیش بـوو بـە بێگـەردی مایـەوە[1].

---

١- گفتوگـۆ لەگـەڵ پێشـمەرگەی دێریـن عاسـی كەركووكـی، لـە ڕێككەوتـی ٢٥-٩-٢٠٢٠، نـاوی تـەواوی عاسـی حوسـێن مەحمـوودە، لەسـاڵی ١٩٦٨ لەشـاری كەركـووك لەدایـك بـوە، لـە سـاڵی ١٩٨٢ بـوە بـە پێشـمەرگە لـە ڕیزەكانـی یەكێتیـی نیشـتیمانیی كوردسـتان، ئێسـتا خانەنشـینی دێرینـەو لەشـاری كەركـووك نیشـتەجێیە.

شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری یەكێكـە لـەو فەرماندانـەی لـەو ڕووەوە زۆرتریـن قسـەو بـاس هەڵدەگرێـت، ئەحمـەد قەمبـەری فەرمانـدەی پڕ چالاكـی تریـن كەرتـی پێشـمەرگە بـوە لەسـەرەتای هەشـتاكانی سـەدەی ڕابـردوو، سـنورێكی پـان و ناوچەیەكـی فراوانی لەبەردەسـتدا بـوە، ئـەو لـە ژیانـی فەرماندێتـی خۆیـدا دەیتوانـی دەسـەڵات و پلەكـەی بـۆ ئامانجـە شەخسـی و تایبەتیەكانـی خـۆی و بەهێـز كردنـی پێگـەی بنەماڵـەو كەسـوكارەكەی بـەكار بهێنێـت بـەڵام چونكـە خاوەنـی باشـترین پـەروەردەی خێزانـی و سیاسـی و پێشـمەرگەیی بـوو تـا شـەهیدیش بـوو بـە پاكـی و بێگـەردی مایـەوە. جارێكیـان لـە سـاڵی ١٩٨٢ شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری پێشـمەرگەیەكی كەرتـی دووی چـەك دەكات لەسـەر ئـەوەی توشـی لادان بـوو بـوو، دوای چەنـد مانـگ لـە سـزادانی ' پێشـمەرگەكە نامەیـەك لەسـەركردایەتیەوە بـۆ ئەحمـەد قەمبـەری دەهێنێـت و داوای لێبـوردن دەكات و بەڵێـن دەدات كـە كاری وا دووبـارە نەكاتـەوە ئنجـا چەكەكـەی پـێ دەداتـەوە، بـە شـاهێدی هاوڕێكانـی زۆربـەی كات گیرفانـی بەتـاڵ بـوە. دەیـان و سـەدان نموونـەی وەك شـەهیدان دلاوەر كوێخـا شـەریف و ئەحمـەد قەمبـەری لەنـاو شۆڕشـدا هەبـوون تەنانـەت هەندێـك سـەركردەی ئـەو سـەردەمەش نـە لە شـاخ و نە لـەدوای ڕاپەڕیـن و دامەزراندنی حكومەتـی هەرێـم و ئـەو هەمـوو تەخشـان و پەخشـانە چاویـان

نەبڕیـە بەجێهێنانـی ئـارەزوە جنسـی و ماددیەکانیـان و بەپاکـی و دڵسـۆزی و بەهەمـان تیـن و تـاوی سـەرەتای شـۆڕش مانـەوە.

هەندێـك لـە فەرمانـدەو بەرپرسـانی شـۆڕش کەسـایەتی و ناوبانـگ و شـکۆی دەیـان خێـزان و هاوڵاتـی گوندنشـینیان شـکاند بـە جوێنـدان و تێهەڵدانیـان تەنهـا لەبـەر ئـەوەی داواکاریەکـی ئەوانیـان جێبەجـێ نەکردبـوو یـان ئامـادەی هـاوکاری کردنیـان نەبـوون، جارێکیـان لـە گوندێـك خـاوەن تراکتۆرێـك ئامـادە نابێـت لەگـەڵ مەفرەزەیەکـی پێشـمەرگەدا بـڕوات، مەفرەزەکـەش تـەواوی پیاوانـی گوندەکەیـان لای مزگەوتـی ئاوایـی کۆکـردەوەو بـەدارو قۆناغـە تفەنـگ کەوتنـە وێزەیـان و دەسـت و سـەرو دەمووچـاوی هەموویـان خلتانـی خوێـن کـرد و ژن و منداڵـی گوندەکەیـان کـردە گریـان، دواتـر زۆرینـەی خەڵکـی ئـەو گونـدە لای سـەرۆك جاشـێك بـوون بـە جـاش، لـە فەرمانـدەکەیـان پرسـی : تەنهـا یـەك کـەس ئامـادە نەبـوو بـە تراکتۆرەکـەی بمانگوازێتـەوە بۆچـی بڕیـارت دا لـە تێکـڕای خەڵکەکـە بدرێـت ؟ لـە وەڵام دا گوتـی بـۆ ئـەوەی چـاوی خەڵـك بشـکێنین و نەوێـرن لـە ئاسـت داواکاری و فەرمانەکانمـان سـەرپێچی بکـەن. جارێکـی تـر پیاوێـك ئامـادە نابێـت بـە ئۆتۆمبیلەکـەی خـۆی ، مەفرەزەیـەك بباتـە نـاو شـار کـە بـۆ کارێکـی پێشـمەرگانە دەچـوون بـەڵام بـە زەبـری لێـدان بردیان، لـە نزیـك شـار کەوتنـە نـاو بۆسـەی پیاوانـی ئەمـن و ئیسـتخبارات

و بوه شەڕ، لە ئەنجامی شەڕەکە خاوەن ئۆتۆمبیلەکە کوژراو پێشمەرگەکانیش خۆیان دەرباز کرد، جارێکی تر مەفرەزەیەکی پێشمەرگە دەچنە ناو شارەوەو لە دەرگای ماڵێك دەدەن و گەنجێکی ئەو خێزانە بانگ دەکەن و دەڵێن ماڵی فلانە ڕەفیق حزبیمان پێ نیشان بدە، گەنجەکەش لەترسی گیران و گیانی خۆی ئامادە نابێت ماڵی ڕەفیق حزبیەکەیان بۆ دەستنیشان بکات، ئیتر مەفرەزەکە تێرو پڕ لە گەنجەکە دەدەن کە بەهۆیەوە دەستی شکا .

بە درێژایی سالآنی هەردوو شۆڕش چەندین جار شەڕی براکوژی ڕوویداوە، لێرە جێگەی نیە باس لە خەتابارو هۆکارەکان و دەرەنجامە سیاسی و کۆمەڵایەتیە خراپەکانی بکەین تەنها ئەوە نەبێت کە تواناو ووزەو ئیمکانیات و خوێنێکی زۆریان لە بردنەوەی شەڕو سەرکەوتنیان بەسەر یەکتردا خەرج کرد، شەڕی ناوخۆ و براکوژی تین و تاوی شۆڕشەکانی کەم کردەوە تا ئەو ئاستەی ناچار بن بۆ زاڵبوون بەسەر یەکتردا پەنا بۆ دووژمنەکانی کورد ببەن و داوای چەك و فیشەك و پارەو خواردنیان لێ بکەن و بانگهێشتی دووژمن بکەن بۆ یارمەتیدانیان، یەك لە دەرەنجامە هەرە خراپەکانی شەڕی ناوخۆ ' کوشتنی دیل بوە، زۆر جار تۆڵە کردنەوەو ڕق و توڕەیی هێزەکان گەیشتۆتە ئاستێك دیلەکانی بەر دەستیان بکوژن،

کوشتنی دیل و ژێر خاك خستنی تەرمەكانیان و سوكایەتی پێكردن و شێواندنی جەستەی هەندێك لە كوژراوەكان و هەتیو خستنی سەدان منداڵی بێخەتا و بێبەش كردنی سەدان ژن لە بوون و خۆشەویستی پیاوەكانیان لەكەو خاڵێكی ڕەشە لە مێژووی شۆڕشەكانی كورد دا، بەهۆی شەڕەكانی ناوخۆوە سەدان خێزان لە بەریەك هەڵوەشانەوەو سەدان پێشمەرگەی ئازاو دڵسۆز چەكیان داناو ئامادە نەبوون شەڕی یەكتر كوشتن بكەن. لە شەڕێكی ناوخۆدا لەیەك هەفتە دوو برا كوژران كە هەریەكەو لە حزبێكدا پێشمەرگە بوون. لەگوندی سماقەی سەر بەقەزای كۆیە بوە شەڕ لەنێوان حزبی سۆسیالست و یەكێتیی نیشتیمانیی كوردستان، پێشمەرگەیەكی یەكێتی چوە سەر تەرمی پێشمەرگەیەكی حزبی سۆسیالست كە لەو شەڕەدا كوژرابوو' كە بینی برایەكی خۆی بوو، لە بارەی ئەو ڕووداوەوە مەلا خدر جێگری فەرماندەی كەرتی دووی تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر كە خۆی یەكێك بوە لەبەشداربوانی ئەو شەڕە گوتی : نێوان ئێمەو حزبی سۆسیالست بەجۆرێك تێكچووبوو كە كەس نەتوانێت بەرانبەر بەیەكتر نەرمی بنوێنێت، ڕۆژێكیان بەشێك لە پێشمەرگەكانی كەرتەكەی ئێمە كە شەهید ئەحمەد قەمبەری فەرمانەدەی (كەرت) مان لەگەڵ بوو بۆ كارێكی پێشمەرگانە بەڕێكەوتین بۆ ناوچەی خۆشناوەتی و بەگوندی

سماقەدا ڕۆیشتین، لەپشتی گوندەکەوە مەفرەزەیەکی حزبی سۆسیالستمان بەدی کرد کە بەکر حەمە بەرپرسیان بوو، شوێنەکەی ئێمە بەرز بوو دەمانتوانی لەماوەیەکی کەم دا زیانێکی زۆریان پێ بگەیەنین بەڵام چونکە باوەڕمان بەشەڕی یەکتر کوشتن نەبوو شەهید ئەحمەد قەمبەری گوتی کەس تەقە نەکات تەنها خۆم نەبێت، شەهید ئەحمەد چەند فیشەکێکی ئاسمانی تەقاند بۆ ئەوەی برادەرانی سۆسیالست ئاگادار ببنەوە کە هێزی یەکێتی لەوێیەو دوور بکەونەوە تا شەڕ ڕوو نەدات، ئێمە بەرەو ناو گوند ڕۆیشتین، باوەڕمان وا بوو کە برادەرانی سۆسیالست لێمان تێگەیشتوون و پەنا بۆ شەڕ نابەن بەڵام کاتێك لەهەموو لایەکەوە تەقەمان لێ کرا، ئێمە پاشەکشەمان کرد تا شەڕ لە نێوانمان ڕوو نەدات بەڵام برادەرانی سۆسیالست بە تەقە کردنەوە کەوتنە دوامان بۆ هەڵەت و پەڵەتی سماقەو شەڕ دامەزرا، لەو شەڕەدا ئێمە شەهیدێکمان دا بەناوی شەهید حەمەزیاد تاڵەبانی، دوای نیو کاتژمێر ئیدی هێواش هێواش تەقە کز بوو و ویستمان شەهیدەکەمان ببەینە شوێنێك و بینێژین و دواتر بەرەو خۆشناوەتی بەڕێبکەوین بەڵام کاتێك فەرماندەی مەفرەزەیەکمان بەناوی عەلی پونگینەیی چوە سەر تەرمی شەهیدێکی سۆسیالست، لەناکاو دەستی کرد بەگریان، گوتمان چی بوە ؟ گوتی ئەم پێشمەرگەیەی

سۆسیالست کە شەهید بوە برای منە، هەموومان زۆر دڵگران و غەمبار بووین، ئا لەوێدا بە کردەوە سەلمێنرا شەڕی ناوخۆ شەڕی براکانە لەگەڵ یەکتر[1].

بە هۆی شەڕی ناوخۆوە چەندین ڕۆڵەی ئەم وڵاتە لە بەین چوون و بەهۆیەوە پرسەو شینیان خستە ناو هەزاران خێزانەوەو بۆ هەتا هەتایە نائومێدیان کردن لە ژیان.

شەڕی ناوخۆ و هەوڵدان بۆ یەکتر شکاندن و سڕینەوەو قبووڵ نەکردنی یەکتر هۆکارێك بوو تا هاوڵاتیان خۆشەویستیان بۆ شۆڕش و سەرکردەکانی شۆڕش کەم ببێتەوەو دڵسۆزیان نەمینێت بۆ نیشتیمان و هەستی نیشتیمان پەروەریان لاواز بێت و هەستی نەتەوەیی زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردستان کاڵ بێتەوەو نرخی نیشتیمان و نەتەوەیان لا کەم بێتەوە.

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەل مەلا خدر لەڕێککەوتی ٦-٢-٢٠٢١

ناوی تەواوی عەبدولکەریم مامەند ئیسماعیلە ' بە مەلا خدر ناسراوە ، لەساڵی ١٩٥٨

لە گوندی قەرەبەگی سەر بەپارێزگای کەرکووك لە دایك بوە، لەساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی کردوە بە ئەڵقە ڕۆشنبیریەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان - یەکێتی ، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٠ بوە بە پێشمەرگە، لەسەردەمی شەهید ئەحمەد دا بوە بە جێگری کەرتی دوو ' دواتر کراوە بە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی دەشتی هەولێر، خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایەو ئێستا لە لەندەن دەژی.

# شۆڕش لەدوای پرۆسەی ئەنفال

سەددام حوسێن دوای هەشت ساڵ جەنگ لەو ڕاستیە تێگەیشتبوو کە هێزی مرۆیی و ئابووری و تەکنەلۆجی سەربازی دەوڵەتەکەی لەئاست بەزاندنی دەوڵەتی ئێراندا نیە، لە لایەکی تر شۆڕش و جوڵانەوەی چەکداری کورد تەنگی بە حکومەت هەڵچنیبوو و شۆڕش دەستی دەگەیشتە ناوەندی پارێزگاو شارە گەورەکان و چەندین ناحیەو قەزایان ئازاد کردبوو بۆیە بەلای سەرانی بەعس و خودی سەددام حوسێنیشەوە باشترین هەنگاو بۆ کەم کردنەوەی فشار لەسەر دەوڵەت و داخستنی بەرەیەکی جەنگ ' سازش کردن بوو بۆ ئێران تا دەستی بەتاڵ بێت و شۆڕش و دەنگی شۆڕش کپ بکاتەوە ، بۆیە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٧ بە نهێنی تارق عەزیزیان نارده تاران بۆ گفتوگۆ کردن، دەوڵەتی عێراق بڕیاری دابوو بە هەر نرخێك بێت جەنگی ئێران لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، لە مانگەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٨٧ و سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ بەرەکانی جەنگ تا ڕادەیەکی باش ئارامی بەخۆوە بینی و هیچ لایەك لەم دوو دەوڵەتە هێرشیان نەدەکردە سەر یەکتر کە جۆرێك

بـوو لـه نیشـاندانی نیازپاکـی خۆیـان بەرانبـەر یەکـتر، بەمـەش دوای چەندیـن جەولـەی نهێنـی و ژێـر بەژێـری گفتوگـۆ لـه تـاران و بەغـدا گەیشـتن بـه ڕێککەوتـن و لـه ٨ ی ئابـی سـاڵی ١٩٨٨ جەنگـی نێوانیـان کۆتایـی هـات .

وەسـتاندنی جەنگـی هەشـت سـاڵە' دەسـتی بەغـدای واڵا کـرد تـا هەڵکوتێتـه سـەر کوردسـتان و پرۆسـەی ئەنفـال کردنـی تـەواوی کوردسـتان جگـه لەشـاره گـەورەکان بـه ئەنجـام بگەیەنێـت و ٩٠٪ی لادێـکان بکاتـه ناوچـەی قەدەغەکـراو. جگـه لەوانـەی بـەر شـاڵاوی ئەنفـال و ڕەشـبگیری کەوتـن کـه ژمارەیـان لـه سـەد هـەزار کـەس زیاتـر بـوو ئەوانـەی تـری ڕاگواسـت بـۆ کۆمەڵگـه زۆرەملێـکان و خسـتیه ژێـر چاودێـری تونـدی دامـودەزگا ئیسـتخباراتی و ئەمنیەکانـەوه بەمـەش خەڵـك و شۆڕشـیان لـه یەکـتر دابـڕی و هێزی پێشـمەرگه هیـچ شـوێن و دەرەتـان و جێگەیەکـی حەوانـەوەو نـان خـواردن و درێـژەدان بەشۆڕشـیان بـۆ نەمایـەوه، ئنجا سـەرکردایەتی و بەرپرسـانی شـۆڕش بۆیـان دەرکـەوت گـەر خەڵکـی کوردسـتان نەبوایـه ئـەوان بەتەنهـا شۆڕشـیان پێ نەدەکرا، بۆیه سـەرکردایەتی شـۆڕش و تـەواوی هێـزی پێشـمەرگه پـاش چەنـد شـەڕێکی قـورس بـەرەو سـەر سـنوورو نـاو خاکـی ئێـران ئاودیـو بـوون.

سـەرکردەو بەرپرسـه باڵاکانـی شـۆڕش و ئـەو ژمـارە پێشـمەرگەیەی چوونـه ئێـران لـه دێهـات و شـاره سـنووریەکان نیشـتەجێ بـوون،

شـەش مانگـی یەکـەم چاوەڕوانـی هەلومەرجـی ناوچەیـی و جیهانیـان کـرد تـا ئەگـەر بارودۆخەکـە بگەڕێتـەوە دۆخـی پێشـتر ئـەوا بتوانـن بگەڕێنـەوە کوردسـتان ، بـەڵام هەلومەرجـی سیاسـی ناوچەکـە بـە پێچەوانـەی ئـەم خواسـتەوە بـوو، بۆیـە ناچـار بـوون بـۆ پەیداکردنـی نـان و بژێـوی ، لـە شـارەکان کرێـکاری بکـەن و لەلادێـکان بـبن بـە شـوان و گاوان، هەندێـك لەسـەرکردەکان نەبیـت کـە لەسـەر سـنوور بارەگایـان دانـا، بەشێکیشـیان دەرفەتیـان بـۆ ڕەخسـاو کەیشـتنە ئەوروپـاو نیـتر نەهاتنـەوە بـەلای شـۆڕش و پێشـمەرگایەتیدا.

جگە لە ژمارەیەکی کەمی هێزی پێشمەرگە نەبێت کە سەرکردایەتی شۆڕش بەشێوەی پارتیزانی ناردیەوە ناوچەکانی کوردستان بەشی هەرە زۆری ئەوەی تر کەوتنە دوای ژیانی خۆیان و بەکراس و پانتۆڵێکی ئێرانی و بە مۆڵەتدانێکی نارەسمی و جۆرێك لە ژێردەستەیی و لەژێر چاودێری ووردی ئیتلاعات لە ناوچە جیاجیاکانی ئێران بڵاوبوونەوەو خەریکی ژیانی خۆیان بوون. ژیان بۆ سەرکردەکان و هێزی پێشمەرگەو ماڵ و منداڵەکانیان لە ئاوارەییدا کارێکی سەخت بوو چونکە پێشتر کاروکاسبیان نەکردبوو و شارەزای پەیدا کردنی نان و خەرجی ڕۆژانە نەبوون و هەمیشە لەسەر حیسابی خەڵك و لەناو ماڵی خەڵك ژیابوون، دەتوانم بڵێم لەکارو پەیدا کردنی بژێویدا دەست سپی و ناکاراو ناکارامە بوون، بەکورتی ژیانیان دژوار بوو.

# له شۆڕشەوه بەرەو حکومڕانی

پاش سێ ساڵ لە نیشتەجێ بوونی سەرکردەکانی شۆرش و هێزی پێشمەرگە لە ئێران و خۆ خەریك کردنیان بەکارو کاسبی و پەیدا کردنی بژێوی ژیانیان ' جیهان خۆی لەبەردەم گەورەترین وەرچەرخان و گۆڕانکاری بینیەوە کە هەڵوەشانەوەی یەکێتی شوورەوی و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بەشێك لە کۆمارەکانی ناو ڕووسیاو ڕووخاندنی دیواری بەرلین و وتارە بەناوبانگەکەی گۆرباشۆف و کۆتایی هاتنی جەنگی ساردی لێ کەوتەوە، وێڕای ئەم گۆڕانکاریانەش سەددام حوسێن بۆ دەرباز بوون لەو قەیرانە قووڵە ئابووری و سیاسیەی تێی کەوتبوو پەلاماری کوەیتی داو بە چاو نوقانێك داگیری کرد، گەرچی سەددام ڕەزامەندی سەر ( بەڕە )ی لە ئەمریکا وەرگرتبوو بۆ داگیرکردنی کوەیت بەڵام بێئاگا بوو لەوەی سیاسەتی ژێر ( بەڕە )ی ئەمریکا بریتی بوو لەدانانی تەڵەی سیاسی تا گرتنی کوەیت بکات بە باشترین هەل بۆ ئەوەی سیستەمی

حکومرانــی عێــراق بگۆڕێــت یــان بەلایەنــی کــەم دەســەڵاتی هێنـدە کـز بـکات کـە توانـای پەلاماردانـی هاوسـێکانی نەمینێـت، دوای وەردەرنانــی ســوپای عێــراق لــە کوەیــت و ئابلووقەدانــی ئابـوری و سـەربازیانەی عێـراق و سـەپاندنی چەندیـن بڕیارنامـەی ئەنجومەنـی ئاسـایش و نەتـەوە یەکگرتـوەکان بەسـەریدا ، دەوڵەتی عێـراق توانـای بەرگـری لەخۆکـردن و پاراسـتنی سـنوورەکانی کـەم بـوەوە، سـەرکردەکانی شـۆڕش هەڵسـەنگاندنی ووردیـان بـۆ بـاری سیاسـی عێـراق و تـەرازووی هێـزی ناوچەکـەو لاوازبوونـی دەوڵـەت کـرد لـە ڕووی سیاسـی و سـەربازیەوە، لاوازی عێراقیـان قۆزتـەوەو توانیـان بـە هـاوکاری هاونیشـتیمانیانی کوردسـتان و بەشـێك لـە هێـزە چەکـدارە کوردەکانـی سـەر بـە دەوڵـەت ( جـاش ) ، ڕاپەڕینـی سەرتاسـەری ئەنجـام بـدەن و سـەرکەوتووش بـن، لاواز بوونـی زیاتـری عێـراق و هەلومەرجـی سیاسـی ناوچەکـە دەرفەتـی دایـە کـورد تاکـو حکومەتێکـی دیفاکتـۆ لـە هەولێـر دابمەزرێنـن و حوکمـی بەشـێکی کوردسـتان بکەوێتـە ژێـر دەسـەڵاتیانەوە.

ئەوکاتـەی سـەرکردەکان و هێـزی پێشـمەرگە گەڕانـەوە کوردسـتان بارودۆخـی خەڵـك لەوپـەڕی خراپـی و شـپرزەییدا بـوو چونکـە حکومەتـی عێـراق مـاوەی کارو کاسـبی کردنـی سـنووردار کردبـوو بەهـۆی قەدەغەکردنـی ژیـان لـە لادێـکان و پرۆسـەی چاودێـری کردنـی تونـدی شـارەکان و جموجۆڵـی خەڵـك، جگـە

لـەوەش شـارەکانی کوردسـتان وەك بەشـێك لـەو سـەردەمەی عێـراق کەوتبـوە ژێـر بـاری ئابلووقەیەکـی ئابـووری تونـدی نێودەوڵەتیـەوە. سـەرکردەکان و هێـزی پێشـمەرگەش وەك خەڵکـی کوردسـتان نەبـوون و ژیانیـان خـراپ بـوو، کەمیـان نەبێـت پـارەی خەرجـی یـەك تاقـە ڕۆژی مـاڵ و منداڵیـان پـێ نەبـوو، پێڵاوەکانـی پێیـان لاستیك و پینەکـراو و دڕاو بـوو، ڕیـش هـات و بێـزەوەرو بـێ توانـاو بـێ هێـز بـوون، جلەکانـی بەریـان کـۆن و پینـە پینـە بـوو، خەڵکـی کوردسـتان وێـڕای هـەژاری و نـەداری خۆیـان ' جێیـان بـۆ دەکردنـەوەو هـاوکاری مـاڵ و منداڵەکانیـان دەکـردو خـواردن و زەخیرەیـان بـۆ دەبـردن، ئـەم بەدەنگـەوە هاتـن و هاوکاریـەش هەڵقـوڵاوی ئـەو سـۆزو خۆشەویسـتیەیان بـوو بـۆ شـۆڕش و پێشـمەرگەو سـەرکردەکان کـە لـە ڕابـردوودا بونیـات نرابـوو.

کـە ڕاپەڕینـی کۆمەڵانـی خەڵـك و پەلامـاری هێـزی پێشـمەرگە سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا شـارەکانی کوردسـتان چەندیـن کارگـەی جیاجیـای تیـا بـوو ' وەك کارگـەی بەرهەمهێنانـی قومـاش لـە هەولێـر، کارگـەی پوختەکردنـی تووتـن لـە سـلێمانی و هەولێـرو کۆیـەو دهـۆك، کارگـەی ئاوتەماتـەو کارگـەی شـەربەت و کارگـەی دروسـت کردنـی جلوبـەرگ و کارگـەی لەقتوونانـی خـۆراك و شـیرەمەنی لـە دهـۆك ، کارگـەی چیمەنتـۆ لـە تاسـلوجەو سـەرچنار، کارگـەی دروسـت کردنـی مافـوور لـە کۆیـەو هەولێـر،

کارگەی دروست کردنی قیر لە تەق تەق و ڕانیەو قەڵادزێ و سلێمانی و کەڵەك، جگە لەم کارگانە کە سەرچاوەیەکی گرنگی بەرهەمهێنان و ژێرخانی ئابووری بوو، لە بێخمەش ژمارەیەکی ئێجگار زۆری کەلووپەل و سەدان ئامێرو شۆفڵ و گەڵابەو گلێدەر مابوونەوە کە بۆ تەواو کردنی بەربەستی بێخمە دانرابوون، هەروەها سەدان بلدۆزەرو گەڵابەو شۆفڵی حکومی کە سەر بە فەرمانگە خزمەتگوزاریەکانی شارەوانی و ڕێگاوبان بوون لە پارێزگاکانی کوردستان، حکومەت دوای ڕاپەڕین بەجێی هێشتبوون، سەرکردەو بەرپرسەکانی شۆڕش لە جیاتی ئەوەی هەوڵی پێشخستن و بەگەڕخستن و زیاد کردنی کارو بەرهەمی کارگەکان بدەن و ئامێرو سەیارەو کەلووپەل و ئامرازەکان بپارێزن و لەبواری جیاجیای خزمەتگوزاری گشتی بەکاری بهێنن کەچی لەماوەی دوو ساڵدا گسکیان لێداو تاڵانیان کرد و لەمەرزەکانەوە بەنوێژی نیوەڕۆ ئاودیوی ئێرانیان کردو فرۆشتیان و پارەکیان خستە باخەڵیان.

لەدوای پێکهێنانی یەکەم کابینەی حکومەتی هەرێم سەرکردەکانی شۆڕش و فەرمانده دەستڕۆیشتوەکان بە شێوەی پەیژەیی و هێواش هێواش جلوبەرگ و شێوازی ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵیان گۆڕا، لە فەرماندەو سەرکردەی شاخەوە بوونە پەرلەمانتارو وەزیرو بەڕێوەبەری گشتی و ئەندامی

مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی حزبەکان و فەرماندەی لیواو فەوج، خواردن و جلوبەرگ و کەرەستەی ناو ماڵ و خانوشیان گۆڕاو خۆیان جیا کردەوە لە زۆرینەی خەڵك، بیروباوەڕو تێگەیشتنیشیان گۆڕا بە جۆرێك کە خەڵك نەیاناسێتەوەو نەزانێت ئەوان بوون لە شاخ موحتاجی جلێکی خاکی و پێڵاوێکی ئەدیداس و نان و بەتانیەکی خەڵك بوون، ئەوان بوون باسی فەلسەفەی مارکسزم و لیبرالیەت و یەکسانی و دادپەروەری و ئازادی و دیموکراسیان دەکرد، ئەوان بوون دەیانگوت بۆ ڕزگارکردنی گەلەکەمان شۆڕشمان هەڵگیرساندوە، بەڵام کردارو ڕفتاریان پێچەوانەی هەموو ئەو دروشم و فەلسەفە سیاسی و فیکریە بوو کە ئیدیعایان بۆ دەکرد. دەرکەوت بەشێکی زۆری سەرکردەو بەرپرسەکان، نەچووبوون بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش بەڵکو بەهۆکاری شەخسی چووبونە ناو شۆڕش و خۆیان تیایدا مەلاس دابوو. هەر بەو دروشمانەش دوای ڕاپەڕین هەزاران کەسیان گۆش کردو گەوجاندو هەڵخەڵەتاندو هەزارانی تریان کردە ناچارکراو و داردەست و کۆیلەو بەردەستی خۆیان، بە جۆرێك هاوڵاتیانیان بە خۆیانەوە وابەستە کرد تا وا تێبگەن سەرکردەو بەرپرسەکانی شۆڕش نەبێت کەس ناتوانێت بە ئاسوودەیی بژیت، گەر ئەوان نەبن سوپای عێراق و تورکیا و ئێران، کوردستان داگیر دەکەنەوەو جارێکی تر خەڵك

ئەنفال دەکەنەوە، لەڕاستیشدا وا نەبوو چونکە تواناو تفاقە سەربازیەکانی شۆڕش و حکومەتی هەرێم سنووردارو لە ئاست بەرپەرچدانەوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکان و شەڕی بەرەیی و بەرگریکردنی دوور مەودا نەبوو بەڵکو هاوکێشە سیاسی و ئابوریەکان و بڕیارە نێودەوڵەتیەکان بارودۆخی هەرێمیان بە ئارامی ڕاگرتبوو نەك ئەوان.

یەك لە ڕێگاو ئامرازەکانی ئەم وابەستە کردن و پاشکۆ و ملکەچ کردنەش دامەزراندن و پێدانی پارەو مووچەیەکی کەم و مەمرەو مەژی بوو، هەموو حزبەکانی ئەو سەردەمە بۆ کێشکردنی خەڵك و کۆکردنەوەی چەکدارو بردنەوەی گرەوی ململانێکانیان لەگەڵ یەکترو زاڵ بوون بەسەر یەکترو سەپاندنی هەژموونی حزبی ' بەسەر یەکتردا هەزاران کەسیان دامەزراند بێ ڕەچاوکردنی باری ئابوری وڵات و هەڵاوسان و بێ مەرجی شیاوی و هەڵسەنگاندنی لێکەوتە خراپەکانی ئەم لێشاوی دامەزراندنە، تا گەیشتە ئەو ئاستەی لە پێنج ملیۆن کەس ' نیو ملیۆن چەکدارو نیو ملیۆنی تر فەرمانبەر دابمەزرێنن، بەمەش زۆرینەی کۆمەڵگەی کوردستانیان دوور خستەوە لە کارو کاسبی و کشتووکاڵ کردن و کۆمەڵگایان لە هێزێکی نیمچە بەرهەمهێنەوە کردە هێزێکی مشەخۆر.

زۆربەی سەرکردەو بەرپرسەکانی شۆڕش لەسەرخۆ و بەشێنەیی دەستیان گرت بەسەر سەرجەم سەرچاوەکانی دەرامەت و داهات و ئابووری وڵاتدا هەر لە گومرگەکانەوە تا دەگاتە بەنزینخانەو کارگە بچووکەکانی بلۆك و خشتی سوورو بەکرێ گرتنی تەرمیناڵ و عەلوەو دووکان و خانوە حکومیەکان، هەر بەرپرس و سەرکردەیەکی دەسترۆیشتووی شاخ پشکی پێ درا لە داهاتی خاڵە گومرگیەکان و ڕێگەدان بە دانانی بازگەو گومرگی نایاسایی کە ڕووتاندنەوەیەکی ئاشکرای خەڵك بوو ' تا ئەم دواییە کە داهاتەکانی ناوخۆی هەرێم ڕێکخران و خرانەوە سەر وەزارەتی دارایی.

لەدوای ساڵی ٢٠٠٣ وە هەرێمی کوردستان پێی نایە قۆناغێکی تازەوەو دەرگای گەورەترین داهاتی لێ کرایەوە، لە لایەك کەوتە دەرهێنان و بەرهەمهێنان و فرۆشتنی بڕێکی زۆری نەوت لە کێڵگەکانی هەرێمی کوردستان، لە لایەکی تر بەپێی دەستووری عێراق و دیاری کردنی پشکی کورد کە لە ١٧٪ بوو بڕێکی زۆر پارە لە بەغداوە بۆ هەرێمی کوردستان ڕەوانە دەکرا کە بەپێی لێکدانەوەو مەزەندەی ئابوریناسان کۆی داهاتی هەرێم بەشی بەخێوکردنی پانزە ملیۆن کەسی دەکرد بەجۆریك داهاتی هەرتاکێك لە ساڵێك دا کەمتر نەبێت لە ٤٠٠٠ دۆلار، هەروەها بەپێی شیکاری و هەڵسەنگاندن و

لێکدانەوەی ئابورییناسان ئاستی داهاتی هەرێم بەشی ئەوەی دەکرد لە ماوەی پێنج ساڵدا ژێرخانی ئابووری هەرێمی پێ ببوژێنرێتەوەو خزمەتگوزاریە گشتیەکان لە وڵاتێکی وەك ئەردەن زیاتر بێت، کەچی سەرکردەو فەرماندە دەستڕۆیشتوەکانی شۆڕش نەك هەر کارگەی جیاجیایان پێ دروست نەکردو خزمەتگوزاری گشتیان پێ دابین نەکردو ژێرخانێکی پتەویان پێ دانەمەزراند بەڵکو بەزەبری یاساو داتاشینی شەرعیەتی یاسایی و دەرچواندنی دەیان ڕێنمایی هەستان بە دروست کردنی سەدان کۆمپانیای زەبەلاح و ڕاکێشانی پارەیەکی ئێجگار زۆر لە بانکە حکومیەکان بۆ بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکانیان، لەو ڕێگەیەوە جارێکی تر کۆی پرۆسەی ئابوری و ئاڵوویرو بازرگانیان زەوت کردو ئاستی ئابووری وڵاتیان بە شێوەیەك دابەزاند کە بە دەیان ساڵی بونیات نانەوە نەچێتەوە دۆخی جاران.

سەرکردەکانی شۆڕش لە دوای پرۆسەی ئازادکردنی عێراق و بەفیدراڵی کردنی هەرێم و فرۆشتنی نەوتی کوردستان و ڕاکێشانی بوودجەیەکی زەبەلاح لە بەغداوە هەم جڵەوی سیاسی و ئیداریان لەدەست بوو هەم کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن کە بەئاسانی و بە ئاشکرا یاریان بە دەنگی دەنگدەر دەکرد لە قازانجی خۆیان ، بەمەش بواریان نەهێشتەوە تا خەڵکی تر جگە لە خۆیان بەشداری کردارەکی بکەن لە حکومڕانیداو

دیموکراسـیەتی ڕاسـتەقینە بچەسـپێت، لەلایەکـی تـر بازرگانـی کـردن و هـاوردەو هەناردەشـیان خسـتە ژێـر دەسـتی خۆیانـەوە ' هاوردەکردنـی هەمـوو جـۆرە ئۆتۆمبیـل و ئامێرێکـی لێخـوڕ، هاوردە کردنـی هەمـوو جـۆرە خۆراکێـك، هـاوردە کردنـی هەمـوو جـۆرە کاڵاو کەلوپەلێکـی نـاو مـاڵ و بیناسـازی و بنیاتنانـەوە، هـاوردە کردنـی هەمـوو جـۆرە ئامێـرو دەرمانێکـی پزیشـکی و کشـتووکاڵی، هـاوردە کردنـی هەمـوو جـۆرە جلوبـەرگ و پێڵاوێـك، هـاوردە کردنی هەمـوو جـۆرە مۆبایـل و کۆمپیوتـەرو تەلەفزیـۆن و کەلوپەلێکـی کارەبایـی، هـاوردە کردنـی هەمـوو پێداویسـتیەکانی ژیانیـان خسـتە ژێـر دەسـتی خۆیانـەوەو هـەر سـەرکردەیەکی شـاخ کۆمپانیایەکـی دروسـت کـرد بـۆ هـاوردەو هەنـاردە کـردن، لـەم کارەشـیاندا بەهیـچ کلۆجێـك ڕەچـاوی ژیـان و سـەلامەتی خەڵکـی کوردسـتانیان نەکـردو خراپتریـن جـۆری دەرمـان و کاڵاو کەلووپەلیـان دەهێنایـە کوردسـتان کـە هۆکارێـك بـوو بـۆ سـەرهەڵدان و زیادبوونـی ڕێـژەی چەندیـن نەخۆشـی جۆراوجـۆر.

سـەرکردەکانی شـاخ بەوەنـدەوە نەوەسـتان بەڵکـو سـەرجەم بوارەکانـی پەیوەنـدی کـردن ( تەلەفۆنـات ) و هێڵەکانـی ئینتەرنێتیـان زەوت کـردو هـەر خۆشـیان نرخیـان بـۆ یەکـەی قسـە پـێ کـردن و کارکـردن بـە ئینتەرنێـت دانـا ' لەگـەڵ ئـەوەی کوالیتـی هێڵەکانیـان هێنـدە نـزم بـوو کـە ڕێکخـراوی ( دانیـڵ )ی فەرەنسـی'

هەرێمی کوردستان بخاتە ڕێزی ١٦٥ هەمین وڵاتی جیهان لە خزمەتگوزاریەکان و ناوی بنێت ڕووتاندنەوەی خەڵك.[١]

بەرپرس و سەرکردەکانی شۆڕش دەستیان بەسەر هەموو ئەو سەرچاوانەدا گرت کە سەرچاوەی کارو کاسبی و پارە پەیدا کردن بوو، بۆ نموونە هەموو بەڵیندەرو کۆمپانیا جێبجێکارەکانی دروست کردنی پردو ڕێگاوبان و قیرتاو کردن، دروست کردنی باڵەخانەو بینا حکومیەکان، پرۆژەکانی کارەبا، ئاو، کۆنکرێت، پاك کردنەوەی ناو شار، پاك کردنەوەی نەخۆشخانەو گرتووخانەکان، دروست کردنی خواردن بۆ نەخۆش و کارمەندانی نەخۆشخانەو گرتووخانەکان، کڕین و هێنانی سەیارەو ئامێرو کەلووپەل بۆ فەرمانگە حکومیەکان لە دەرەوەی وڵات. بە کورتیەکەی خۆیان خاوەنی سەرجەم ئەو بەڵیندەرو کۆمپانیایانە بووون کە کاریان لەحکومەت وەردەگرت و جێبەجێیان دەکرد، بەڵام چۆن جێبەجێ کردنێك ؟ هەرچی پرۆژەیەك کۆمپانیا خۆماڵیەکان کە موڵك وماڵی بەرپرسەکانی شاخ و خزم و دارو دەستەکانیان بوو بە باشی جێبەجێ نەکراوە، هەموو ڕێگاو بان و قیرتاوێکیان لە ماوەی ٣٠٠ ڕۆژدا هەڵوەشاوەتەوەو دەیان چاڵی تێکەوتوەو دوای ئەوە شیاو نەبوە بۆ هاتوچۆ کردن، هەموو باڵەخانەو بینایەکی حکومی کە بەڵێندەرو کۆمپانیاکانی ئەوان دروستیان

---

١- فارووق عەلی : هەرێم لەنێوان خواست و بەرهەم هێناندا، ل١٦

کردبێت تا ٨٥ ڕۆژ ساغ بوە لەوە دواتر بیناکە دەیان درزی تێکەوتوەو دڵۆپەی کردوەو کاشیەکانی هەڵوەشاونەتەوە، هەموو خواردن و خۆراکێکی کۆمپانیاکانی ئەوان لە ڕووی تەندروستی و کوالێتیەوە خراپترین جۆر بوەو شیاو نەبوە بدرێتە نەخۆش و بەندیەکان.

سەرەڕای خراپ جێبەجێ کردنی پرۆژە جیاجیاکان و مردنی دەیان کەس بەهۆی خراپ بەڕێوەبردنی کارەکانیان کەچی نەك هەر نەدراون بە داگا تا لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت و قەرەبوی زیانلێکەوتوان بکرێتەوە بەڵکو پرۆژەی گەورەتریان پێ دەدراوەو پاداشت کراون لە بەرانبەر جێبەجێ کردنی پرۆژەکان، سەیر لەوە بوو تێچووی پرۆژەو ڕێژەی قازانجەکانیان بەدەر بوو لە ستانداردی جیهانی، بۆ نموونە ئەگەر بەڵێندەرێکی ئێرانی یان کۆریایی بینای قوتابخانەیەکی بە ٢٥٠ ملیۆن دیناری عێراقی تەواو کردبێت ئەوا ٥٠٠ ملیۆن دیناریان بۆ بەڵێندەرەکانی خۆیان دادەنا لە ڕێگەی ئەو تەندەرە ساختانەوە کە وەك شانۆگەریەك لە وەزارەتەکان نمایش دەکرا. کار گەیشتە ئەوەی دەست بخەنە ناو کۆمپانیا بیانیەکانیش ' هیچ پرۆژەیەکیان پێ نەدەن ئەگەر بەشێك لەقازانجەکەی بۆ ئەوان نەبێت.

ئەم دەست وەردانە زەق و نایاسایی و ناشەرعیەی گەورە بەرپرسانی شاخ گەیشتە ناو گرنگترین سامانی نەتەوەیی کە

نەوتەو چەندین کۆمپانیای ئەو بوارەیان بە هاوبەشی لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکان دروست کردو نەوتی کوردستانیان هەرزان فرۆش کرد.

کاربەدەست و سەرکردەو بەرپرسەکانی شۆڕش خراپترین کارێك کە کردبێتیان و بوبێتە هۆکاری ئەوەی یاسا لەم وڵاتە پێشنەکەوێت و ڕۆڵی گرنگ نەبینێت لە ژیانی خەڵك و هێنانەدی دادپەروەری و کەم کردنەوەی فەوزاو هەرای سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوەبوو دەزگاکانی دادوەریان بەخزم و کەسوکاری خۆیان و ئەوانە سپارد کە لەژێر فەرمانی خۆیاندا بوون، ئەمەش ڕەنگدانەوەی خراپی هەبوو لەسەر جێبەجێ نەکردنی یاساو پێشێل کردنی لەو دۆسیانەی کەپەیوەست بوون بە خۆیانەوە، باشترین بەڵگەش ئەوەیە هیچ وەزیرو کاربەدەستێکی حکومی و هیچ گەورە بەرپرسێکی وڵات و هیچ سەرکردەو فەرماندەیەکی شۆڕش نەدراون بە دادگا جگە لەوانەی خۆیان مەبەستیان بوو تا وەك شانۆگەریەك نیشانی خەڵکی بدەن و ڕای گشتی پێ چەواشە بکەن و خەڵکی پێ بخەڵەتێنن، پرسیاری خەڵك ئەوەیە ئایا لەماوەی سی ساڵی حکومڕانی ئەم هەرێمەدا هیچ بەرپرسێك گەندەڵی نەکردوەو هیچ تاوانێکیان ئەنجام نەداوە تا بدرێن بە دادگاو حکوم بدرێن ؟ هەڵبەتە بەڵێ سەرچاوەی گەندەڵی و خراپ

بەکارهێنانی پێگەی سیاسی و ئیداری و تاوانی کوشتن و ڕفاندن و زیندانی کردنی خەڵکیان لە ئەستۆیە بەڵام هیچ کامێکیشیان لە گوڵ کاڵتریان پێ نەگوتراوە چجای حکومدان. هەر بەو هۆیەوە کە ڕێگەیان نەداوە دادگاکان سەربەخۆ بن دەنگە زووڵاڵەکانی ناو کۆمەڵگە نەیانتوانیوە هیچ ئامانجێك بپێکن تەنها قسەو ڕەخنەگرتن نەبێت، قسەو ڕەخنەش نەیتوانیوە کەمێك بیرکردنەوەو تێڕوانینیان بگۆڕێت.

بەشێك لەسەرکردەکانی شۆڕش و خزم و کەسە نزیکەکانیان دەستیان بۆ مەترسیدارترین کارو شێوازی پارەپەیدا کردن برد لە ڕێگەی بازرگانی کردن بە مادده هۆشبەرەکان بە بەکارهێنانی پێگەو دەسەڵات و ناوبانگ و بەرپرسیارێتی خۆیان لە ئاودیوکردنی ماددەکان بۆ هەرێمی کوردستان تا لەپشکنین و ئاشکرا بوون و گرتن پارێزراو بن، کە بەهۆیەوە سەدان کەسیان ئالوودە کرد بەو ژەهرو مادده هۆشبەرانەو سەدان گەنجیان تێوەگلاند لەم جۆرە کاسبی کردنە.

لەدوای تێکچوونی پەیوەنیەکانی هەرێم و بەغدا لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٤ کاربەدەستان و سەرکردەکانی شۆڕش دەستیان برد بۆ بڕینی مووچەی خەڵك و بەیاسایەکی ناکامڵ و بێویژدانانە نانی سەدان هەزار کەسیان بڕی و بوونە هۆکاری برسی بوونی ملیۆنان کەسی تر، لە ساڵی ٢٠١٥ لەکۆی دوانزە

مووچـه چـوار مووچـەی تەواوەتیـان نەدایـە فەرمانبـەران، لە سـاڵی ٢٠١٦ تـەواوی مووچـەی فەرمانبەرانیـان بـە ڕێژەیەکـی دیاریکـراو بەگوێـرەی ڕێـژەی مووچـە کرایـە پاشـەکەوت بـەم شـێوەیە:

مووچەی ١٠٠ تا ٢٠٠ هەزار، بڕی ١٥٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٢٠٠ تا ٣٠٠ هەزار، بڕی ٢٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٣٠٠ تا ٤٠٠ هەزار، بڕی ٢٥٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٤٠٠ تا ٥٠٠ هەزار، بڕی ٣٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٥٠٠ تا ٦٠٠ هەزار، بڕی ٣٥٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٦٠٠ تا ٧٠٠ هەزار، بڕی ٤٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٧٠٠ تا ٨٠٠ هەزار، بڕی ٤٥٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٨٠٠ تا ٩٠٠ هەزار، بڕی ٥٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٩٠٠ تا یەك ملیۆن، بڕی ٥٥٪ی پاشەکەوت

مووچـەی یـەك ملیـۆن تـا یـەك ملیـۆن و پێنـج سـەد هـەزار، بـڕی ٦٠٪ی پاشـەکەوت

مووچـەی یـەك ملیـۆن و پێنـج سـەد هـەزار تـا دوو ملیـۆن، بـڕی ٦٥٪ی پاشـەکەوت

مووچەی دوو ملیۆن تا سێ ملیۆن، بڕی ٧٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی سێ ملیۆن تا پێنج ملیۆن، بڕی ٧٥٪ی پاشەکەوت

مووچەی پێنج ملیۆن و زیاتر، بڕی ٧٥٪ی پاشەکەوت .

لەساڵی ٢٠١٧ یەك مووچەی تەواوەتی فەرمانبەرانیان نەداو یانزە مووچەکەی تریش بەهەمان بڕیارو بەهەمان ڕێژەی پاشەکەوت، لێبڕینیان لە مووچەخۆران کرد، هەروەها لە ساڵی ٢٠١٨ ش سێ مووچەی تەواوەتیان نەدایە فەرمانبەران و ڕێژەی پاشەکەوت کردنی نۆ مووچەکەی تر گۆڕانکاری بەسەردا هات، ئەو مووچانەی کەوتبوە نێوان ١٠٠ هەزار تا ٤٠٠ هەزار پاشەکەوتی لەسەر لادراو مووچەکانی تریش بەم شێوەیە پاشەکەوتی لێ کەم کرایەوە:

مووچەی ٤٠٠ تا ٥٠٠ هەزار بڕی، ١٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٥٠٠ تا ٦٠٠ هەزار بڕی، ١٥٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٦٠٠ تا ٧٠٠ هەزار بڕی، ١٦٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٧٠٠ تا ٨٠٠ هەزار بڕی، ١٧٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٨٠٠ تا ٩٠٠ هەزار بڕی، ١٨٪ی پاشەکەوت

مووچەی ٩٠٠ تا یەك ملیۆن بڕی، ٢٠٪ی پاشەکەوت

مووچەی یەك ملیۆن تا یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار بڕی، ٢٣٪ی پاشەکەوت

مووچـەی  یـەك ملیـۆن و پێنـج  سـەد هـەزار تـا دوو ملیـۆن  بـڕی، ٢٥٪ی  پاشـەکەوت

مووچەی دوو ملیۆن تا پێنج  ملیۆن  بڕی، ٣٠٪ی پاشەکەوت

مووچـەی سـاڵی  ٢٠١٩ ش بەهەمـان لێبڕیـن و پاشـەکەوت مایـەوە، لەسـاڵی ٢٠٢٠ یـش حـەوت مووچـەی تەواوەتیـان نەدایـە فەرمانبـەران و پێنـج مووچەکـەی تـر  بەلێبڕینـی ڕێـژەی جیـا جیـا درایـە فەرمانبـەران. بـەم بڕیارەیـان ( بڕیـاری پاشـەکەوت ) ئاسـتی بازرگانـی و ئاڵـو وێـرو کارو کاسـبی و کرێـکاری بەشـێوەیەکی بەرچـاو دابـەزی و ڕێـژەی بێـکاری بـۆ سـەرووی ١٩٪ بـەرز بووەوە، بـەم هەنگاوەیـان گورزێکـی کوشـندەیان لـە خەڵکـی کوردسـتان و پێشـکەوتن و ئاوەدانـی و ژیانـی هاونیشـتیمانیان وەشـاند، هەزاران خێـزان کەوتنـە سـەر سـاجی عەلـی ، نەیاندەتوانـی بژێـوی مـاڵ و منداڵیـان دابیـن بکـەن.

لـە بەسـەرکردنەوەیەکی مەیدانیـمان لەسـاڵی ٢٠١٨ بـۆ ١٢ ناوەند لـە ناوەندەکانـی خوێنـدن لـە هەولێـرو سـلێمانی و دهـۆك و کۆیـەو سـۆران و بنەسـڵاوە و سەیدسـادق و ئاکـرێ و چەمچەمـاڵ و دووکان و ڕانیـەو هەڵەبجـە بۆمـان دەرکـەوت ٦٥٪ تـا ٧٥٪ ی منداڵانـی ناوەنـدەکان بـە درێژایـی کاتەکانـی خوێنـدن پارەیـان پـێ نەبـوە بـۆ خەرجـی ڕۆژانەیـان، لـە خـاوەن دووکان و حانووتەکانـی نـاو

ناوەندەکانم پرسی : ئاستی ژیانیان چۆنە ؟ وڵامێکی گشتیم لە زۆربەیان دەستکەوت ' دەیانگوت : لە ٧٠٪ ی خوێندکاران و قوتابیان بەبێ پارە دێنە ناو هۆڵەکانی خوێندن و لەماڵەوە پارەیان پێ نادرێت چونکە خێزانەکانیان نەبوونن ' توانایان نیە هەموو ڕۆژ خەرجیان پێ بدەن، هەروەها دەیانگوت زۆربەی منداڵەکان تامەزرۆ بوون بۆ خواردنی لەفەو چپس و کێك و خواردنەکانی تری ناو حانووت بەڵام چونکە پارەیان پێ نەبوو لەپشوی نێوان وانەکاندا دەهاتنە بەردەم حانووتەکان و بەچاوی پڕ ئەسرین و فرمێسکەوە لە کەرەستەی ناو دووکانەکانیان دەڕوانی، جگە لە تەماشاکردن هیچی تریان پێ نەدەکرا.

لە ئەنجامی ئەو قەیرانە ئابوریە نیمچە دەسکردەی ماڵ بە ماڵی خەڵکی کوردستانی گرتەوە هەزاران خێزان توانای دابین کردنی خۆراکی پێویستی وەك گۆشت و برنج و ڕۆن و خۆراکەکانی تریان کەم بووەوە و توانای کڕینی جلوبەرگ و پێداویستیکانی ژیانیان دابەزی بۆ ئاستێکی نزم بە ڕادەیەك سەدان خێزان هەر سێ ژەمی نان خواردنی ڕۆژانەیان تەنها ماست و چای بێت و جلی کۆن و دڕاو بەکار بهێنن و پشت بە جلوبەرگی بەکارهاتووی لەنگەی وڵاتانی ئەوروپاو تورکیاو ئێران ببەستن، ئەمەش فاکتەرێك بوو بۆ لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی

دەیان خێزان و زیاد بوونی ڕێژەی جیابوونەوەو تاوانی دزی و ڕاوەڕووت و فێڵ و تەزویرو چەندین تاوان و دیاریدەی ناقۆڵای تر.

یەك لەگرفتە هەرە گەورەکانی سەرکردەو بەرپرسانی شۆڕش ئەوەبوو لە کاری حکومڕانی و بەڕێوەبردنی وڵاتدا لەلایەك ناشارەزا بوون لەلایەکی تر نادڵسۆز بوون بۆ پیشەو کارەکانیان لەوانەش خراپتر نائەمین بوون، ئەم خاسیەت و خوە خراپانە لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵات و خاوەندارێتی کردنی گەل و نیشتیمان لە چەندین ڕووەوە ڕەنگی دابووەوە، نەیانویست لە ڕێگەی بونیاتنانی ژێرخانێکی ئابووری پتەو کار بۆ سەدان هەزار دەرچووی زانکۆو پەیمانگاکان و خەڵکی تر دابین بکەن، بەمەش ئەو ژمارە زۆرە دەرچوانەش ڕێژەی بێکاریان چەندین هێندەی جاران بەرز کردەوەو لەشکرێك دەرچووی پەیمانگاو زانکۆکانیان خستە بازاڕەوە بێ ئەوەی سوود لە تواناو ووزەیان وەربگیرێت و چارەسەری پێشوەختەیان بۆ هەبێت ، جگە لەمانەش کاربەدەست و بەرپرس و سەرکردەکانی شۆڕش و دەست و پێوەندەکایان بەهۆی نادڵسۆزی و نائەمینی و ناشارەزاییان و لەبیر کردنی پرانسیپ و دروشمە جوانەکانی شۆڕش، خۆشەویستی نیشتیمان و گەلیان لە دڵ و دەروونی بەشی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان دەرهێنا تا ئەو ڕادەیەی

زۆرینەی کۆمەڵگەو بەشێکی پێشمەرگەو ڕێکخستنە دێرینەکان و هاوکارەکانی هەردوو شۆڕش پاشگەز ببنەوە لە ڕەنج و بەرخۆدان و تەقەڵاو ماندوو بونیان و خۆزگە بخوازن بە سەردەمی بەعس، تەنانەت جوتیاران و لادێ نشینەکان پاشگەز ببنەوە لەو نان و خزمەتەی کاتی خۆی بەپێشمەرگەو سەرکردەو فەرماندەکانی شۆڕش کردبوویان.

یەك لەهەنگاوە مەترسیدارەکانی کاربەدەست و سەرکردەکانی شۆڕش خەساندنی سیستەمی سیاسی وڵات بوو بە جۆرێك بوار نەڕەخسێت بۆ گەنج و نەوەی دوای ڕاپەڕین تا لەحزب و پارتێکی نوێدا ڕکابەری سیاسی سەرکردەکانی شۆڕش بکەن و لە گۆڕەپانی سیاسیدا ڕۆڵ بگێڕن و توانای خۆیان تاقیبکەنەوەو هەوڵی دەستاودەست کردنی دەسەڵات بدەن بەشێوەی هەڵبژاردنی دیموکراسیانەو دوور لە بەرچاو تەنگی سیاسی، یەك لەو ئامرازانەی بەکاریان هێنا تا دەنگ و سەدای سیاسی نوێ دەرنەکەوێت چەندین سەرکردەی شۆڕشیان ڕاسپارد تا ئۆپۆزسیۆنی کارتۆنی دروست بکەن بۆ ئەوەی دەنگە نارازیەکانیان لێ کۆبێتەوەو هەوڵی دروست کرنی پارتی ئۆپۆزسیۆنی ڕادیکاڵ نەدەن و شەرعیەت بدەن بەو سیستەمە سیاسیەی خۆیان کاریان لەسەر دەکرد, بەمەش مانەوەیان لەحکوم مسۆگەر کرد، باشترین نموونەی ئۆپۆزسیۆنی کارتۆنیش

خۆی لە بزووتنەوەی گۆڕان و نەوەی نوێدا بینیەوە کە گیانی ئۆپۆزسیۆن بوونیان پێ کوشت و متمانەی خەڵکیان بەهەر هێزێك نەهێشت کە لەئێستاو ئایندەدا بیانەوێت دەربکەون و کار بکەن، ئەمەش تاکتیکێك و هونەری سیاسی سەرکردەکانی شۆڕش بوو تا مانەوەی خۆیان و نەوەکانیان لە ترۆپکی دەسەڵات درێژ بکەنەوە تا عەیامێکی تر. هەر ئەوەندە نا بەڵکو پارتە کوردیەکان و سەرکردەکانی شۆڕش لەناو خۆشیاندا ڕێگەیان نەدا نەوەی دوای ڕاپەڕین بگەن بەلووتکەی پارتەکان جگە لەکوڕو کوڕەزاو برازاو ئامۆزای خۆیان بۆ ئەوەی جڵەوی دەسەڵاتی حزبەکانیان لە دەستی خۆیاندا بمێنێتەوە .

ئەوەی لەم بەشەدا باسم کردوە ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرەو هیچ کەسێك ناتوانێت نکۆڵیان لێ بکات و پاساو بۆ بەرپرسان و فەرماندەکانی شۆڕش بهێنێتەوەو بەرگری لە هەڵسووکەوت و ڕفتارو مامەڵەو شێوەی بەڕێوەبردنیان بکات کە ئەوپەڕی نادادی و بەکەم تەماشا کردنی خەڵکی کوردستان و پشتگوێ خستنی ئەرکە نیشتیمانی و نەتەوەییەکانیان و گۆڕینەوەیان بوو بە بەرژەوەندی شەخسی و کەڵەکە کردنی پارەو سەرمایەی وڵات لە خەزێنەی شەخسی.

بەو هۆکارانەی کە باسم کرد خەڵکی کوردستان توشی جۆرێك لە ڕەشبینی بوون، ئومێدیان کەم بووەوە بۆ داهاتووی خۆیان

و نیشتیمانەکەیان ، زۆرینەیان هیچ خۆشەویستیەکیان نەما بۆ خاك و وڵات تا کار گەیشتە ئەوەی بەشێك لە پێشمەرگەی دێرین و ڕێکخستنی دێرین و کەسانی نیشتیمان پەروەرو زیندانی سیاسی و بەشێك لە کەسوکاری ئەنفال کراو و کوڕە شەهیدو بریندارو ڕزگاربوی کیمیاباران کراوەکان و فەرمانبەرانی دەوڵەت لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و بۆنەو دانیشتنە کۆمەڵایەتی و بەرنامە تەلەفزیۆنیەکان بە ئاشکرا بڵێن سەد خۆزگەمان بە سەردەمی بەعس، لەوەش خراپتر بڵێن گەر حکومەتی ئێستای عێراق فەوجی جاش بکاتەوە دەبین بە جاش، ئەمەش ئەوپەڕی لاواز بوونی هەستی نەتەوەیی تاکی کورد نیشان دەدات، لەمەشدا هۆکارو پاڵنەر تەنهاو تەنها بەرپرس و سەرکردەو فەرماندەکانی شاخ و دەروێشەکانیان بوون.

بۆ ئەوەی ئاستی هەستی نیشتیمان پەروەری و ئینتیمای نەتەوەیی کۆمەڵگەمان بۆ دەربکەوێت لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك لە لاپەڕەکەی خۆم پرسیارێکم ورژاند کە شێوەیەك بوو لە ڕاپرسی ئەلکترۆنی، دەقی پرسیارەکەم بەم شێوەیە بوو :

پرسیار:

گـەر پەلامـاری هەرێمـی کوردسـتان درا بـە مەبەسـتی داگیرکـردن ئایـا ئامـادەی بەرگـری لـێ بکـەی ؟

تکایـە وڵامەکانتـان حەقیقەتـی ناختـان بێـت چونکـە پرسـیارەکەم جۆرێکـە لـە ڕاپرسـی و ئامـاری وڵامەکانتـان بەکاردەهێنـم بـۆ توێژینەوەیـەك .

لـە نێـوارەی ڕێککەوتـی ١٨ ی ئەمـووزی ٢٠٢٠ ڕاپرسـیەکەم لـەواری خـۆم بـڵاو کـردەوەو مـاوەی ٤٨ کاتژمێـری خایانـد کـە تیایـدا ٦٧٩ کـەس بەشـداری تێـدا کـرد، لـەو ژمارەیـە ٢٧ کەسـیان وڵامـی پرسـیارەکەی منـی نەدابـووەوە نـە بـە ( بەڵـێ ) نـە بـە ( نەخێـر ) ' تەنهـا بەناردنـی گوڵێـك یـان نیشـانەیەکی خۆشەویسـتی کۆمێنتەکـەی ناردبـوو، ٦٣ کەسـیش بـە( بەڵـێ ) وڵامـی دابـووەوە' ئـەوەی تـر ژمارەیـان ٥٨٩ کـەس بـوو کـە دەکاتـە ٨٦٪ ی دەنگـدەران بـە نەخێـر وڵامیـان دابـووەوە، ئـەم ڕێژەیـەش ئـەو ڕاسـتیە دووپـات دەکاتـەوە کـە زۆرینـەی خەڵـك ئامـادە نیـن بەرگـری لـە نیشـتیمانەکەیان بکـەن گـەر کەوتـە بـەر پەلامـارو لەشکرکێشـی و داگیرکـردن، لەنـاو وڵامـی نەخێـردا ٢٩٣ کەسـیان لـە هێـزە چەکـدارە جیاجیاکانـی پۆلیـس ' ئاسـایش ' پێشـمەرگە ' پۆلیسـی بەرگـری شارسـتانی' پۆلیسـی نـەوت و گاز ' پۆلیسـی

کارەبـاو دارسـتان و ژینگـەو پۆلیسـی هاتوچـۆو ڕەگەزنامـە بـوون.

لـە هەمـان مانـگ و سـاڵدا سـەردانی مەیدانـی لیواکانـی هێـزی پێشـمەرگەم کـرد لەیەکەکانـی حەفتـا و هەشـتا، هەمـان پرسـیارم ئاراسـتەی هێزەکانـی پێشـمەرگە کـرد کـە ژمـارەی ئەوانـەی کەوتنە نـاو ڕاپرسـیەکەم هـەزار کـەس بـوون، لـەو ژمارەیـە ٦ کەسـیان بـە ( نازانـم ) وەڵایـان دایـەوەو ٧٥ کەسـیان بـە ( بەڵـێ ) و ٩١٩ کەسیشـیان بـە ( نەخێـر ) وەڵامیـان دایـەوە، کاتێـك بەشـێکی زۆری هێـزە چەکدارەکانـی هەرێـم بـە ڕاشـکاوی بڵێـن بەرگـری لـە نیشـتیمان ناکەیـن ئـەو پێشـبینیەمان بـۆ دەکات بەڕاسـتی کـە هـەر کات هەرێمـی کوردسـتان لەلایـەن هێـزە داگیرکەرەکانـی ناوچەکـەوە پەلامـار درا بـە ئاسـانترین شـێوە داگیـر دەکرێـت ئەگـەر کۆمەڵگـەی نێودەوڵەتـی پێـش لـەو داگیرکاریـە نەگرێـت ، بـە واتایەکـی تـر هەرێمـی کوردسـتان بـێ هیـچ بەربەسـت و بەرگریەکـی ئەوتـۆ دەتوانرێـت داگیـر بکرێـت، لەکاتێکـدا سـاڵانی زوو زۆرتـر لـە ٨٠٪ ی خەڵکـی کوردسـتان ئامـادە بـوون بەرگـری لەنیشـتیمان بکـەن کەچـی ئێسـتا لـە ٨٦٪ی خەڵکـی کوردسـتان ئامـادە نیـن بەرگـری لـە نیشـتیمانەکەیان بکـەن ( بەپێـی هـەردوو ڕاپرسـیەکە).

دەکرێـت لەخۆمـان بپرسـین ئـەو هۆکارانـە چیـن کـە زۆرینـەی خەڵکـی کوردسـتان بـە هێـزی پێشـمەرگەو هێزەکانـی ناوخۆشـەوە

بگەنە ئەو باوەڕەی بەرگری نەکەن لە هەرێمی کوردستان ؟ ئایا خودی نیشتیمانە کە خێرو بێری کەم بووەو ژینگەی پیس بووەو مەترسی بوومەلەرزەو لافاو و زریان و بورکان ئەم باوەڕەی لا دروست کردوون یان کاربەدەستان و حکومڕانانی هەرێم و پارت و لایەنە سیاسیەکان هۆکارن تا خۆشەویستی نیشتیمان لە دڵ و دەروونی تاك بەتاکی کۆمەڵگەی کوردستان نەمینێت و وایان لێبکەن کە بەرگری لە وڵاتی خۆیان نەکەن و نیشتیمانیان لا تاڵ و تفت بێت و کوردستان بە نیشتیمانی خۆیان نەزانن ؟

فەرهاد سەنگاوی بێژەری جارانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کاسێتێکی دەنگی کە شێوەیەکە لە پەخشان لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بڵاو کردەوە، دەقە پەخشانەکەی گوزارشتە لەو ڕاستیەی کەسەرکردەو فەرمانده‌کانی شۆڕش زۆر زوو دروشم و پرانسیپەکانی شۆڕشیان لە بیر کردو بەدرۆیان خستەوە کە شۆڕشیان بۆ ڕزگار کردنی نەتەوەیەکی ژێردەست هەڵگیرساندبێت بەڵکو تەنها بۆ خۆیان و دارو دەستەو خزم و کەسوکارو پیاوەکانیان شۆڕشیان هەڵگیرساندوە، پێم باش بوو دەقی پەخشانە دەنگیەکەی وەك خۆی بە نوسین بڵاو بکەمەوە، دەڵێت:

لەپارتیزانێکی ئەمەکدارەوە بۆ شێخە ڕەش ئەی گەورەو سەروەرم، ئەفسووس هەزار ئەفسووس زۆرێك لە هاوسەنگەرانت لە باسی ئەشکەوت و کەرەگێلەك و نانە ڕەق قەڵس دەبن. ئێستا لە بری کەرو گوێدرێژو پاتەی لاستیك ' ئۆتۆمبیلی پۆرش و بۆگاتی و ڕۆس ڕایس و ڕەتلێك سکرتێرەو تەنانەت کۆپتەری تایبەتی و خەتی بازرگانی و فڕۆکەو تەنانەت باخیرەشیان هەیە.

لەبری ئەشکەوت و کیسەی خەوی چڵکن و سپێون ڤێللاو کۆشك و ئاپارتمانی بەرزو ئوتێلەکانی ئنگلتەراو واشنتۆن کە سەریان لە پەڕەی هەوردایە، لەبری بێسیمەکەی جاران شەبەکەو خەتی ئەنتەرنێتی تایبەت و پشکی ئاسیاو کۆڕەك و ڕەقەم خاس و مۆبایلی گرانبەهایان هەیە، لەبری نانە ڕەق و نان ساجی و کولیچەی کۆڵەپشتەکەی جارانی تۆ زۆربەیان سوب و مەزەی گەعدەیان بە فڕۆکەیەکی تایبەت لە ڕووسیاو ڕۆماوە بۆ دێت .

شێخە گیان تۆ بۆ خەرج کردنی چەند دینارێکی ئەو کاتە لێژنەیەکت لە پیاوە مەردەکان پێدەهێنا بەڵام ئێستا لە دوای کۆچتتان لێرە کاری لێژنە بۆ دیزە بەدەرخوونەو داپۆشینی سەفەقاتی گەورەو فەزاحەتە نەبیستراوەکانە، ئێستا لێرە کوڕ ئەو کوڕەیە خاوەنی بیرە نەوتی خۆی بێت کە شوێنی ئەو بیرە نەوتانە جاران حەشارگەو پەناگەی خۆمان بوون، هەر

فیرعەونێـك بـە هـەزاران دۆنـم ئـەرزە دابـەش دەكات بەسـەر دەڵاڵ و پـاش دزدا، لەبـەر ڕەتلـی تانكـەری غـازو نـەوت بـرا ناپرژێنـە سـەر بـرا، ئێسـتا لێـرە قەیرانـی ئەمەكداریـەو ئەزمـەی وەفـا، ئێسـتا ئێـرە وڵاتـی شـازادەو ژەنەڕاڵـە گـەر وا بـڕوات ئێمـەش دەڵێیـن خۆزگەمـان بـە ئێـوەو بـە شـەهیدان، بـەڵام شێخە خـۆت پێتگوتیـن ورە بـەرز بـن چـۆك دانـەدەن ، هەمیشـە گەشـبین بـن و لـە ڕێـگای حـەق قـەت لا مـەدەن، شـێخم بەخـوا خەمەكانمـان زۆر زۆر گـەورەن، چاوەڕوانـی حوكمـی گەلیـن دزو دەسـت پـاك جیـا كاتـەوە لاپـەڕەی نـوێ بـۆ خائیـن و خەباتگێـڕان جیاكاتـەوە.

# گوڵێك دەپشكوێت

لەدامێنــی جێگاکەیــان چراکــە کزکــز دەســوتا هــەر ئەوەتــەی ڕووناکـی دەدایـە ژوورەکـە، لـەوە دەچـوو نەوتـی کـەم تیـا مابێـت [1] بۆیــەش ڕووناکیەکــەی کــەم و کــز دەهاتــە بەرچــاو. چراکـە لـە فتیلێـك پێكهاتبـوو، فتیلەکـە لـە بانگـی ئێـوارەوە نەوتـی دەمـژی و هێــواش هێــواش دەیکــردە دووکــەڵ و لــە ژوورەکــە پــەرش و بـڵاوی دەکــردەوە، بەهــۆی ئــەو دووکەڵــەوە کاریتــەی ژوورەکــەو حەسـیرو لێفـەو جاجـم و تـەواوی کەلوپەلـی نـاو ژوورەکـە ڕەش هەڵگەڕابــوون، کاریتــەی خانوەکــە لــەدار پەڵــك و دار تــووی خـوارو خێـچ و ئەسـتوور و ناقـۆڵا پێكهاتبـوو، تەنانـەت ئـەو گـەڵا قەمیشـانەش ڕەش هەڵگەڕابـوون کـە لـە شـێوەی پرچـی ئاڵـۆزکاو لـە بنمیچـی ژوورەکـە شـۆڕ بووبوونـەوە بـۆ خـوارەوە، وەنەبێـت تەنهـا چراکـە سـەرچاوەی ئـەو دووکەڵـە بوبێـت کـە ژوورەوەی قانـگ دابـوو بەڵکـو کوانوەکـەش کـە لـە ناوەڕاسـتی ژوورەکـە

---

[1]- جـاران لـە لادێکانـی کوردسـتان نـە کارەبـاو نـە فانـۆس و نـە لالـە ( لامپـا ) هەبـوو بـۆ ڕوونـاك کردنـەوە ، بەڵکـو فتیـل هەبـوو، فتیـل بریتـی بـوو لـە قوماشـێکی لـەدەزوو دروسـت کـراو، دەخرایـە نـاو دەفرێکـی خـڕی شووشـە یـان فافـۆن، دەزوەکـەکان بـەدەم یەکـەوە چنرابـوون و لـە خـوارەوە نەوتیـان ڕادەکێشـاو لـە سـەرەوەش ئاگـری تێ بـەردەدرا بـۆ ڕووناك کردنـەوەی دیوەخـان و ژوورەکان.

دروست کرا بوو و بۆ ئەو سەردەمە ڕۆڵی سۆپاو غازی پێنج چاوەی دەبینی ئەویش دووکەڵێکی زۆری پەرت دەکردەوە، گەر سەری پەنجەت لە هەر کەلوپەلێکی ناو ماڵەکەت بدابا بایی خۆی ڕەشی هەڵدەگرت کە لە ئەنجامی کاری فتیل و کوانووەکە ڕەش بوو بوون.

کەس ئیرەیی بەم حەوشەوبانە نابات، لە هاویناندا حەوشەیەکی ڕەق و وشکە تەنانەت یەك بست سەوزایی و یەك درەخت و یەك گوڵی تیا بەدی ناکەی، جگە لەوەی شوێنەکە بێئاوە خۆشیان حەزو تاقەتی چاندنی گوڵ و درەختیان کەمە، نەك هەر ئەوان بەڵکو زۆرینەی خەڵکی ئەم ئاواییە گرنگیان نەداوە بە چاندنی درەخت و سەوزایی گەرچی ئەوەی چاندووشیەتی باش گەشەی نەکردووەو گەڵاکانی زەردو بێزەووەرن چونکە ژێرەوەی زەویەکە قەسپۆك و شاخە وەك خۆیان دەڵێن، لەوە دەچێت خراپی خاکەکەی هۆکاری بێتاقەتیان بێت بۆ چاندنی سەوزایی.

وەکو گوتم حەوشەکە لە هاویناندا دێمەڕۆك و ووشکەو حەزی دانیشتن تیایدا ئێجگار کەمە، لە زستانانیشدا بە نمە بارانێك دەبێت بە خلیسك، زۆر ووریا نەبی دەتخلیسکێنێ و دەکەوی بە زەویدا. لە هەموو لایەکی حەوشەکە ژووری لەقوڕو دار دروست کراو دەبینی کە وەك هێلانەی باڵندەی چەورۆکە

خۆیـان دەنوێنـن، کونێـك لێـرە، یەکێکـی تـر لـەوێ ئـەوەی دی لەولاتـر، ئیـدی ژوورەکان وەك بڵێـی بـۆ بنیادەم دروسـت نەکرابن.
ئـەو شـوێنەی فتیلەکـە کاری تیـا دەکـرد ژووری دانیشـتنە بـۆ بەڕێکردنــی میــوان دروســت کرابــوو لەهەمــان کات دا ژووری نوستنیشـە. لـە تەنیشـتی ئـەو ' ژووری زەخیـرە بـەدی دەکەیـت کەوتبـوە لای ڕۆژهەڵاتـی خانوەکـەوە، ئەویـش وەك ژوورەکـەی تـر دیوارەکـەی پـان و بەخشـتی قـوڕو کاریتـەی گـەورە گـەورەی ناحەزو ناشـیرین دروسـت کرابـوو، زەخیـرەی چـی تیابێـت ؟ کەندوویـەك لـە سـووچی لای ڕاسـتی سـەرەوەی ژوورکەدایـە، کەنـدوو بـۆ دانـان و هەڵگرتنـی ئـارد تیایـدا ' بـەکار دەهـات لەجێـی تانکـی یاخـود گونیـەی ئێسـتا، کەنـدوو چـۆن دروسـت دەکـرا؟ پیـاوان بـە تێـڕی لەمـوو دروسـتکراو لەخاکێکـی مەیلـەو سـوور خۆڵێکـی ووردیـان دەکێشـایەوە نـاو حەوشـەو (کا)ی ووردیـان تێکەڵـی دەکـردو بـە ئـاو دەیانگرتـەوەو دەیانکـرد بـە قوڕێکـی خەسـت، قوڕەکـە بـۆ مـاوەی هەفتەیـەك دادەنـراو هەمـوو ڕۆژ جارێـك شـل دەکرایـەوە تـا لـە مـاوەی ئـەو چەنـد ڕۆژەدا ببێـت بـە قوڕێکـی بـاش، ئیـدی کابانــی دەســتڕەنگینیش داوێکــی لەکەمــەرەی خــۆی دەبەســت و کــراس و بنکــراس و جلەکانــی ژێــرەوەی پــێ توندوتــۆڵ و گــورج دەکـرد، ئنجـا قۆڵـی لـێ هەڵدەماڵـی و دەسـتی دەکـرد بەدروسـت کردنـی، کابـان ئەمـڕۆ چینێـك قـوڕ بەئەسـتووری پێنـج سـانتیمەتر

دادەنێت و دەستی لێ هەڵدەگریت تا سبەی ' کە مەبەست لێی ئەوەیە ئەو چینەی دایناوە کزر بێتەوە، سبەی چینێکی تری لەسەر دادەنێت, ئیدی هەموو ڕۆژ چینێکی نوێی لێ دروست دەکات تا کەندوەکە تەواو دەکات، ئەم شێوازی کارکردن و قوڕ گرتنەوەیە بۆ دروست کردنی تەندووری نان و دروست کردنی عەمباری قشپلیش بەکار دەهات، ڕەنگە لەکاتی خوێندنەوەی ئەم دێرە سەیرت بەوە بێت کە بۆچی جاران قشپلیان هەڵدەگرت ' سوودی چیە ؟ قشپل (پشقل) پاشەڕۆی بزنە، کابان لە هەوێز بەگسکی دار (داری کفر) خڕیان دەکردەوەو لەبەرهەتاو هەڵیان دەخست تا ووشك دەبوەوە پاشان بە گونیە دەیانگواستەوە ناو عەمباری لەقوڕ دروستکراو تاکو زمستان بۆ ئاگرکردنەوە لە چێشت لێنان و نان کردن و گەرم کردنی تەندووری نان بەکاری بهێنن.

لە تەنیشتی کەندوەکە چوار هیزە بەڕیزی یەکەوە دانراون، یەکیان ڕوونی چێشتی تیایە کە بەرهەمی ئاژەڵی خۆیانە، دووانیشیان دۆشاو و خۆشاوە، ئەوەی تریش بەتاڵە، لەبەرانبەری هیزەکان دوو جواڵی گەورە هەن کەپڕن لە گەنم و جۆ، لەولاتر چەند تورەگەیەکی گچکە گچکەو مام ناوەندو ڕەنگاو ڕەنگ دەبینرێت هەموویان پڕن لەساوارو بڕووش و نیسك و نۆك کە هەموویان لەسەر گابەردی تەخت دانراون ' بەمانە

دەگوترێت زەخیرە ، گابەردە تەختەکان لە ڕۆژگاری پێشووتر لە هەڵەت و دەم بەستەکان هێنابویان تا زەخیرەی لەسەر دابنێن بەو مەبەستەی زمستان شیتەڕی پێ نەگات و مۆرانەش لێی نەدات و خەسار نەبێت. لە ژووری زەخیرە پریاسکەی تریش هەن کە هەریەکەو بۆ کاروبارێکی تری ناوماڵ سوودی لێ وەردەگرن، لەوانە جواڵە بۆر کە لەوە دەچێت پڕ بێت لە دانەوێڵەی تر کە تایبەت بوو بە دلیوان و دانەدۆك[1] ، پریاسکەیەکی تر کە تایبەت بوو بە دلیوان و دەرزی و خڕیلەو شوژن و هەندێك داوەبەن کە لەمووی بزن و مەڕ دروست کرابوون، شووژن (سوژن ) بۆ دروینی تێر و دروست کردنی کورتانی گوێدرێژ و وڵاغی بەرزە بەکار دەهات و دلیوانیش بۆ دروینی گونیەو هەندێك قوماشی ئەستوور و کەرەستەی ناو ماڵ بەکار دەهات، هەرچی دەرزیە بۆ دروینی جلوبەرگ و پینەوپەڕۆو قوماشی تەنك بەکار دەهات. ئەستووری و درێژی ( قەبارەیان ) لەیەکتر جیاوازە بۆ نموونە شووژن لە دلیوان درێژترو ئەستوور ترە ، دلیوانیش لە دەرزی گەورەترە.

لەتەنیشتی ژووری زەخیرە ، ناندێنێك دروست کراوە، ژوورەکە بەتەیمان کراوە بە دوو بەش، بەشێکیان پڕە لەداری ووشك کە دەمەو پایز لەناو چەم و بێشەو دارستانەکان دەیبڕن و

---

١- ترخێنە

بــۆ زمســتان لــەوێ کەڵەکــەی دەکــەن، بەشــەکەی تریــش دوو کوانــوی تیــا دروســت کــراوە، یەکیــان بــۆ نــان کــردن ئــەوەی تریــش بــۆ چێشــت لێنــان. لەســوچی خــوارەوەی حەوشــە پــان و بەرینەکــە دوو تەوێڵــە بــەدەم یەکــەوە هــەن، یەکیــان بــۆ هــەردوو گوێدرێژەکەیـان ئـەوەی تریـش بـۆ مانـگا ڕەش کـە هـەر یەکێکیـان سێ چـوار ئاخوڕیـان تیـا دروسـت کـراوە بـۆ لەوەڕانـدن و پێدانـی ئالیــك پێیــان، لەبەرانبەریشــیاندا ژوورێکــی تــرە کــە تایبــەت کـراوە بـۆ (کا)، پێـی دەڵێـن کادیـن یـان کادان. ئـەو ئێوارەیـەش وەکـو هەمـوو ئێوارانـی تـر زێنـەب چارۆگەکـەی کـردە ملـی و لـە کادینەکـە چارۆگەکـەی پڕکـرد لـە (کا) و هـەر ئاخوڕێـك چارۆگەیـەك (کا)ی تێکـرد تـا مانـگاو گوێدرێـژەکان بیکەنـە شـەوچەرەی شـەوی درێـژی ئـەو پایـزە.

ئــەم دەمــەو مەغریبــە حەوشــەکە جمەــەی دەهــات لەمریشــك، ئـەوان وا ڕاهاتبـوون لەگـەڵ گـەردی بەیـان کە زێنـەب دەرگای لێ دەکردنـەوە بچنـە سـەر زبڵـدان و بـەدوای خۆراکـی ئـەو بەیانیەیـان بگەڕێـن، گەرچـی زۆر جاریـش خۆیـان دەبوونـە خۆراکـی چەقـەڵ و ڕێـوی ئـەو تاریـك و ڕوونـە، هەندێـك لـە ڕێویـەکان دەیانزانـی مریشـکەکان لەگـەڵ سـەحەردا خۆیـان دەگەیەننـە کـۆڵان و سـەر زبڵدانـەکان کـە هـەڵاوەی گەرمـی لـێ هەڵدەسـتا تـا خۆیـان لـەو کرمانـەی سـەریان لـە قوڵایـی زبڵدانەکـە دەردەهێنـا تێـر بکـەن،

ئەوانیش مریشکێکیان بە گازو گیر دەهێنا، یەکەم شوێن کە پەلاماریان دەدا ملیان بوو تاکو قیڕەیان نەگاتە خاوەن ماڵ و بتوانن بیرفێنن و لەدەرەوەی گوند سفرەی ئەو بەیانیەیان لە کەندێك برازێننەوە.

چ ژیانێکی سەیرە؟ کرمە سپیەکان لەناو پاشماوەی ماڵاتەکان لەسەر زبڵدان دەهاتنە دەر تا خۆراکیان دەستکەوێت و بەو دەمەو بەیانە سکیان تێر بکەن، کەچی لەناکاوێك مریشکەکانی زێنەب لێیان دەهاتنە مەیدان و لەئانوساتێکدا دەیانخواردو سکی خۆیان بەکرمە سپیەکان تێر دەکرد، هەر لە هەمان کاتدا ڕێویەکیش لە بۆسەی ئەو بەیانەدا سکی خۆی لەمریشکەکانی زێنەب تێر دەکرد، ڕەنگە وا ڕێککەوتبێت کرمێکی سپی لەماوەی تەنها چەند دەقیقەیەکدا گەیشتبێتە ناو گەدەی ڕێویەك کە هەرگیز بەخۆراکی خۆی نەزانیبێت .

ئێوارەش بەهەمان تاس و حەمامی چەند ڕۆژە یەك یەك مریشکەکان بەرەو ناو حەوشە دەهاتنەوە، لەگەڵ زەردەی خۆر ئاوابووندا هەموویان بەکۆمەڵ لەناوەڕاستی حەوشەکە کۆدەبوونەوەو ملیان قیت دەکردەوەو جارجار باڵیان دەکردەوە کە جۆرێك بوو لەنمایش ' لە چاوەڕوانیدا بوون. ئەوان دەیانزانی زێنەب هەموو ئێواران تەشتێك گەنم و جۆ تێکەڵ دەکات و بەرەو ناوەڕاستی حەوشەکە دێت:

-تی تی تی تی تی تی تی .

ئەمە زمانی زێنەب بوو بۆ گردبوونەوەو بانگ کردنی مریشکەکانی تا گەنم و جۆیان پێ بدات، ئەوانیش لە زمانی زێنەب تێدەگەیشتن کە (تی تی تی تی تی تی) واتە : مریشکەکان وەرن دانتان دەدەمێ ، پاش پێنج شەش دەقیقە گسکیان لەحەوشەکە دەداو یەك دەنك نەدەما گشتیان دەخوارد. زۆر جاریش ڕەوە پاساری دەبوون بەشەریکی مریشکەکان و لەنێوان مریشکەکان خۆیان پەنا دەدا تا لە چاوی منداڵ و تواڵ بەدوور بن نەبادا بە دارلاستیك بەردێکیان تێ بسریوێنن و بەو مەغریبە ژیانیان لێ بسێننەوە. زێنەب زرنگ بوو، بە تەماشاکردنێکی خێرا دەیزانی ژمارەی مریشکەکانی تەواوە یان نا، گەر تەواو نەبا پەنای بۆ ئۆمەر دەبرد :

-ئۆمەر ....... ئۆمەر .

-هۆو، چیت دەوێ زێنەب، چی قەوماوە ؟

-مریشکە سوورە پۆپینە لەسەرەکە دیار نیە .

گەر چەقەڵ و ڕێوی نەیخواردبا حەتمەن لەماڵە هاوسێ یاخود لە لەوەڕی کۆڵان و سەر زبڵدان دواکەوتوەو لەبیری چۆتەوە کە مەغریبە، دواتر یان خۆی دەهاتەوە یان دەیاندۆزیەوە .

ئۆمەریش بەزەردەخەنەوە دەیگوت :

-خۆت خۆش بی مامر چیە؟

ئەوان بەمریشکیان دەگوت مامر .

چراکە کز کز دەسوتاو دووکەڵی پەرش و بڵاو دەکردەوە. پرخەی خەویان دەهات، هەموویان لە خەوێکی قووڵدا بوون، سێ منداڵە وردیلەکانیان لەسەرەوەی ژوورەکەو لەپاڵ یەکتر بە جاجمێکی گەورە داپۆشرابوون و ئۆمەرو زێنەبیش هەریەکە و لەبەرێکی ژوورەکە سەرو جاجمیان لەخۆیان ئاڵاندبوو، ڕووناکی ئەو بەرەبەیانە کەمێك لە دەلاقە بچووکەکە هاتبوە ژوورەوە، ئەم ڕووناکیە کەمە زێنەبی لەخەو بە ئاگا هێنایەوە، لە کونی دەلاقەکەوە ڕوانیە دەرەوە لای وابوو هێشتا گورگ و سەگ لێك ناکرێتەوە، ئەو هەموو بەیانیان لەو وادەیە بەخەبەر دەهات دەتگوت کاتژمێر دەنێتەوە وا بەئاسان لەو تاریك و ڕوونە بەخەبەر دەهات، ئەو بەیانیەش وەکو هەموو بەیانیانەکانی تر بەپرتاو لە ژێر جاجمەکە هەستا :

-ئۆمەر ..... ئۆمەر .

ئۆمەر بەو بانگ کردنە خەبەری نەبوەوە، چەند جارێکی تریش بانگی کرد بەڵام بێ هودە بوو ناچار دەستی ڕادا ' دوو جار شانی ڕاتەکاند و پێی گوت:

-وا دنیـا ڕوونـاك بـووه‌وه‌ هه‌سـته‌، تـا مـن چـای لـێ ده‌نێـم و که‌لوپه‌له‌كانـت بـۆ ئامـاده‌ ده‌كـه‌م تـۆش نوێژه‌كـه‌ت بكـه‌.

ئۆمـه‌ر لـه‌ ژێـر جێگاكـه‌ی ڕاپـه‌ڕی و بـه‌ره‌و قوله‌تێـن ڕۆیشـت تـا لـه‌وێ ده‌سـنوێژه‌كه‌ی هه‌ڵگرێـت و نوێـژی ئـه‌و به‌یانیـه‌ی بـكات. ده‌زانـن قوله‌تێـن چیـه‌ ؟ جـاران لـه‌ لادێكانـی كوردسـتان نـه‌ حه‌مـام هه‌بـوو نـه‌ ته‌والێـت، لـه‌ بـری ئه‌وانـه‌ پیـاوان له‌نزیـك كانیـه‌ ئاوێـك حه‌وزێكـی چوارگۆشـه‌ باخـود لاكێشـه‌یان دروسـت ده‌كـردو به‌جـۆگای سـه‌ر داپـۆشراو یـان بـه‌ بـۆڕی ئاسـن ئـاوی كانیه‌كه‌یـان ڕاده‌كێشـایه‌ نـاو حه‌وزه‌كـه‌و چوار وه‌رزه‌ی سـاڵ سـه‌رماو شـه‌خته‌ بوایـه‌ یـان گه‌رمـا لـه‌وێ به‌یانیـان زوو خۆیـان ده‌شووشـت و ده‌سـنوێژیان هه‌ڵده‌گـرت، قوله‌تێـن بـۆ خه‌ڵكـی ئـه‌وێ هـه‌م حه‌مـام بـوو هـه‌م ته‌والێـت، ژنانیـش شـوێنێكی تایبه‌تیـان هه‌بـوو پێیـان ده‌گـوت سـه‌راو بـۆ هه‌مـان مه‌به‌سـت و پێداویسـتی كـه‌ ئه‌ویـش له‌حه‌وزێـك پێكده‌هـات و لـه‌ سـه‌رچاوه‌یه‌كه‌وه‌ ئاویـان ڕاده‌كێشـایه‌ نـاوی.

تـا ئۆمـه‌ر لـه‌ قوله‌تێـن نوێـژی كـردو هاتـه‌وه‌ زێنـه‌ب لـه‌ ناندێنه‌كه‌ چایه‌كـه‌ی لـێ نابـوو و پێخـۆری نیوه‌ڕۆشـی بـۆ ئامـاده‌ كردبـوو و خسـتبویه‌ نـاو نانه‌به‌ره‌یه‌كـه‌وه‌، نانه‌به‌ره‌كه‌شـی خسـتبوه‌ نـاو توره‌كه‌یـه‌ك كـه‌ لـه‌ مـوی بـزن دروسـت كرابـوو. پێخـۆری چـی ؟ پێخـۆری ئـه‌و ڕۆژگاره‌ بـۆ سـه‌پان و جوتیـار و وه‌رزێـر و

شـوان و گاوان بریتـی بـوو لـە نوشـتێك نـان و سـەلكێك پیـاز و جامیلكەیەكـی ماسـت، هەندێـك جاریـش هێلكەیـەك و كەمێـك دەرمـان چایـەو دوو كڵـۆ شـەكری قەندیشـی لەگـەڵ بـوو، لـەو دەمـەو بەیانـەدا گەرچـی پەڵـەی نەدابـوو بـەڵام كەشـو هـەوا فێنـك بـوو و سـاردیەكەی مچوڕكـەی بەلەشـی مرۆڤـدا دەهێنـا كەچـی زێنـەب لەحەوشـە لەبـەردەم ناندێنەكـە نـان و چاكـەی دانـا بـوو، تـا زێنـەب حەسیرەكەی ڕاخسـت و قۆریـە ڕەش و دوو پیاڵەكـەی هێنـا تۆمەریـش هـەردوو كوێدرێژەكـەی تالیـك دا و نیـرو هەوجاڕەكـەی ئامـادە كـرد. حەسـیر ' ڕایەخـی ئـەو زەمانـەی خەڵـك بـوو كـە ژنانـی كـورد لـە (كرتـی ) دروسـتیان دەكـردو لەجیاتـی مافـورو دۆشـەك بەكاریـان دەهێنـا. ئـەو بەیانیـەش وەكـو باقـی بەیانیانەكانـی تـر پێكـەوە دوو بـەدوو بـەدەم قسـە كردنـەوە نانیـان خـوارد، قسـەی ئـەو سـەردمە چـی بـوو ؟ خـۆ باسـی سیاسـەت و حزبایەتـی تیـا نەبـوو، خـۆ باسـی فەیسـبووك و ئنسـتگرام و مۆبایلـی زیـرەك و ئۆتۆمبیلـی لگـزز و مۆنیـكا و قسـەی سـواوی هەندێـك كەسـایەتی سیاسـی و هەندیـك مـەلای سیاسـی نەبـوو، هەرگیـز قسـە و باسـیان لەسـەر بەنزینـی خـراپ و ڕۆن و برنـج و داو و دەرمانـی بەسـەرچوو و نەشـتەرگەری سـەقەت و نەخۆشـی زەخـت و شـەكرە نەبـوو، نەدەهاتنـە سـەر باسـی خەڵكـی تەڵەكەبـازو دزو درۆزن چونكـە لـەو سـەردەمە دزی و درۆ

هێنـدە کـەم بـوو هەسـتی پـێ نەدەکـرا، بگـرە عەیبێکـی گـەورەش بـوو، ئـەوان نەیاندەزانـی کارەبـا چیـەو خەمیـان لەپـارەی مولیـدە نەدەخـوارد تـا لـە قسـەو باسـی خۆیـان کاتـی پـێ بکـوژن بەڵکـو بـاس باسـی کێڵانـی زەوی و خەرتـە و ووشـکە وەردو گەنـم و جـۆو بێسـتان بـوو:

-ئەمساڵ چەند تەنەکە گەنم تۆو بکەین ؟

چەند تەنەکە جۆ بخەین بەزەویەوە ؟

-کام پارچە زەوی بکەین بە وەرد بۆ ساڵی داهاتوو ؟

-چەند خەت تەماتە و بامیە بچێنین ؟

-لەکام شوێن خەرمان قرشەکە کۆکەینەوەو بیکوتین ؟

-زبارە بۆ کێ بکەین ؟

-زەکات بدەین بەکێ و کێ نەبوونە ؟

-کەی باراش ببەین بۆ ئاش ؟

-ئەڕا زمستان چۆن دار کۆ بکەینەوە ؟

-چۆن شەکر و چای بکڕین؟

-ژن بەژن لەگەڵ کێ بکەین بۆ کوڕەکەمان؟

-فلان ژوور دڵۆپە دەکات چۆن بیپەستینەوە ؟

-فـلآن کـەس مـردوە خـوا لێـی خـۆش بێـت کۆشـێك منداڵـی بە جێهێشـت.

هێشـتا منداڵـەکان لەپرخـەی خـەودان و لای ئـەوان نیـوە شـەوە و ژوورەکـەش تاریکـە مەگـەر لـە دەلاقەکـەوە کەمێـك ڕووناکـی دزەی کردبێـت بـۆ ژوورەوە، چراکـەش لەبـەر بـێ نەوتـی هێـزی ڕوونـاك کردنـەوەی تیـا نەمـاوە و ڕووناکـی ئـەو بەیانـە کـە لـە دەلاقەکـەوە دزەی دەکـردە ژوورەوە توانیبـوی ڕووناکـی چراکـە بـێ بایـەخ بـکات، دوای نـان خـواردن ئۆمـەر سـەرێکی لـە ژوورەوە داو بـەدەم لەپشـت کردنـی پشـتێنە خـاڵ خاڵیەکەیـەوە منداڵەکانـی داپۆشـتەوە کـە جاجمەکەیـان لەسـەر لاچـوو بـوو :

-بنوون ڕۆڵەکانم.

دەبـوو ئۆمـەر بەتەنهـا بـڕوات بـۆ دەشـتودەر چونکـە زێنـەب بـاری گـران بـوو و هاتبـوە سـەر مانـگ و ڕۆژی خـۆی:

-خوایە منداڵێکی ساڵحمان پێ ببەخشی.

ئەمـە دووعـای زێنـەب خـۆی بـوو، کەچـی دووعـای ئۆمەریـش پاڕانـەوە بـوو لەخـودا تـا زێنـەب لـەم منـداڵ بوونـە بەسـەلامەتی نەجاتـی بێـت :

-خوایە چی لەدووی دەستم بێت دەیکەمە خێری مەولودی پێغەمبەر بەس زێنەب سەلامەت بێت و منداڵەکە شەوە دەرەقەتی نەیەت.

لـەو سـەردەمە ڕێـژەی مردنـی منـداڵان ئێجـگار زۆر بـوو چونکـە کوتـان بـەدەرزی دژە ڤایرۆسـەکان کـەم بـوو ، گـەر هەشـبوایە نەدەگەیشـتە دانیشـتوانی لادێ دوورە دەسـتەکان بۆیـەش زوو نەخـۆش دەکەوتـن و زۆربەیـان دەمـردن، نەخۆشـیە بەربڵاوەکانیش بریتـی بـوو لـە لەرزوتـا، سـوورکە، ڕشـانەوە، مێکوتـە، ئاوەڵـە ......... هتـد.

لای خەڵکـی ئـەو سـەردەمە هـۆکاری مردنـی منداڵانـی خـوار پێنـج مانـگ بـۆ (شـەوە ) دەگەڕێنرایـەوە، شـەوە لای خەڵـك بونەوەرێکـی نادیـار بـوو و دەسـتی لـە منـداڵ دەوەشـاند بەتایبەتـی ئـەو منداڵانـەی کـە تـا چـل شـەو پاسـەوانێتی نەدەکـرا، بەپێـی لێکدانەوەکانـی ئـەو سـەردەمە بونـەوەرە نادیارەکـە لەنیوەشـەو و لـە ناخافڵـدا خـۆی دەکـرد بـە ژووری ئـەو دایکـەی کـە تـازە منداڵـی دەبـوو، گـەر منداڵەکـە بەتەنهـا بوایـە ئـەوا دەسـتی لـێ دەوەشـاند بۆیـە پیـاوان لـەو چیرۆکـە ئەفسـانەییانەی باسـی شـەوەی دەکـرد کـە چـۆن دەسـت دەنێتـە بیناقاقـای منداڵـی تـازە لەدایـك بـوو سـوودیان وەردەگـرت و بەدرێژایـی چـل شـەو لەئێـوارەوە تـا بەیانـی ( ئیشـك ) یـان لای منداڵـە تـازە لەدایـك بوەکـە دەگـرت نەبـادا شـەوە بیباتـەوە، لـە ڕاستیشـدا هـۆکاری ڕاسـتەقینەی مردنـی منـداڵان بـەو ڕێـژە زۆرە نەکوتـان بـوو بـەدەرزی دژە ڤایـرۆس و کەمـی خزمەتگـوزاری و نـەك شـەوە بـەڵام

خەڵکی ئەو سەردەمە ئەم ڕاستیەیان لا بەرجەستە نەبوو بوو .

قەنتەرەی حەوشەکەی کردەوەو ڕێشمەی هەردوو گوێدرێژەکەی بەدەستی ڕاستیەوە گرت ' بەهێواشی لەدیوی حەوشە چوە دەرەوەو خۆی هەڵدایە سەر پشتی گوێدرێژێکیان و ئەوەی تریشی دایە دوای خۆی کە هەوجاڕو نیرو کۆپەرانەکەی لەسەر قایم کردبوو و بەڕێکەوت. جاران بەدەرگای حەوشە دەگوترا قەنتەرە کە لەداری ئەستوور لەشار دروست دەکراو لە دیوی ناوەوە کلۆم دەدرا ' کلیلەکەشی هەر لە دار دروست دەکرا بەچەند پشکێك و بە ئاسانی نەدەکرایەوە مەگەر خاوەن ماڵ خۆی بیزانیایە چۆن دەکرێتەوە؟

کۆڵانە پێچاوپێچ و باریکەکانی جێهێشت و لەئاوایی چوە دەرەوە، لە تەمتەمە شاخەکانی خوار ئاواییەوە شۆڕ بووەوە بۆ کەندی قەمبەر، کەندەکە بەو پایزە درەنگە هێشتا ئاوی پیا دەهاتە خوارەوەو لە هەندێك شوێنی تەختایی کەندەکە ئاوەکەیان لە شێوەی گۆم گلدابووەوەو هەڵیان بەستبوو بۆ چاندن و ئاودانی تەماتەو بامیەو کولەکەو پیازو هەندێك درەختی وك هەنجیرو قەیسی و دارتوو .

گەر لە بەرزایی گردی (پارەرەز)ەوە بڕوانیتە ئەم کەندە قووڵ و دوورو درێژە دیمەنێکی دڵرفێنت دەکەوێتە بەر چاو، جوانی

ئـەم دۆڵـە لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە سـەوزاییەکی تێـرو پـڕی بـە دۆڵەکـە بەخشـیوە بەتایبـەت ئەگـەر لـەم پایـزە پێـش پەڵەیـە لێـی بڕوانـی چونکـە جگـە لـەم دۆڵـە لـە هیـچ شـوێنێکی تـری ناوچەکـە سـەوزایی بـەدی ناکەیـت و تـا چـاو بـڕ دەکات هەمـوو لایـەك هـەر پـوش و پەڵاشـە، سـەرچاوەی ئـەم دۆڵـە قـووڵ و دوورو درێـژە کەوتۆتـە هەڵەتـی گوندەکانـی ئۆمەرگومبـەت و سێگردکان و نێرەگیـن و میرکـە، لـە زسـتان و بەهارانـدا ئـاوی بارانـی ئـەو هەڵـەت و پەڵەتانـە دەهێنێتـە ئـەم کەنـدەوە و سـەرەو خـوار دەبێتـەوە تـا دەگاتـە پـردی تـازەدێ و لـەوێ شـۆڕ دەبێتـەوە بـەرەو دەشـتی تـازەدێ و لەناوەڕاسـتی دەشـتەکە تێکـەڵ دەبێتـەوە بـە زێـی بچـووك ' ئیـدی ئـاوی کەنـدی قەمبـەر خـۆی لەگـەڵ زێـی بچـووك ئاوێتـە دەکات.

لـەوێ سورشـتی دۆڵەکـە وایـە لەسـەرەوە تـا خـوارەوە سـەدان پێچاوپێچـی تیایـە گـەر لەئاسـمانەوە یـان لەبەرزی گـردی (پارەڕەز) ەوە تەماشـای بکـەی لـە مارێکـی ڕەنـگاو ڕەنـگ دەچێـت، تەواوی دۆڵەکـە بەجۆرەهـا دارو درەخـت و گـژو گیـا ڕازاوەتـەوە هـەر لـە شـۆڕە بـی و دار تـووی دەسـت چێـن و پەڵـك و گـەز ' لـە هەندێـك شـوێنیش دار هەنجیـرو قەیسـیش بـەدی دەکەیـت، ئـەوە جگـە لـە پونگـەو لیلـك و فریـز و شـافڕی تـەڕو جەگـەن و ژاژو قـەڕەم و کرتـی کـە کەنارەکانـی ئـەو دۆڵـەی داپۆشـیوەو بـۆن و بەرامەیەکـی

خۆشـی بـە دۆڵەکـە بەخشیوە، لـە هـەر چـوار وەرزی سـاڵدا ئـەم دۆڵـە ئـاوی لـێ نابڕێـت بـەڵام لەهاویـن و پایـزدا هێنـدە کـەم دەبێتـەوە تـا ئـەو ڕادەیـەی لـە زۆر شـوێنی دۆڵەکـە ' ئاوەکـە بەناخـی زەویـدا شـۆڕ بێتـەوەو ووردە زیـخ و لم بیمژێـت تەنانـەت لـە هەندێـك شـوێن ئـاو نەمینێـت بـۆ زەردەواڵـەو سووسـکەو کەڵاوکـوڕەو تەیـرو تواڵـی تریـش تـا خۆیـان لـەوەرزی کـەم ئاویـدا تێـر ئـاو بکـەن، لـە هەندێـك جێگـەش ئاوەکـە جارێکـی تـر قوڵـپ دەداتــەوە و دەکەڕێتــەوە ســەر زەوی و بەنــاو بــەردو زیــخ و گـژو گیـای دۆڵەکـەدا ڕێ دەکات و لـە شـوێنە چاڵەکانـی دۆڵەکـە نیمچە گۆمێـك دروسـت دەکات کـە بـوە بـە لانـەی بێچـوە بـۆق و وردە ماسـی و کیسـەڵ و هەندێـك زینـدەوەری تـری ئـاوی، تەنانـەت شـوان و گاوانیـش سـوودی لـێ وەردەگـرن بـۆ ئاودانـی مـەڕو مـاڵات و هەندێـك جاریـش مەلـە کـردن.

هێشـتا دنیـا تـەواو ڕوونـاك نەبووبـوەوە ئۆمـەر هـەردوو گوێدرێژەکـەی گەیانـدە کەندەکـە و لـەوێ تێـر ئـاوی کـردن و بەهـەورازە سـەختەکەدا سـەرکەوت کـە ڕچـە ڕێـی بـزن و مـەڕو مـاڵات و ڕێبـوارو کاروانچیەکانـی بەسـتی شـەرغەو گوندەکانـی دامێنـی دێـدەوان بـوو، هێنـدەی نەبـرد گەیشـتە سـەر ئـەو پارچـە زەویـەی دەیویسـت بیکێڵێـت، هێشـتا لای ئاواییـەوە گەزەنگـی خۆر دەرنەکەتبـوو تەنهـا لـە پشـتی گـردو تەپۆلکەکانـەوە زەردە ڕووناکی

دەبەخشی ، ئەو هەردوو گوێدرێژەکەی دابەستا و دەستی کرد بە جووت کردن، وشکە وەردی دەکێڵایەوە تاکو پێش کەوتنی بارانی پەڵە تۆوی بکات.

تا کاتژمێر نۆی بەیانی جووتی کرد دواتر بۆ پشوویەکی کورت و ئاو خواردنێکی سەرپێیی ' گوێدرێژەکانی ڕاگرت و پشووی دایە ئەوانیش، هەرچەندە شەکەت و ماندوو بوو وەلێ دڵی بەکارەکەی خۆش بوو چونکە ' پێی وابوو زەخیرەی ساڵی داهاتوی ماڵ و منداڵ مسۆگەر دەکات، بۆ ئەو سەردەمە زەخیرە بریتی بوو لە ئاردو نۆك و نیسك و بڕووش و ساوارو ماش، پێشتر بۆ دەسکەوتنی ئارد دەستاڕیان بەکار دەهێناو گەنمیان پێ دەهاڕی و دەیانکرد بەئارد، چەند ماڵێك و دەستاڕێکیان هەبوو بەڵام بەم دواییە ئاشی ئاو دروست کرا خەڵك گەنم و جۆی دەبردە ئاشەکان و وازیان لەدەستاڕ هێنا.

ئایا دەزانن دەستاڕ چیە ؟ دەستاڕ لەبەردی ساغ و ڕەق دروست دەکرا بریتی بوو لەدوو بەردی شێوە بازنەیی بە قەبارەی چل بۆ پەنجا سانتیمەتر درێژو دە سانتیمەتر ئەستوور بەشێوەیەك بەردی یەکەم واتە بەردی سەرەوە لە ناوەڕاستیدا دوو کونی لێ دروست دەکرا ' کونی یەکەم دەکەوتە ناوەڕاستی بەردەکە بۆ ئەوەی گەنم یان جۆیەکەی پێدا شۆڕ بکەنەوە بۆ سەر بەردی دووەم و کونی دووەمیش لەلایەکی بەردەکە دروست دەکرا تا

دارێکـی تێبخـەن بەمەبەسـتی سوڕاندنی بـەردی یەکـەم بەسـەر بــەردی دووەمــدا بەمــەش گەنمەکــە دەکەوتــە نێــوان هــەردوو بــەردی دەســتاڕەکەو لەکاتــی ســوڕاندنیدا گەنمەکــەی ووردو خـاش دەکـردو بـە چەنـد جـار دووبـارە کردنـەوەی ئـەم کـردارە گەنمـە هاڕڕاوەکـە دەبـوو بـە ئـارد، لەبـەر ئـەوەی دەسـتاڕ کاری ئـەوە بوو گەنـم و جـۆ بهاڕێـت بۆیـە ئـەم ووشـەیە بەتێپەڕبونـی ڕۆژگارو سـەردەمەکان بـوو بـە چەمکێکـی سیاسـی و لەنـاو ئەدەبیاتـی سیاسـی کـوردو لێکۆڵینـەوەو وتارەکانیشـدا ڕەنگـی دایـەوە بـۆ نموونـە : دەسـتاڕی زەمانـە هەمووومانـی هـاڕی. یـان کـورد لەنێـوان دەسـتاڕی تـورك و عـەرەب و فارسـدا. یـان میرنشـینی بابـان لەنێـوان بەرداشـی ڕۆم و عەجـەم دا کـە ناونیشـانی کتێبێکـی نەوشـیروان مسـتەفایە، چەندیـن نموونـەی تـر هـەن لـەم بـارەوە .

گـەر هیـچ ئافـات و گرانـی و گرفتێـك نەبوایـە جـۆ تەنها بـۆ ئالیکی مەڕومــاڵات و مانــگاو گوێدرێــژ بــەکار دەهــات بــەڵام زۆربــەی سـاڵانی ئـەو سـەردەمە بەهـۆی نەبوونـی سیسـتەمی کشـتووکاڵی و ڕەچـاو نەکردنـی کاری کشـتووکاڵی بەشـێوەی زانسـتیانەو ئافاتـی کشــتووکاڵی و نەبوونــی کەرەســتەی پێویســت بــۆ پێشخســتنی بــواری کشــتووکاڵی و کەمــی بڕشــتی گەنــم و هەبوونــی ســن و کیسـەڵەو بـێ بارانـی و نەخۆشـی کـورك و هـەور بـردن و قـات کردنـی گەنـم و ............هتـد خەڵـك بەزەحمـەت نانـی گەنمـی

دەست دەکەوت و بەناچاری مزاشیان دەخوارد، دەزانن مزاش چیە ؟ واتە تێکەڵەی ئاردی گەنم و جۆ پێکەوە. زۆر خێزان مزاشیشی دەست نەدەکەوت بۆیە هەزاران خێزان تەنها نانی جۆیان دەخوارد. نانی جۆ گەرچی زۆر سوودبەخش بوە لەڕووی تەندروستیەوە بەڵام دوو عەیبی هەبوو، یەکەم : هیچ کابانێك نەیدەتوانی نانێکی جوانی لێ بکات، نانێك وەك نانی گەنم تەنك و پان بێتەوە. دووەم : سورشتی جۆ وایە کە پڕبێت لەتوێکڵی تیژ کە دەوری کرۆکی جۆیەکەی داوە، جاران بەهۆی سادەیی ئامێرەکان نەدەتوانرا ئاردەکەی خاڵی بکرێت لەو توێکڵە بۆیە لەکاتی خواردنی نانی جۆدا ئەو توێکڵە تیژە دەم و لێوی بریندار دەکرد.

لای کاتژمێر دوانزەو نیوی نیوەڕۆ جارێکی تر هەردوو گوێدرێژەکەی بەرداو تورەکەی ئالیکی خستە سەریان، خۆیشی هەندێك پووش و دەسکێك دارو چەند تەپاڵەیەکی کۆ کردەوەو لەنزیك تاوڵەکە سێ بەردی هێناو کوانویەکی بچووکی پێ دروست کردو کتریە ڕەشەکەی خستە سەر، هێدی هێدی چوە ژێر تاوڵەکە کە سێبەرێکی شاشو واشی دروست کردبوو ' تورەکە نانەکەی کردەوەو نانەبەرەکەی دەرهێنا و پێخۆرەکانی ئەو نیوەڕۆیەی ئامادە کردو دەستی کرد بە نان خواردن، چایەکەش هێواش هێواش دەکوڵا، دە زانن تاوڵ چیە ؟ ژنانی

کورد بەتایبەتی ئەوانەی شارەزاییان لە ڕستن و چنین هەبوو لە مووی بزن پارچەیەکیان دەچنی کە قەبارەکەی لە مەترێك کەمتر نەبوو و لە چوار مەتریش زیاتر نەدەبوو لە شێوەی ڕەشماڵ بەڵام بچووکترو خێراتر لە بەکارهێنان، هەرچوار سووچی پارچە دروست کراوەکەش بەپەتێکی دوو مەتر درێژ لە شێوەی گوریس بەڵام باریکترو لەموو دروست کراو قایم دەکرا تا لەکاتی هەڵدانیدا هەریەك لەو پەتانە لەسنگێك ببەسترێت بۆ ئەوەی تاوڵەکە لەشێوەی ڕەشماڵ جێی چەند کەسێکی تیا ببێتەوە بۆ پشوودان، تاوڵ سەپان و وەرزێرو تێلەکێش بەکاریان دەهێنا بۆ دروست کردنی سێبەرو خۆپاراستن لە تیشکی گەرمی خۆری چلەی هاوین و حەسانەوەی کورت خایەن، مەبەستم لە کورتخایەن ئەوەیە چێشتەنگاو سەپان و تێلەکێش کە دەستیان لەدروونەو خڕکردنەوەی مەلۆ هەڵدەگرت و سووکە نانێکیان دەخوارد تا تین و ووزەیان بێتەوە بەر بۆ ئەوەی تاکو نیوەڕۆ بێ پسانەوە بتوانن کار بکەن، جا ئەو نان خواردنە سووك و خێراو کورتخایەنە لەبەر سێبەری تاوڵ ئەنجام دەدراو پێی دەگوترا چێشتە نان.

ئەو بیری هەر لای زێنەب بوو ئاخۆ دەبێت وەزعی چۆن بێت ؟

تا عەسرێکی درەنگ جووتی کرد، دەمەو ئێوارەش بەر لە

خۆر ئـاوا بـوون كەرەسـتەكانی كـۆ كـردەوەو بـە هەمـان شـێوەی ڕۆژەكانـی پێشـوو بـەرەو ئاوایـی ملـی نـا، گردەكانـی بـەری خۆرئـاوای كەنـدی قەمبـەر سـێبەریان لـە تـەواوی دۆڵەكـە كردبـوو تەنانـەت ئـەو هـەورازە ڕك و شـاخاوی و پێچاوپێـچ و باریكـەش هـەر سـێبەر بـوو كـە لەكەندەكـەوە سـەر دەكـەوت بـۆ نـاو ئاوایـی، هێشـتا نەگەیشـتبوە سـەرەوەی هەورازەكە كوڕیشـكەیەكی خزمی لـێ پەیـدا بـوو، لـە دوورەوە دیـار بـوو كوڕیشـكەكە هەواڵێكـی پێیـە دەتگـوت لـە چاوەڕوانـی هاتنـەوەی ئۆمـەردا وەسـتاوە، كوڕیشـكەكە چـاوی بڕیبـوە ئۆمـەرو هەنگاوەكانـی دەژمـارد و نائـارام دیاربـوو، ئۆمەریـش بسـت بـە بسـت لـە منداڵەكـە نزیـك دەكەوتـەوەو لێـی دە ڕوانـی، زانـی چاوەڕوانـی ئـەو دەكات و هەسـتی كـرد دەیەوێـت هەواڵێكـی پـێ بگەیەنێـت، ئەوەتـا وا بـە پچـڕ پچـڕی هەواڵێكـی پـێ ڕاگەیانـد:

-مام ئۆمەر .......... مام ئۆمەر .

مام ئۆمەر دڵی خێرا خێرا لێی دەدا، ترس دایگرت :

-خێر بێت خوایە، هەواڵەكەی ناخۆش نەبێت .

ئـەو چاوەڕوانـی هەواڵێكـی تـر نەبـوو جگـە لـە هەواڵـی زێنەبـی هاوسـەری چونكـە دەیزانـی زێنـەب لـە بارودۆخێكـی خراپدایـە:

-خوایە لێت دەپاڕێمەوە .

کوڕیشـکە خزمەکـە هێنـدە تامـەزرۆ بـوو ئـەم هەواڵـە بگەیەنێـت شـپرزەیی پێـوە دیـار بـوو:

-میم زێنەب............

-ئێ  زێنەب چی؟

-میم زێنەب منداڵی............

-منداڵی چی کوڕە ؟  زێنەب  چۆنە، خۆ ماوە؟

-نەنکم  ڕزگاری کرد دەنا دەمرد.

مـام ئۆمـەر هەناسـەیەکی قووڵـی هەڵمـژی لەبـەر خۆیـەوە قسـەی دەکـرد:

-ئۆخەی، خودایە سوپاست دەکەم  کە زێنەبت پاراستوە لەمردن .

هێشـتا نازانێـت  منداڵەکـە مـاوە  یـان نـا تەنهـا سـەلامەتی  زێنـەب نەبێـت.

ئێسـتا پایـزی سـاڵی (١٩٥٣ )ە،  شـوێن گونـدی  قەمبـەرە،  مـەلا بانگـی  مەغریبـی  داوەو پیـاوان  لـە نوێـژی  جەماعەتـن و  ژنـان و منداڵانیـش  چاوەڕوانـی هاتنـەوەی  پیـاوەکان  دەکـەن  تـا پێکـەوە نانـی  ئـەو  ئێوارەیەیـان  بخـۆن.  سـەرمای  پایـز  کوانوەکانـی پـڕ کردبـوو  لـە دار،  بەپشـکۆ  سـوور  دەچنـەوە و هـەر خێزانـەو مەنجەڵـە  چێشـتکەی  ئـەو  ڕۆژەو کتریـە ڕەشـەکەیان  خسـتبوە

لێواری پشکۆ گەشەکانەوە، چێشتی ئەوساش ساوار بوو یان نیسک یان بڕووش یان شلەی تەماتەو بامیەی ئەو پایزە، شلەی تەماتەی ئەو وەرزە کاڵ و کوڕ بوو چونکە فێنکی ئەو وەرزە نەیدەهێشت ئەو تەماتەیەی مابوو لەژێر بڕك سوور بێت و بگەیێت و هەر بەکاڵی دەیانهێنایەوە، هەندێکیش لە خەڵکی ئاوایی تەماتەی کاڵ و نەگەییویان لەبڕکی سەرما بردوو دەکردەوەو دەیانهینایەوە ماڵەوە لەناو کادین و لە ژێر (کا) هەڵیان دەگرت تا بە هۆی گەرمی (کا)کەوە سوور بێت.

چراکانیش نەوتیان تێ کرابوون و بە جوانی دەسوتان، وێڕای ئەوەی دووکەڵی پەرش دەکرد ڕووناکیشی دەدایە هەموو لایەکی ژوورەکان، ئۆمەر شمشیری قەنتەرەکەی کردەوەو گوێدرێژەکانی بردە ناو تەوێڵەکەو ئالیکی دان، بەر لەوەی بچێت بۆ قولەتێن ڕەحیمی کچی کە تەمەنی دە دوانزە ساڵان بوو بەغاردان هات و پێی ڕاگەیاند:

-بابە ........ بابە، کوڕێکمان بووە .

ئەو چەند هۆش و بیری لای مەلۆتکەکە بوو سەد هێندەش بیرو هۆشی لای زێنەب بوو ئاخۆ تەندروستی باشە یان نا؟ ژنگەلی خزم کە ئەو ڕۆژە بۆ خزمەت کردنی زێنەب لەوێ بوون لەناو حەوشەوە هەواڵی سەلامەتی زێنەب و لەدایك بوونی

کوڕێکیـان پـێ ڕاگەیانـد، ڕووی کـردە ئاسـمان و سوپاسـگوزاری خـۆی بەخـودا گەیانـد، بـێ ئـەوەی سـەر بـەژوورەوە دا بـکات بـە ئاسـوودەیی بـەرەو قولەتێـن هەنـگاوی نـا.

ئەوەی ئەو ڕۆژە لەدایك بوو ئەحمەد قەمبەری بوو .

# گوندێك لەناو تەپۆلكەدا

بەگوێرەی گێڕانەوە زارەکیەکانی ناوچەکە بێت گوندی قەمبەر کۆنترین گوندی ناوچەکەیەو مێژووی بونیاتنانی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی پێنجسەد ساڵ پێش ئێستا. کتێبی جوگرافیای هەولێر نوسینی هێمن عەلی ساتە وەختی بونیاتنانی گوندی قەمبەر دەباتەوە بۆ سەردەمی مەدحەت پاشای والی بەغدا[1] دەڵێت :
لەسەروبەندی دەستبەکاربوونی مەدحەت پاشا چەند خێزانێکی بەگزادە بۆ دۆزینەوەی پوش و پاوان ڕوو دەکەنە بەستی شەرغەو سنوری ئێستای ناحیەی سێگردکان و بۆ دواجار لەو شوێنەی ئێستا کە قەمبەری لێ بونیات نراوە نیشتەجێ دەبن، لەوساوە تا ئێستاش خەڵکەکەی لەوێ گیرساونەتەوەو نیشتەجێن[1]. پیاوە بەتەمەن و شارەزاکانی گوندی قەمبەریش دەڵێن لە باپیرانمانەوە بیستومانە پێنجسەد ساڵ زیاترە گوندی قەمبەر هەیە.

گوندی قەمبەر هاوسنورە لەگەڵ گوندەکانی سێگردکان، سێکانی، تازەدێ، ئاومال، بەردەسپی، نێرەگین. لە ئێستادا کەوتۆتە

---

١- هێمن عەلی: جوگرافیای هەولێر، ل٦٣

سنوری ناحیەی سێگردکان و تەنها پانزە کیلۆمەتر لێوەی دوورە، بەر لەوەی گوندی سێگردکان بە فەرمانێکی کارگێڕی پلەی ناحیەی پێ بدرێت گوندی قەمبەر سەر بەناحیەی تەق تەق بووەو بە ۲۸ کیلۆمەتر دەکەوێتە خۆرئاوایەوە. گوندی سێگردکان بە فەرمانی ژمارە ۲۲۵ لە ۲۸-٤-۲۰۰٥ کرا بە ناحیە، یەکەم بەڕێوەبەری ناحیە کە لە ئەیلوولی هەمان ساڵدا فەرمانی بۆ دەرچوو عومەر ئەحمەد محەمەد بوو.

ڕووبەری تەواوی گوندەکە بریتیە لە ۷۰۲٤ دۆنم[1]، زۆربەی هەرە زۆری خاکەکەی پشت ئاوەو ناشێت بۆ کشتووکاڵ کردن تەنها پێنج یەکی نەبێت، ئەوەی تر هەڵەت و پەڵەتەو تەنها وەك لەوەڕگایەك سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ بەخێو کردنی مەڕو ماڵات، بەپێی دواین ئاماری ئەنجومەنی گوندەکە ژمارەی تەواوی دانیشتوای گوندی قەمبەر بەوانەش کە لەدەرەوەی گوندەکە نیشتەجێن بریتیە لە ۱۲۳ خێزان، لە ئێستاشدا گوندەکە ۱۷ خێزانی تیا دەژی زۆربەیان بەکاری کشتوکاڵ و ئاودێری و بەخێو کردنی مەڕو ماڵات و چاندن و بەرهەم هێنانی دانەوێڵەوە سەرقاڵن.

سەبارەت بەمانای ووشەی قەمبەر بۆچوونی جیا جیامان بەدی کرد، نوسەر هێمن عەلی پێی وایە قەمبەر لەووشەی

---

١- هۆبەی کشتووکاڵی تەق تەق.

کامبـەرەوە هاتـوە کـە ووشـەیەکی کۆنـی تورکیـە و مانـای (گـەورە ) دەبەخشـێت بـەڵام ئێسـتا لـە زمانـی تورکـی بـەکار نایـەت. لەکتێبی سـێگردکان و سـێبەر نشـینەکانی نوسـینی ئـاراس ئیلنجاغیـدا هاتـوە نـاوی قەمبـەر وشـەیەکی تورکیـە و بەمانـای (بڵنـد) دێـت[1]، واتـە شـوێنێکی بـەرز ' ڕەنگـە واش بێـت چونکـە شـوێنی گوندەکـە بەرزتـرە لەهەمـوو گوندەکانـی تـر، هەروەهـا لەهەمـان سـەرچاوە لەسـەر زاری دانیشـتوانەکەی پێیـان وایـە نـاوی قەمبـەر لـە (کـەم بـەر)ەوە هاتـوە واتـە گوندێکـی کـەم بەرهـەم لـەڕووی کشـتوکاڵ و دانەوێڵـەوە بـەو هۆیـەی زۆربـەی خاکەکـەی پشـت ئـاوەو ناشـێن بـۆ کشـتووکاڵ کـردن .

لەبـەر ئـەوەی گونـدی قەمبـەر گوندێکـی دوورە دەسـت بـوەو ڕێـگاو بانـی وەك پێویسـت نەبـوە، هەروەهـا دەوڵەتـی عێراقیـش بەپێـی پێویسـت ئـاوڕی لـێ نەداوەتـەوە بۆیـە تـا سـاڵی ١٩٧٨ گوندەکـە بێبـەش بـوە لـە قوتابخانـە و ناوەنـدی خوێنـدن و پـەروەردە و فێـر کـردن مەگـەر مـەلای گونـد بەوەنـدە شـارەزاییەی هەیبـوە هەندێـك منداڵـی فێـرە خوێنـدەواری کردبێـت لـە حوجـرەی مزگـەوت، بـۆ یەکـەم جـار لـە سـاڵی ١٩٧٨ قوتابخانـەی لـێ کراوەتـەوەو یەکـەم بەڕێوەبەریـش مامۆسـتا نیهایـەت بـوە کـە لەشـاری کەرکووکـەوە هاتبـوو[2].

١- ئاراس ئیلنجاغی: سێگردکان و سێبەرنشینەکانی، ل١٦٣ .

٢- ئاراس ئیلنجاغی : سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧ .

لەساڵی ١٩٤٥ وە لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە مزگەوتێك لە ناوەندی ئاوایی بەقوڕو دار دروست کرا، یەکەم مەلا کەپێشنوێژی تیا کردبێت و وتاری دابێت مەلا ئەحمەد بوە کە بەمەلا شێتە بەناوبانگ بوە، ئەوەی جێگەی باسە مەلا شێتە پیاوێکی دنیادیدەو خاوەن ئەزموون بوە و خەڵکی گوند خۆشیان ویستوە. مزگەوت لەو ڕۆژگارەدا شوێنی خواپەرستی و مەجلیسی ڕۆژانەی خەڵکی ئاوایی و تەگبیرو ڕای خەڵك بوو، لە ئێستاشدا گوندەکە هەم قوتابخانەی هەیە هەم مزگەوت، جگە لەم دوو شوێنە هیچ دامەزراوەیەکی تری گشتی لێنیە.

بژێوی دانیشتوانی ئێستای گوندی قەمبەر بەندە بە بەخێو کردنی مەڕ و ماڵات و چاندن و بەرهەم هێنانی برێك دانەوێڵە و کاری کشتوکاڵی بەتایبەتی کشتوکاڵی هاوینە، بۆ کشتووکاڵ کردنیش خاکی بەراویان کەمە ئەوەی هەشە پشت بە ئاوی باران و کانی و کارێزو ئاوی کەندی قەمبەر دەبەستێت، ئەوەی تر ڕوو دەکەنە بەستی شەرغەو دەشتە بەراوەکانی گوندەکانی سارتك و ئاومال و تازەدێ و سێکانی . لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیەوە زۆربەی دانیشتوانی گوندی قەمبەر بەسەر سێ تیرەی جیاواز دا دابەش بوون کە بریتین لەتیرەی بەگزادە و لەك و شێخبزێنی، لەگەڵ تیرەی دەربەندیەکانیشدا بە ژن و ژنخوازی تێکەڵن و هاموشۆ و پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی پتەویان

هەیـە بەتایبەتـی لەگـەڵ دەربەندیەکانـی ناحیـەی سـێگرتکان و گوندەکانی ئۆمەرگومبـەت و کانـی لەلـە، سـەرجەمی دانیشـتوانی گوندەکـە لەنەتـەوەی کـوردن و لـەڕووی ئاینیشـەوە موسـڵمانن و سـوونە مەزهەبـن .

شێوەی ئاخافـتن و زاری قسـەکردنیان دەچێتـەوە سەرشێوەی قسـە کردنـی هەولێـری و کەوتۆتـە ڕیزبەنـدی شـێوەزاری کرماجـی خـواروو، کەمیـان نەبێـت کـە لەژێـر کاریگـەری شـێوەزاری دەربەندیەکانـن و بـەو شـێوەزارە قسـە دەکـەن، واش پـێ دەچێـت ئەوانـەی کـە بەشـێوەزاری نیمچـە لـووڕی ( ئاخافتنـی دەربەندیـەکان) قسـە دەکـەن بەهـۆی ژن و ژنخـوازی و ئـەو تێکەڵ بوونـە کۆمەڵایەتیـە بێـت کـە هـەردوو لای پێکـەوە بەسـتۆتەوە، پەیوەندیـە کۆمەڵایەتیەکـەش لەسـەر کاری کشـتوکاڵی و هـەرەوەزی و هاوسـێیەتیەوە بونیـات نـراوەو نـەوە دوای نـەوە بـۆ یەکتریـان جـێ هێشـتوە. هەرچەنـدە حاجـی عومـەر حەمـە ڕەشـید کـە خەڵکـی گوندەکەیـە پێـی وایـە لـە ڕووی خوێنـەوە نزیکایەتیەکیـان هەیـە لەگـەڵ دەربەندیەکانـدا بـەو پێیـەی هەمـوو دانیشـتوانی گونـد لـە کۆنـدا بەشـێوەزاری دەربەندیـەکان ئاخافتنیـان کـردوەو زمانـی ڕەسـمی خەڵکـی گوندەکـە بـوە بـەڵام بەتێپەڕبونـی کات شـێوەی قسـە کردنیـان گـۆڕاوەو ئێسـتا کەمیـان نەبێـت بـەو شـێوەزارە قسـە ناکـەن.

دانیشــتوانی گونــدی قەمبــەر خانەخوێیەکــی بــاش بــوون بــۆ هێــزی پێشــمەرگە لــە هــەردوو شۆڕشــی ئەیلــوول و نوێــدا، زۆربــەی ڕۆژانــی ســاڵ گوندەکــە پــڕ بــوە لەپێشــمەرگەو تیــا یــدا حەسـاونەتەوە و نانیـان خـواردوە ٬ هـەر خێزانێـك لەکاتـی ئامـادە کردنـی ژەمەکانـی نـان خـواردن بـۆ مـاڵ و منـداڵ چێشـتی چەنـد کەسـێکی زیادەشـیان لـێ دەنـا چونکـە دەیانزانـی هـاکا چـوار پێشـمەرگە بلێـن : سـەلامون عەلەیکـوم. وا تێدەگەیـن کـە دڵسـۆزی دانیشــتوانی گوندەکــە بــۆ شــۆڕش و هێــزی پێشــمەرگەو بــارە جوگرافــی و تۆبۆگرافیاکــەی کــە شــوێنێکی دوورە دەســت بــوەو حکومەتـی عێـراق نەیتوانیوە بەئاسـانی هەڵبکوتێتە سـەری، هاندەر بـوون تـا هێـزی پێشـمەرگە بـە بەردەوامـی لـەم گونـدە هەبـن و مـاڵ بـە ماڵـی ئـەم گونـدە وەك بـارەگای سـەرەکی خۆیـان کەڵکی لـێ وەرگـرن، جگـە لـەوەش خۆشەویسـتی تایبەتیـان بـۆ ئەحمـەد قەمبـەری پێشـمەرگەی سـەرەتای شـۆڕش هەبـوو کـە بەهۆیـەوە هەمــوو پێشــمەرگەی کوردســتانیان خــۆش دەویســت، وە نەبێــت تەنهـا بـۆ هێـزی پێشـمەرگە خانەخوێیەکـی دڵسـۆزو بـاش بووبـن بەڵکـو بـۆ ڕێبـوارو کاروانچـی و چەرچـی و هەرکەسـێکی تـر ڕێـی بـەوێ کەوتبێـت خانەخوێیەکـی مهرەبـان بـوون و لای پشـتەوەی ژوورو نوێنــی خاوێــن و گەرمیــان بــۆ تەرخــان دەکــرد، گونــدی قەمبـەر کەوتبـوە سـەر شـاڕێی کاروانچیەکانـی ئـەو سـەردەمە کـە

لەبەستی شەرغەو بناری دێدەوانەوە دەهاتنە تەق تەق و دەشتی کۆیە ، بۆیە قەمبەر وەك مەنزڵی کاروانچیەکان وابوو بۆ پشوودان و نان خواردن و شەو مانەوە .

# بنەماڵەیەك لەلاپەڕەكانی مێژوودا

سەبارەت بە دەركەوتن و چۆنیەتی نیشتەجێبونیان لە گوندی قەمبەرو درەختی بنەماڵەكەیان محەمەدی كوڕی مام ئۆمەر گوتی: ئەوەی بیستومە لە باو و باپیرانمانەوە ئەوەیە بنەماڵەكەمان لە ڕۆژهەلاتی كوردستانەوە هاتوونەتە ناوچەی مەرگەو پشدەر كە ئەوسا بابانەكان فەرمانڕەوایی ناوچەكەیان دەكرد، پاش ماوەیەك هاتوونەتە دەمزێی بچووك لە خوارووی قەزای دووكان ' بۆ ماوەیەك لەوێ مانەتەوە، دواى ئەوە هاتونەتە گوندی قەمبەرو بۆ یەكجاری لەوێ نیشتەجێ دەبن[1].

حاجی عومەر لە بارەی درەخت و دەركەوتنی بنەماڵەكەیان لەم ناوچەیە گوتی : دەمەوێت لە شەهید ئەحمەدەوە بنەچەو درەختی بنەماڵەكەمان باس بكەم، شەهید ئەحمەد كوڕی مام ئۆمەری كوڕی مام ئەحمەدی كوڕی مام ئەیوب كوڕی عەساف كوڕی میرسێودین بەگە، باپیرانمان لەسەردەمی

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد ئۆمەر ئەحمەد لە ڕێككەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

ناوی تەواوی محەمەد ئۆمەر ئەحمەدە، برای شەهید ئەحمەد قەمبەریە و لەساڵی ١٩٥٠ لەدایك بوە، ئێستا دانیشتوی قەزای بنەسڵاوەیە، خاوەنی پێنج كوڕو چوار كچە (بەناوەكانی مەسعوود ' هێمن ' هیمداد ' بیلال ' دانا ' سەكینە ' سەمیرە ' سێوە).

فەرمانڕەوایی سولێمان پاشای بابان لە ناوچەی کرماشانەوە هاتونەتە کوردستانی عێراق ' سەرەتا لە ناوچەی پشدەر نیشتەجێ دەبن، دوای ماوەیەك ڕوو دەکەنە گوندەکانی دەشتی کۆیە لەنزیك زێی بچووك، بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەگوندەکانی دەمزێی سەرووی ناحیەی تەق تەق دەمێننەوە و دواتر دێنە سنوری ئێستای ناحیەی سێگردکان ' یەکەم جار بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە گوندی سێکانی دەمێننەوە، دواتر لە شوێنی ئێستای گوندی قەمبەر بۆ یەکجاری نیشتەجێ دەبن .

بەپێی گێڕانەوەی چیرۆکێکی حاجی عومەر بێت ئەوا بنەماڵەی شەهید ئەحمەد قەمبەری لەسەردەمی باپیرە گەورەیان میرسێودین بەگەوە لە گوندی قەمبەر نیشتەجێ بوون، چیرۆکەکەی حاجی عومەر بەم شێوەیەیە:

میرسێودین بەگ بۆ هەندێك کاروباری خۆی دەیەوێت سەفەرێکی شاری کۆیە بکات، لەو سەردەمەدا شاری کۆیە گەرچی لە ڕووی دانیشتوانەوە بچووك بوە بەڵام شارێکی زیندوو و شوێنی جوڵانەوە ڕۆشنبیری و ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ حاجی عومەر لە ڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

ناوبراو ئامۆزای شەهید ئەحمەد قەمبەریە ' ناوی تەواوی عومەر حەمەرەشید ئەحمەدە، لەساڵی ١٩٥٣ لە گوندی قەمبەر لەدایك بوەو تەمەنی منداڵی و گەنجێتی و گەورەیی خۆی هەر لەگوندی قەمبەر بەسەر بردوە، ئێستا لە قەزای بنەسڵاوە نیشتەجێیە.

ئـەو سـەردەمەو ناوەندێکـی گرنگـی ئاڵـو وێـرو بازرگانـی بـوە ‘ خەڵکـی قەمبەریـش پەیوەندیەکـی توندوتۆڵیـان لەگـەڵ خەڵکـی کۆیـە هەبـوە، میرسـێودین بـە ماینێـك بەڕێدەکەوێـت و لەنیـوەی ڕێـگا دیاریدەیەکـی سـەیرو نامـۆ بـەدی دەکات ئەویـش ئەوەیـە سـێ جـار کەڵاوکوڕەیـەك لەسـەر ملـۆزی ماینەکـەی دەنیشـێتەوە، جـاری یەکـەم و دووەم لای ئاسـایی دەبێـت و لـە ڕۆیشـتن بـەردەوام دەبێـت بـەڵام جـاری سـێیەم مانایـەك لـەو ڕووداوە دەردەهێنێـت و پێـی وا دەبێـت کەڵاوکوڕەکـە نێـردەی ئاسـمانەو دەیەوێـت میرسـێودین بـەگ بگێڕێتـەوەو ئـەو سـەفەرە نـەکات، میرسـێودین سـەفەرەکەی بەتـاڵ دەکات و دەگەڕێتـەوە، چەنـد ڕۆژێـك دوای ئـەوە هەواڵیـان بـۆ دێـت لـە شـاری کۆیـە شـەڕێکی گـەورە قەومـاوەو چەندیـن کەسـی تیـا چـوە بەمـەش میرسـێودین پێشـبینیەکەی خـۆی سـەبارەت بـە نیشـتنەوەی کەڵاوکوڕەکـە لا زیاتـر دەچەسـپێت.

چیرۆکەکـەی حاجـی عومـەر ئەگـەر شـێوەیەکیش بێـت لەئەفسـانە بـەڵام ئـەو ڕاسـتیە دووپـات دەکاتـەوە کـە ئـەم بنەماڵەیـە لەسـەردەمی میرسـێودینی باپیـرە گەورەیانـەوە لەگونـدی قەمبـەر نیشـتەجێن.

عەبـدولا قەمبـەری سـەبارەت بـە مێـژووی هاتنـی بنەماڵەکەیـان بـۆ گونـدی قەمبـەر گوتـی : بەپێـی دابەشـکاری تیـرەو تایەفـەکان

و بەگوێرەی گێڕانەوە زارەکیەکان بێت ' بنەماڵەکەمان لەتیرەی بەگزادەیە، بەڵگە مێژووییەکانیش دەیسەلمێنن کە بەگزادەکان لە سەردەمی زوودا لە خۆرهەڵاتی کوردستانەوە ڕەویان کردوە بۆ دیوی بیتوێن ' دوای ماوەیەك ناوچەی بیتوێن بەجێدەهێڵن و ڕوو دەکەنە دەمزێی بچووك، بەپێی هەلومەرجی ژیان لەو سەردەمە نەیانتوانیوە بۆ ماوەیەکی درێژ لە شوێنێك بمێننەوە بەڵکو زۆربەی کات کۆچەری بوون، لە دەوروبەری ساڵانی ١٧١٠ ز بۆ ١٧٢٠ ز لەگوندی سێگردکان ماونەتەوەو پێ دەچێت بەرلەوەی دەربەندیەکان گوندی سێگردکان بنیات بنێت میرسێودینی باپیرە گەورەمان بۆ ماوەیەك لەوێ ژیابێت، بەڵگەش ئەوەیە تا ئێستاش گردێك کە کەوتۆتە ناو سێگردکان پێی دەڵێن گردی میرسێودین ' هەروەها گۆڕستانی بەگزادەکان کەوتۆتە ناو سنوری سێگردکان' تەنانەت میرسێودینیش دوای مردنی هەر لەوێ نێژراوەو گۆڕەکەی دیارە کە کەوتۆتە نزیك گۆڕستانی ئێستای سێگردکان بەڵام دواتر بەهۆی ناکۆکی نێوانیانەوە' بەگزادەکان سێگردکان بەجێدەهێڵن و ڕوو دەکەنە سێکانی و شوێنی ئێستای قەمبەر[1].

١- گفتوگۆ لەگەڵ عەبدوڵا قەمبەری لەڕێککەوتی ٩-٢-٢٠٢١
ناوی تەواوی عەبدوڵا ئۆمەر ئەحمەدە، لە ساڵی ١٩٧١ لەگوندی قەمبەر لە دایك بوە، برا بچووکی شەهید ئەحمەد قەمبەریە، ئێستا لە شاری بۆڵتۆن لە وڵاتی بەریتانیا نیشتەجێیە، خێزاندارە' سێ جگەرگۆشەی هەیە بەناوەکانی تۆڵە ' تویژەر ' توانا، لە دوای ڕاپەڕینەوە بوە بە پێشمەرگە تا کاتی سەفەرکردنی بۆ دەرەوەی وڵات لە ساڵی ٢٠٠٧

# منداڵێك لەوپەڕی پاكیدا

هەموو منداڵێك بونەوەرێكی خودایی جوانە، منداڵ بەپاكی لە دایك دەبێت و دێتە بوونەوە، تا فام كردنەوەشی هەر پاك و بێگەردە و هیچ جۆرە خەوشێك هەڵناگرێت و بەرپرسیار نابێت لەهیچ ڕووداوێك تەنانەت لەهەڵكرتنی خاسیەتە تایبەتیەكانی خۆیشی .

هەموو منداڵێكی دەشتەكی تا ئەو كاتە پێی دەگوترێت منداڵ كە دەستی دار دەگرێت، كاتێك كە دەستی داری گرت ئیدی یان كاروانە یان بەرخەوان، یان دوا شوانە یاخود ئاودێرە یان بەردەستە لە كاروباری تۆودان و خەرمان دروست كردن و گێرە و شەن كردن و داو لێدان و بیر هەڵكەندن و جۆگە كێشان و مەڕ برینەوە و دیوار كردن و دارەڕاو قوڕە پەست و سەرسواخ و داركێشان و ئاو كێشان و گۆل هەڵدانەوەو داچاندن و پێمەڕە و كێشانەوەی قەمیش و تەیمان كردن و ( كا ) كێشان و زۆر كاری تر كە لادێ نشین بۆ درێژەدانی ژیانیان بەئەنجامی دەگەیەنن، لەوە بەدواوە كە تەمەنی لە چواردە ساڵ تێپەڕی قۆناغی منداڵێتی (بەردەست) تێدەپەڕێنێت و لەبەر دەم قۆناغێكی نوێدا

خـۆی دەبینێتـەوە کەپـڕە لـە بەرپرسـیارێتی گرنـگ و گـران لـە کاروبـاری ژیـان و گوزەرانیـان. ئیـدی شـوانە یـان گاوان، سـەپان و جوتیـارە یـان وەرزێـر، بـە کورتیەکـەی هەنـگاو دەنێـت بـۆ پێکەوە نانـی خێـزان و بوونـی بەسـەرۆکی خێـزان، پێـم بـاش بـوو شـێوەی کارو کاسـبی و ڕێگاکانـی بەدەسـتهێنانی بژێـوی ژیانـی خەڵکـی ئـەو سـەردەمە بـاس بکـەم تـا نـەوەی ئێسـتا بزانـن باپیرانیـان چـۆن ژیـاون و ئـەو ئامێـرو ئامـرازە سـادانە بناسـنەوە کـە ژیانـی خەڵکـی لادێنشـینی لەسـەر بەنـد بـوە:

کێڵانـی زەوی : بـۆ ئـەوەی خەڵـك گەنـم و جـۆو نیسـك و نـۆك و دانەوێڵـەی هەمەچەشـنی دەسـت بکەوێـت دەبـوو زەوی بکێڵێـت، لـەو سـەردەمە تراکتـۆر نەبـوە بەڵکـو ئامرازێکیـان لەداری پتـەو ( زیاتـر لـەدار گوێـز) دروسـت دەکـرد کـە نـاوی نرابـوو هەوجـاڕ، ئـەم ئامـرازە گاسـنێکی لـە ئاسـن دروسـت کـراوی تیـژی تێدەخـرا کـە بەهـۆی ڕاکیشـانی هەوجاڕەکـەوە لـەزەوی دەچەقـی و زەویەکـەی دەکێـڵا، هەوجاڕەکـە دارێکـی درێـژی تێدەخـرا کـە پێـی دەگوتـرا مـژان ' درێژیەکـەی دوو تـا سـێ مەتـر بـوو، مـژان هەوجاڕەکـەی دەبەسـتەوە بـە دارێکـی تـر بەویـش دەگوتـرا نیـر کـە هـەردوو گوێدرێژەکـەی پێکـەوە دەبەسـتەوەو پشـتی ملـی گوێدرێژەکانیـش بـە بارێنـە دادەپـۆشرا بـۆ ئـەوەی پشـتی ملیـان بـە جوڵانـەوەی دارەکـەو ڕاکێشـانی هەوجاڕەکـە برینـدار نەبێـت،

کێڵانــی زەوی لەبەهارانــدا دەســتی پــێ دەکــرد لەبــەر ئــەوەی زەوی بەهـۆی بـاران بارینـەوە نـەرم دەبـوو هەروەهـا لەپایزیشـدا وەردو شـۆ دەکـراو پاشـان تـۆو دەکـرا.

گێــرەو شــەن کــردن : مانگــی پێنــج بــە مانگــی جــۆزەرد بــوون دادەنرێـت و لەسـاڵنامەی کوردیـدا نـاوی نـراوە مانگـی جـۆزەردان و دەسـت دەکرێـت بـە دروینـەوەی جـۆ، سـەرەتای مانگـی شـەش و دواتریـش کاتـی دروێنـەی گەنـم دەهـات. جوتیـاری کـورد بـۆ دروینـەوەی گەنـم و جـۆ ئامرازێکیـان بـەکار دەهێنـا پێـی دەگوتـرا داس، وا بـاو بـوو بـۆ دروێنـە کـردن زبـارە بکـەن چونکـە بـە زبـارە نەبوایـە کاری دروێنـە وا بەئاسـانی تـەواو نەدەبـوو، ڕەنگـە هەندێـگ لـە گەنجانی ئێسـتا لەووشـەی ( زبـارە )ش تێنەگەن, زبارە واتـە بەشـێك لەپیـاوان و ژنانـی گونـد دەچوونـە هـاوکاری خـزم و دۆسـتێکیان و بـە دەسـتەجەمعی دروێنـەی یەکێـك لەهاوڕێکانیـان دەکـرد بەدەسـتەوایی واتـە دەبـوو هەرکەسـێك بێتـە زبـارەت ' تـۆش دەبێـت بچیتـەوە بـۆ زبـارەی ئـەو، ئەمـە لەکاری کشـتیاریدا پێیـان دەگـوت دەسـتەوایی. پیـاوەکان پێکـەوە بـە داس دەسـتیان دەکـرد بەدروێنـە، ئـەو دەسـکە گەنـم یـان جۆیـەی لەنـاو دەسـتی سـەپانەکە بێـت پێـی دەڵێـن سـوارە بـەڵام کـە لەنـاو پەرێـز داینـا پێــی دەڵێــن مەڵــۆ، ژنانیـش گەنـم یـان ( جـۆ )یـە دوراوەکـە بەشـێوەی کاتـی لەنـاو پەرێـز کـۆ دەکەنـەوە ' ئەگـەر جـۆ بێـت

پێـی دەڵێـن گیشـە ' ئەگـەر گەنـم بێـت پێـی دەڵێـن گەلاوێـژ، دوای ئـەوە بەپێـی کات و گونجـان و ژمارەی تێلەکێشـەکان دەسـت دەکرێـت بەکێشـانەوەی مەڵـۆکان بـە ئامرازێـك کـە پێـی دەگوتـرا قەرانـگ کـە لەشـێوەی داس بـوو بـەڵام دەمـی تیـژ نەبـوو بـۆ شـوێنێك کـە تەخـت وڕووتـەن بێـت ' بـەو شـوێنە دەگوتـرا شـوێن خەرمـان، مەڵـۆکان لەسـەر یەکـتر دادەنـرا و دەکـرا بـە خەرمـان، پیـاوەکان پێیـان دەگوتـرا سـەپان و ژنەکانیـش پێیـان دەگوتـرا تێلەکێـش، سـەپانەکان بـۆ ئـەوەی پەنجەیـان بـەداس یـان دڕك ودڵ و شـتی تـر برینـدار نەبێـت قەیناغیـان دەخسـتە پەنجەیـان، قەینـاغ لەتەنەکـە دروسـت دەکـرا بـۆ ئـەوەی ئەگـەر دەمـی داسـەکە بـەر پەنجەشـیان بکەوێـت هیچـی لـێ نەیـەت. لـەکاری دروێنـەدا داس بەهـۆی زۆر بەکارهێنانیـەوە دەمەکـەی کـول (کۆڵ) دەبـوو ' جـا بـۆ ئـەوەی دەمـی داسـەکان تیـژ بکرێتـەوەو دووبـارە کاری دروێنـەی پـێ بکرێتـەوە ئامرازێکـی لـە بـەرد دروسـتکراویان بـەکار دەهێنـا ناویـان نابـوو هەسـان کـە لەبـەردی زبـر دروسـت دەکـراو دەمـی داسـەکەیان پـێ تیـژ دەکـردەوە.

دوای دروێنـەو دروسـت کردنـی خەرمان، جوتیـارەکان دەبوو خەرمان بکوتـن ئەویـش بـە ئامێرێـك دەکـرا پێیـان دەگـوت جەنجـەڕ، هەمـوو جوتیارێـك جەنجـەڕی نەبـوو چونکـە لەشـارەکان دروسـت دەکـراو نرخیشـی گـران بـوو' بۆیـە ئـەو جوتیارانـەی جەنجەڕیـان

پـێ نەدەكـرِدرا دەبـوو داوا لەوانـە بكـەن كـە جەنجەرِيـان هەبوو، جەنجـەرِ لەتەختـەدار دروسـت دەكـرا سـەرەوەی لەشـێوەی كورسـی بـوو، جێـی دوو كـەس دەبـوەوە تـا لەسـەری دابنيشـن، ژێـرەوەی جەنجـەرِ لـەدوو ئاسـنی يـەك مەتـری پێكدەهـات كـە هـەر يەكێكيـان شـەش تـا هەشـت بالّتـەی پێـوە بـوو ' كـە دەكەوتنـە سـەر قەسـەڵەكە دەيهارِيـو ووردو خاشـی دەكـرد، تەختـەكان بـە بزمـاری گـەورەی ئاسـن لێكـدەدرا تاكـو يەكـتر بـەر نـەدەن، بـۆ ئـەوەی جەنجـەرِ بەسـەر خەرمانەكـەدا بسـورِێتەوە دەبـوو دوو گا يـان دوو گوێدريـژ رِايانكێشـێت و بەگوريسـێكەوە دەبەسـترا كـە لەناوەراسـتی خەرمانەكـە بـە دارێكـی مەحكـەم دەچەقێـنرا، هەمـوو خەرمانێكـی مـام ناوەنـدی بەلايەنـی كـەم هەفتەيەكـی دەويسـت تـا بـە جەنجـەرِ بكوترێـت و ببێـت بـە وورده ، پاشـان نـۆرەی شـەن كـردن دەهـات كـە بەشـەنەی لـەدار دروسـتكراو ئەنجـام دەدرا، بـۆ ئەنجامدانـی شـەن كـردن دەبـوو ( بـا )ی بێـت ، لەنـاو كۆمەڵگـەی كوردسـتاندا بـە دوو جـۆره ( بـا ) شـەن دەكـرا كەپێيـان دەگـوت بـای (ورِه) و بـای (شـەماڵ ) بەتايبەتـی بـای شـەماڵ، شـەن كـردن بريتـی بـوو لـە هەڵدانـی وورده بۆ ئاسـمان بـە بەرزی مەتـرو نيوێـك، بـەم هەڵدانـەش كايەكـە بەهـۆی سـووكی خۆيـەوه ( بـا )كـە دەيـبرده چەنـد مەترێـك لـەدووری خەرمانەكـەو گەنمەكـەش بەهـۆی قورسـی خۆيـەوه لەشـوێنی خـۆی دەكەوتـە سـەر زەوی،

بـەم شـێوەیە گەنـم یـان ( جـۆ )یەکـە لـە کایەکـە لەیەکـتر جیـا دەکرانـەوە. دوای تەواوبوونـی شـەن کـردن و دەسـکەوتنی گەنـم و جۆیەکـی خاوێـن ، دەسـت دەکـرا بـە کێشـانەوەی جـۆو گەنمەکـە بـە جـواڵ (جـەواڵ) کـە لەمـووی بـزن و خـوری مـەڕ دروسـت دەکـرا، جـواڵ چـوار تـا شـەش تەنەکـە گەنمـی دەگـرت و بەپشـتی گوێدرێـژ یـان هێسـتر دەیانـبردەوە مـاڵ، (کا)یەکـەش بـە ڕەشـکە دەکێشرایـەوە بـۆ نـاو کادیـن و لـەوەرزی پایـزو زسـتان وەك ئالیـك دەدرا بەمـەڕو بـزن و مانـگاو گوێدرێـژ و ئەسـپ و هێسـتر، ڕەشـکەش لەمـووی بـزن دروسـت دەکـراو نزیکـەی پانـزە بـۆ بیسـت فـەردەی ئێسـتای دەگـرت.

دارەڕێ و قوڕە پەست :

شـوێنی حەوانـەوەو نیشـتەجێ بوونـی هەمـوو خێزانێـك لەنـاو خانـووی قـوڕ بـوو، خانـووش دەبـوو بـە خشـت دروسـت بکرێـت لەجێـی بلۆکـی ئێسـتا، خشـت بـە ( خشـتبڕ ) دروسـت دەکـرا خشـتبڕیش لـە تەختـەدار دروسـت دەکـرا ، کـە قەبارەیـان جیـاواز بـوو، باوترینیـان دە سـانتیمەتر پان و بیسـت سـانتیمەتر درێژو پێنج سـانتیمەتر بـەرز بـوو، دەبـوو پیاوێکـی شـارەزا دیـواری بکردایـە، پێیـان دەگـوت وەسـتا، قـوڕی خەسـت و پـڕ (کا) یـان بـەکار دەهێنـا بـۆ دیـوار کـردن، دوو ژوور یـان زیاتـر، هەیـوان و ناندێـن و دیـواری حەوشـەو تەوێڵـەی مـەڕو مانـگاو گوێدرێژیـان بەدیـواری

خشــت دروســت دەکــرد، کــە دیــوار تــەواو دەبــوو نــۆرەی دارەڕا ( دارەڕێ ) دەهـــات ئەویـــش پیاوێکـــی شـــارەزا دەیکـــرد، دارەڕێ بریتــی بــوو لــە دانانــی داری پێویســت لەســەر خانوەکــەو بەقــوڕی خەســت دارەکانیــان بەســەرەوەی دیوارەکــەوە دەبەســتایەوە بــەم کارەیــان دەگــوت مــۆرە، پــاش چەنــد ڕۆژێــك لــە دوای مــۆرەو وشــك بونــەوەی قوڕەکــە قەمیــش و ژاژیــان دەخســتە ســەری، دواتر قوڕیــان دەگرتــەوەو دیســان بەدەســتەوایی و زبــارە قوڕەکەیــان ســەر دەخســتە ســەر خانوەکــەو کەســێکی شــارەزا ڕۆڵــی وەســتای دەبینــی لەســواغدان و دانانــی قوڕەکــە، هەمــوو ســاڵێکیش لەپایــزدا دەبــوو خانــوەکان ســەرســواغ بکرێنــەوە چونکــە بەهــۆی بــاران و بەفــرو وەیشــوومەوە ( گەرمــا و ســەرما ) کەلێــن و بۆشــایی و درز دەکەوتــە ســەر قوڕەپەســتەکە بەمــەش زســتان دڵۆپــەی دەکــرد ئەگــەر ســەرســوغیان نەکردایــە.

ئــەو پایــزەی ئەحمــەد قەمبــەری تیــای لەدایــك بــوو دەوڵەتــی عێــراق هێشــتا لــە قۆناغــی پاشــایەتی و فیودالیــدا دەژیــا، گوزەرانــی خەڵــك لەوپــەڕی خراپیــدا بــوو، ڕەوشــی ئاو و کارەبا و نەخۆشــخانەو داو و دەرمــان و ڕێــگا و بــان و خزمەتگوزاریەکانــی تــر لەوپــەڕی شــپرزەییدا بــوە کەچــی کــەس دەنگــی لێــوە نەهاتــوەو کــەس نــاڕازی نەبــوە، گــەر ناڕازیــش بونایــە کــەس دەرینەبڕیــوە، تــا تەمــوزی ســاڵی ١٩٥٨ کــە عەبدولکەریــم قاســم ناڕەزایەتــی خــۆی

بەکودەتایەکی سەربازی ڕاگەیاند و ئیتر سەردەمی پاشایەتی کۆتایی پێ هات و سیستەمی کۆماری جێگەی گرتەوە.

گوندی قەمبەریش لەو سەردەمەدا وەکو تەواوی گوندەکانی عێراق و کوردستان نە کارەبایان هەبوە نە ئاوی پاکژیان بۆ دابین کرابوو، نە ڕێگەوبانیان بۆ کرابوەوە نە خانوو و شوێنی نیشتەجێ بونیان باش بوە، دانیشتوانەکەشی لەوپەڕی نەبوونی و زەبوونیدا ژیاون و هەمیشە ڕەنجدەرو ماندوو و هیلاك بوون و ژیان و کەلوپەل و پێداویستیەکانی ژیانیان سادە و ساکار بوە، هەمیشە سوتاو و برشاوی بەر هەتاو و کارکردن و سەپانی و شوانی و گاوانی بوون، ئەحمەد قەمبەریش وەکو تەواوی منداڵانی تری کورد لەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسیە شپرزەیەی ئەو سەردمەی عێراق هاتە دنیاوەو تەمەنی منداڵی بەسەر بردوە.

لەبارەی چۆنیەتی تەمەنی منداڵی و قۆناغی هەراشی و گەنجێتی شەهید ئەحمەد قەمبەریەوە ' محەمەدی برای کە تەنها سێ ساڵ لەو گەورەترە گوتی: منداڵێکی هارو هاج و بێعار نەبوو، شەڕی لەگەڵ منداڵانی تر نەدەکردو هاوڕێیەتی زۆربەی منداڵانی گوندی دەکرد، منداڵێکی نەرم و نیان و بەگوێکەر بوو، دەم پیس و دەم شڕو جوێن فرۆش نەبوو، لە سەردەمی منداڵی ئەودا خوێندەوار کەم بوو بەڵام ئەو

زرنگترو چاوکراوه تر بوو له منداڵانی تر، لەتەمەنی شەش حەوت ساڵیدا پێکەوه کارەوان و بەرخەوان بووین، هەرگیز پێکەوه شەڕمان نەکردوەو هەمیشە پێی دەگوتم کاکە[1] چونکە سێ ساڵ لەو گەورەتر بووم، هەر لە منداڵیەوه کۆمەڵێک خاسیەتی جوانی تیا بەدی دەکرا وەك ڕێز گرتن لە کەسانی لەخۆی گەورەتر[1] بە کاك بانگی خەڵکی تری دکرد، هەروەها منداڵێکی دەست پاك و بێگەرد بوو[1].

هەر لەبارەی تەمەنی منداڵی شەهید ئەحمەد قەمبەریەوە، حاجی عومەر گوتی : زۆربەی هەرە زۆری تەمەنی منداڵیمان پێکەوە بەڕێکردوە، جگە لەوەی ئامۆزام بوو هاوڕێیەکی نزیکیشم بوو، بەبیرمە لە تەمەنی پێنج شەش ساڵیەوە یاری و هەڵسوکەوتمان پێکەوە دەکرد، یاری ئەو سەردەمەی ئێمەش بریتی بوو لە هەلوکێن و چاوشارکێ و کێل و بەردان و داودابڕان، شەهید ئەحمەد منداڵێکی شەڕانگێز نەبوو، لەگەڵ تەبیعەتی هەموو منداڵێکدا دەگونجا، خوو و ڕەوشتێکی جوانی هەبوو ڕێزی لە هەموو کەس دەگرت بەتایبەتی ئەوانەی لە خۆی بەتەمەن تر بوون، حەزی بەزەرەری کەس نەدەکرد و لە تەنگانەشدا هاوکاری هەموو کەسێکی دەکرد[2].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد ئۆمەر ئەحمەد لە ڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

٢- گفتوگۆ لەگەڵ عومەر حەمەڕەشید ئەحمەد لە ڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

سلێمان حەمە حەبیب لەبارەی بەڕێکردنی تەمەنی منداڵیان و سەرگوزشتەی منداڵی و ئاکار و خوو و ڕەوشتی شەهید ئەحمەد گوتی : ئەحمەد منداڵێکی لەسەرخۆو هێمن بوو، سەرئێشەو گرفتی بۆ کەس نەبوو بەڵام لەهیچ منداڵێکیش قبووڵی نەدەکرد غەدری لێ بکات یان شەڕی پێ بفرۆشێت، گیانی هاوڕێیەتی و دڵسۆزی تیابوو، لەبەرخەوانی و شوانیشدا لە هاوڕێکانی ئازاو بە دەستوبرد تر بوو، زۆر جار لە تەمەنی منداڵی و هەرزەیی باسی دڕندەو جنۆکەو دێوو درنجمان بۆ کراوەو زۆربەمان کەم تا زۆر سڵمان دەکردەوە بەڵام ئەو لەو شتانە نەدەترساو لە هەموومان ئازاتر بوو ، بۆ چوونە ناو ئەشکەوت و شوێنە مەترسیدارەکان بە گوێرەی تەمەنی ئێمە[1].

١- گفتوگۆ لەگەڵ سلێمان قەمبەری لەڕێککەوتی ١٤-٦-٢٠١٩

ناوی تەواوی سلێمان حەمەد حەبیبە، لەساڵی ١٩٥٣ لە گوندی قەمبەر لەدایك بوە، تەمەنی منداڵی و گەنجێتی خۆی هەر لەوێ بەسەر بردوە، خاوەنی حەوت منداڵە، ئێستا لەکۆمەڵگەی قوشتەپە نیشتەجێیە، ئامۆزای شەهید ئەحمەد قەمبەریە.

## لەنێوان تفەنگ و یار

پێکەوەنانــی خێــزان و هاوســەرگیری کــردن و دروســت کردنــی ماڵێکـی نـوێ یـەك لـە هیـواو ئاواتەکانـی هەمـوو گەنـج و لاوێکـە، ئەحمـەد قەمبەریـش بـەدەر نەبـوو لـەم ڕێسا کۆمەڵایەتیـە، بـەڵام لەجیاتـی ئـەوەی داوا لـە باوکـی بـکات تـا ماڵێکـی نوێـی بـۆ بنیـات بنێـت و بچێتـە خوازبێنـی یەکێـك لـە کچانـی ئاوایـی ' داوای کڕینـی چەکـی لـێ کـرد.

بەرلــەوەی حەوشــە پــان و بەرینەکــەی قەمبــەر بەجێبهێڵیــت و چیــتر گوێــی لــە قــرازە قــرازی مامرەکانیــان نەبێــت، بەرلــەوەی خواحافیــزی لــە کاریتــە ڕەش هەڵگــەڕاوەکان و پاســاری ســەر گوێســوانەکانی ئاوایــی بــکات، بــەر لــەوەی دوایــن هەنــگاو لــە کۆڵانــە پێچاوپێچــەکان بهاوێــت و گۆنــای زەینــەب و دەســتە چـرچ و لۆچەکـەی ئۆمـەر مـاچ بـکات، بەرلـەوەی لەپاڕەزەوە بـۆ دواجـار بڕوانێتـە یـەك یـەك دۆڵ و گـردو تەپۆلکـەو زەنوێرەکانـی دەوروبـەری ئاوایـی، بەرلـەوەی خواحافیـزی لـە یـەك یـەك خەڵکـی ئاوایـی بـکات، بـەر لەمانـە ئەحمـەد لای عومـەر حەمەڕەشـیدی ئامـۆزای درکاندبـووی :

-ئیتر من دەبم بەپێشمەرگە.

لـە سـەرەتای نیسـانی سـاڵی ١٩٧٤ ' دوای ئـەوەی گفتوگـۆی نێـوان سـەرکردایەتی شۆڕشـی ئەیلوول و حکومەتی عێراق هەڵوەشـایەوەو شـەڕ دەسـتی پـێ کـردەوە هـەزاران کـەس لـە لادێ و شـارەکانی کوردسـتانەوە پەیوەندیـان بـە شۆڕشـەوە کـردو بـوون بەپێشـمەرگە، لـە هەمـوو لایەکـی کوردسـتانەوە ئاگـری شـەڕ داگیرسـا و سـوپای عێـراق لـە هەمـوو بەرەکانـەوە هێرشـی فراوانـی ئەنجامـدا، یـەك لەو گەنجانـەی پەیوەنـدی بـە شۆڕشـەوە کـرد ئەحمـەد قەمبـەری بـوو لـە سـەرەتای نیسـانی سـاڵی ١٩٧٤ دا کـە هێشـتا تەمەنـی لـە بیسـت و یـەك سـاڵ تێنەپـەڕی بـوو، ئـەو سـەردەمە ئەحمـەد قەمبـەری گەنجێکـی کـەم ئەزمـوون و نەشـارەزا بـوو لـە کاری چـەك و چەکداریـدا وەلـێ بـاوەڕی بـە خـۆی بـوو کـە دەتوانێـت لـە پێنـاوی ئامانجـە نەتەوەییەکانیـدا تێبکۆشـێت.

لەبـارەی کات و سـاتی بوونـە پێشـمەرگەو شـوێن و یەکـەی پێشـمەرگایەتی شـەهید ئەحمـەد قەمبەریـەوە مـام عومـەر سـابیر بەردەسـپی گوتـی :

لەمانگـی چـواری سـاڵی ١٩٧٤ هەریـەك لـە ئەحمـەد قەمبـەری و قـادر خـدر قەمبـەری و حەمەسـاڵح مـام تۆفیـق و عـەولا مـام حەمـەد نـاسراو بـە عـەولا رەش سـێکانی و سـەعید مـام کاکل

سێکانی پێکەوە چوونە باواجی لای ئەحمەدی حاجی عەلی کە فەرماندەی بەتالیۆنی سێ بوو دواتر گوازرانەوە لای سەعدی گچکە کە ئەوسا سەرپەل بوو و بارەگایان لە کانی ئۆمەراغە دانا.

مام عومەر بەردەسپی لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا گوتی : دوای شەڕەکەی سەری باواجی کە تیایدا فەرماندەی بەتالیۆن کاك ئەحمەد حاجی عەلی و برایەکی بە ناوی فاررووق حاجی عەلی و چەند پێشمەرگەیەکی تر شەهید بوون ئێمە ڕۆیشتینە دۆڵی سماقووڵی ' لە ئاوەگرد دیسان توشی شەڕ هاتین، لەوێ نامەیەکی فارس باوەمان بەدەست گەیشت نوسیبووی دەبێت بارەگاتان ببەنە گوندی شیرێ ' خدری حاجی عەلی کراوەتە فەرماندەی بەتالیۆن لەشوێنی شەهید ئەحمەدی برای. واجبی سەر شاخی ماکۆکمان پێ سپێردراو حکومەت هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر شاخەکە و چوار شەهیدمان دا، دواتر بە بڕیاری بەتالیۆن هێزێکی تر هاتە شوێنمان و پشوویان دایە ئێمە، شەڕەکە هەر بەردەوام بوو، شەوی دواتر خدری حاجی عەلی بانگی منی کرد و گوتی پێشمەرگەکان لەسە ر شاخ فیشەکیان کەم بوە سندوقێك فیشەکیان بۆ بنێرە، منیش ڕووم کردە پێشمەرگەکان و گوتم یەکێکتان ئەم سنووقە فیشەکە بگەیەننە سەر شاخ بەڵام کەس ئامادە نەبوو بەو

شـەوە لەترسـی بۆسـەو پەلامـاری حکومـەت سـەربکەوێتە سـەر شـاخ، پـاش چەنـد دەقیقەیـەك لەبێدەنـگ بوونـی پێشـمەرگەکان شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری هەسـتی بەنیگەرانـی کـردو گوتـی مـن فیشـەکەکان دەگەیەنمـە سـەر شـاخ، جگـە لـەو کەسـی تـر ئامـادە نەبـوو لـەو شـەوە پـڕ مەترسـیە فیشـەك بگەیەنێتـە هیزەکانمـان لەسـەر شـاخ،

ئەحمـەد قەمبـەری وەسـفی ناکرێـت لەئازایەتـی و بوێـری، تـا شۆڕشـی ئەیلـوول هەرەسـی هێنـا پێشـمەرگە بـوو و لەزۆربـەی شـەڕەکانی ئـەو کاتـە بەشـدار بـوو وەك شـەڕەکانی پـردی سـامآڵ، چیـای کانـی لەلـە، ئاوەگـرد، حەسـەن بـەگ، جـادەی نێـوان کۆیـە و هەولێـر[1].

هەر لەبارەی رۆژی پیشـمەرگایەتی ئەحمەد قەمبەریەوە محەمەدی بـرای شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری گوتـی : لـە ناوەڕاسـتی نیسـانی سـاڵی ١٩٧٤ لەگـەڵ کۆمەڵێـك گەنجـی گونـدی قەمبـەر و سێکانی ڕۆیشـتن بوونـە پێشـمەرگە لـە بەتالیۆنـی سـێ کـە ئەحمـەدی حاجی عەلـی فەرمانـدەی بەتالیۆنیـان بوو، تا هەرەس هێنانی شـۆڕش هەر پێشـمەرگە بوو، دوای هەرەس بەلێبوردنی گشـتی هاتەوە قەمبەرو لەگـەڵ ئێمـە دەسـتی دایـەوە کارو کاسـبی بـەڵام زۆر خەفەتـی لـە هـەرەس هێنانـی شـۆڕش دەخـوارد هەمیشـە غەمبـار بوو.

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ لە ڕێککەوتی ١٦-٥-٢٠١٩

محەمـەد نۆمـەر لەدرێـژەی وتەکانیـدا گوتـی : مانگـی دەی سـاڵی ١٩٧٦ مەفرەزەیەکـی پارتیزانـی یەکێتـی کـە بریتـی بـوون لەشـەهید ڕێبـاز، شـەهید علـی سـاڵح، شـەهید عەبدولڕەحـمان سـۆنەگۆلی، شـەهید ئەسـعەد ئاومالـی، شـەهید عزیـز کەڵەکـی، شـەهید محەمەد ڕەسـووڵ سـێگردکانی بەنهێنـی هاتنـە ناوچەکـە، نازانـم ئەحمـەد چـۆن ئەوانـی دۆزیبـووەوەو داوای لێیـان کردبـوو کـە دەیەوێـت ببێـت بەپێشـمەرگە، ئەوانیـش بەبـێ چـەك وەریاننەگرتبـوو ' گوتبویـان چەکێـك پەیـدا بکـە ئنجـا دەتکەیـن بەپێشـمەرگە، ڕۆژێـك ئەحمـەد بـە باوکمـی گـوت مـن دەبـم بەپێشـمەرگەو بەبـێ چەکیـش وەرمناگـرن و چەکێکـم بـۆ بکـڕن، باوکیشـم لەبـە ر ئەوەی شـۆڕش و پێشـمەرگەی خۆشدەویسـت نـەك هـەر لاری نەبـوو بەڵکو چەکیشـی بـۆ کـڕی، باوکـم دەمانچەیەکـی سـتاری هەبـوو کـە بەئامانـەت لای سـەید ئـادەم بانەمـوردی دانابـوو، دەمانچەکـەی بـە دوو سـەد دینـار فرۆشـت و بڕنەوێکـی بـۆ کـڕی لەپیاوێـك بەنـاوی ئەنـوەر، سـەرەتای مانگـی یانـزەی سـاڵی ١٩٧٦ ئەحمـەد چەکەکـەی بـردو ئیـتر بـوو بەپێشـمەرگە[١].

حاجـی عومـەر حەمەڕەشـید لەبـارەی کات و شـوێنی بوونـی ئەحمـەد قەمبـەری بەپێشـمەرگە گوتـی : لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٧٦ دا شـەهید عەلـی سـاڵح بـۆ ماوەیەك بەتەنها لەناوچەکـە ئیختیفابوو،

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد نۆمەر ئەحمەد لە ڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

وا تێدەگەم شەهید ئەحمەد لەکاتی کاروباری دەشت و دەردا شەهید علی بینیبێت و هەر ئەویش ڕێی بۆ دانابێت کە ببێت بەپێشمەرگە، دواتر باوکی چەکێکی بڕنەوی بۆ کڕی و لەمانگی ١٠ ی ئەو ساڵەدا بوو بە پێشمەرگە[١].

لاله حەکیم ئۆمەرگومبەتی هەر لەو بارەیەوە گوتی :

-ڕۆژێك لە مانگی نۆی ساڵی ١٩٧٦ ئەحمەد قەمبەری هاتە ماڵی ئێمەو شەو لامان مایەوە، پێی گوتم بۆ ئەوە هاتووم ببمە پێشمەرگەو بە برادەرانم بناسێنی، بەو هۆیەی هەردوولامان دۆستایەتی و هاموشۆمان هەبوو دەیزانی پارتیزانەکان دێنە لای من و هاوکاریان دەکەم هەر بۆیەش بۆ لای من هات، منیش بەڵێنم پێدا کە ئەمجارە برادەران بێنە ئەم سنورە بەوانیان بسپێرم، مانگێک و چەند ڕۆژێکی پێ چوو شەوێك کە سەعات لە دوانزەی شەو تێپەڕیبوو پێلەقەیەك لە خانوەکەمان درا یەکسەر زانیم برادەرانن ' چونکە ئەوە نهێنی هەردوولامان بوو، دەرگام کردەوە شەهید ڕێبازو شەهید علی ساڵح و دوو کەسی تر بوون، دوای پشوودان و نان خواردنیان پێم گوتن گەنجێکی قەمبەری ناوی ئەحمەدەو دەیەوێت ببێت بەپێشمەرگە، ئەوانیش گوتیان ئەگەر لەنزیکەوە دەیناسی و کەسێکی دڵسۆزەو پێشمەرگایەتی پێ دەکرێت ئێمەش وەریدەگرین، ئیتر ئەو

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ عومەر حەمەڕەشید ئەحمەد لەڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

شەوە برادەران کە بەشێوەی پارتیزانی جەولەیان دەکرد چوونە ئەشکەوتی خۆڵەڕیژە لەهەڵەتی ئۆمەرگومبەت و مانەوە، بۆ بەیانی منیش جوابم بۆ ئەحمەد ناردو ئەویش شەو هات، ئەحمەد بڕنەوێك و خەریتەیەکی کۆنی پێبوو، ئەحمەدم بردە لای برادەران و ئیتر بوو بەپێشمەرگە[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ لالە حەکیم ئۆمەرگومبەتی لە ڕێککەوتی ٢٢-١-٢٠١٩

ناوی تەواوی عەبدولحەکیم عەبدولڕەحمان فەقێ محەمەدە ' لە ساڵی ١٩٣٤ لەگوندی ئۆمەرگومبەت هاتۆتە ژیانەوە، لەتەمەنی گەنجیەوە خەریکی کاروباری ژیان و کاسبی کردن بوە، ناوی نراوە دۆستی شۆڕش لەبەر ئەوەی لە هەردوو شۆڕشدا هاوکارێکی دڵسۆزی هێزی پێشمەرگە بوەو ماڵەکەی وەك بارەگای پێشمەرگە سوودی لێ وەرگیراوە، ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی کردوە بەڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵەو یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە، هاوکارێکی باشی پێشمەرگە سەرەتایی و پارتیزانەکانی سەرەتای شۆڕش بوە، پەیوەندیەکی توندوتۆڵی لەگەڵ شەهید ئەحمەد قەمبەری هەبوە، ئێستا لە گوندێکی نزیك ئۆردوگای قوشتەپە نیشتەجێیە

# ژیانی پارتیزانی

تا ساڵی ١٩٨٠ ش یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ٬ پێشمەرگەکانی بەشێوەی پارتیزانی ناردبوە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، چونکە هێزە سوپایی و سەربازیەکانی حکومەتی عێراق لە دوای هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلوول لە زۆربەی لادێ و ناوچەکانی کوردستان بنکەو بارەگاو رەبیەیان دانابوو، هێزی پێشمەرگە نەیاندەتوانی بەئاشکرا چالاکیە سیاسی و سەربازیەکانی خۆیان ئەنجام بدات.

ئەو کاتەی ئەحمەد قەمبەری پەیوەندی بەڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کرد شۆڕش لە سەرەتای گڵپەی دابوو، گڵپەی شۆڕشیش بریتی بوو لەناردنە خوارەوەی هێزی پێشمەرگە بە شێوەی نهێنی و مەفرەزەی بچووك بچووك کە ژمارەی هیچ مەفرەزەیەکیان لە دە کەس تێنەپەڕێت و بەشەو ناوچە بەناوچەو گوند بەگوند بگەڕێن و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە خەڵك بناسێنن و سیاسەت و ستراتیژیەتی یەکێتی بگەیەنن بەهاوڵاتیان، هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لای خەڵکی کوردستان بکەن بەپێویستی ئەو قۆناغە، هەروەها ئەو نائومێدی و

بێهیواییەی کە لەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوولەوە لە دەروونی خەڵك چەکەرەی کردبوو بڕەوێننەوەو هیوایان پێ ببەخشنەوە، جگە لە مانەش خەڵك بهێننە ناو ڕێکخستنەوەو خەبات کردن لە ڕێکخستنەکانی یەکێتی لایان بکەن بە پێویستی قۆناغەکە.

لەدوای هەرەس پێهێنانی شۆڕشی ئەیلوول ' حکومەتی عێراق پێی وابوو ئیدی کۆمەڵگەی کوردستان و گەلی کورد ناتوانن سەرلەنوێ شۆرش هەڵگیرسێننەوەو هیچ سەرکردەیەك ناتوانێت خەڵك چەکدار بکات و بیاننێرێتەوە بۆ شاخەکانی کوردستان، بۆ ئەمەش هیچ ناوچەکی کوردستان نەما بەشاخ و چیا سەختەکانیشەوە هێزی سەربازی هەمیشەیی خۆی لەشێوەی سەربازگەو ڕەبیەی لێ دانەنابێت تا چاودێری ووردی هەموو جۆرە جموجۆڵ و بەرهەڵستکاریەك بکەن، کەچی کەمتر لەساڵێك یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و دواتر پارتی سۆسیالستی کورد ( پاسۆك ) و حزبی سۆسیالستی کوردستان دامەزران و هێزی پێشمەرگەیان پێکهێنا و ڕەوانەیان کرد بۆ شاخەکانی کوردستان، دوای ئەوانیش پارتی دیموکراتی کوردستان ( قیادە موەقەتە ) و حزبی شیوعی عێراق دەستە چەکدارەکانی خۆیان ناردەوە کوردستان، لەناو ئەم چەند پارت و ڕێکخراواندا یەکێتی کاریگەرترینیان بوو بۆ دروست کردن و ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەو چەکدار کردنیان، یەکێتی هێزی پێشمەرگەی کردە

گروپ و مەفرەزەی بچووك بچووك تا کەمتر لەبەر چاوی دووژمن دەربکەون و گەر کەوتنە بەر پەلامارو ئاشکرا بوونیش کەمترین زیان بدەن، کەسی ناو مەفرەزەکانیش بەپێی سنووری پارێزگاکان و ناوچەی جوگرافی دیاری کرابوو ' بۆ نموونە پێشمەرگەی دەشتی هەولێریان نەدەنارده سنوری پارێزگاو ناوچەیەکی تر بەڵکو دەینارده ناوچەکانی خۆیان چونکە شارەزاتر بوون و دەیانتوانی کاری پارتیزانی و مەهام و ئامانجەکانی شۆڕش باشتر جێبەجێ بکەن، تەنها هەندێك حاڵەت نەبێت کە یەکێتی بەپێویستی بزانیایە خەڵکی دەڤەرێکی دەنارده دەڤەرێکی تر.

پارتیزانەکان هەریەکەو لەناوچەو دەڤەری دیاریکراو بەرۆژەوە لە ئەشکەوت و شوێنە دووره دەستەکان خۆیان حەشار دەداو شەوانیش دەگەڕان و لەجەولەو بەسەرکردنەوەدا بوون، بەنهێنی سەردانی ئەو کەسانەیان دەکرد کە نیشتیمان پەروەرو دڵسۆزبوون ، بۆ ئەوەی هەواڵی هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێیان پێ بگەیەنن هەم بیانکەن بە دۆست و هاوکاری شۆڕش و پێشمەرگە هەم بیانکەن بە ئەندامی ڕێکخستنە نهێنیەکان، زۆربەی کات لە ماڵان نەدەخەوتن بەڵکو لە پەنای گابەردێك یان ژێر ئەشکەوتێك یان کۆردەرەیەك دەخەوتن، ئەو کەرەستانەی پێشیان بوو بریتی بوو لە چەکێکی کۆن و چەند مەغزەن فیشەك و تاقمێك و بەتانیەك و چەند دینارێك و کڵاو

و جامانەیـەك، هەندێـك كاتیـش نوشـتێك نـان و مەتارەیەكـی بچووكـی ئـاو، هەندێـك جـار لـەو ماڵانـەش نانیـان دەخـوارد و نانیـان پـێ دەدرا كـە پێشـتر دۆسـتی شـۆڕش بـوون یـان كەسانی دڵسـۆزو جێـی متمانەیـان بـوون.

زۆر جـار توشـی پێكدادانـی چەكـداری و بۆسـەی سـوپای عێـراق و جـاش و پەلامـاری كتوپـڕی حكومـەت دەبوونـەوە كە بەهـۆی پیاوانی سـیخوڕو جاسوسـەكانی حكومەتـەوە شـوێن پێیـان هەڵدەگیـراو شـوێنیان ئاشـكرا دەكـرا كـە بەهۆیـەوە دەیـان پێشـمەرگە شـەهید بـوون و هەندێكیشـان بـە دیـل گیـران وەكـو ئـەوەی لـە تەنگـی سـەر و دەشـتی كۆیـەو هەڵەتـی ئۆمەرگومبـەت و گەرمیـان و دۆڵـی ئاكۆییـان و یاخسـەمەرو شـارەزوور ڕوویـدا بەمـەش زیانـی گـەورە بـەر شـۆڕش و هێـزی پێشـمەرگە كـەوت.

لەكاتــی جەولــەو ڕێڕۆیشــتنی شــەوانەیاندا شــێوەی ڕۆیشــتنیان بـەدوای یەكـدا بـوو، نێـوان هەر پێشـمەرگەیەك بۆ پێشـمەرگەیەكی تـر دوو تـا دە مەتـر بـوو، وشـەی نهێنیـان بـۆ خۆیـان دادەنـا تـا لـە تاریكـی شـەودا یەكـتری پـێ بناسـنەوە، بـۆ نموونـە لـە شــەوەزەنگدا توشــی چەكــدار یاخــود غەڵبــە غەڵــب بونایــە چەكیـان لـە یەكـتر دەهێنایـە خـوارەوە و دەنگـی یەكتریـان دەدا و دەیانگـوت خۆتـان بناسـێنن، گـەر ناسـاندنەكە هەمـان ئـەو وشـە نهێنیـە بوایـە كـە بـۆ یەكتریـان دانابـوو ئـەوا باوەڕیـان بـە یەكـتر

دەکـردو بـۆ لای یەکـتر دەچـوون، خـۆ ئەگـەر وڵامەکـە هەمـان ئـەو ووشـە نهێنیـە نەبوایـە کـە پێشـتر بـۆ ناسـینەوەی یەکـتر دایاننابـوو بێگومـان سـەنگەریان لـە یەکـتر دەگـرت و دوور نەبـوو ببێتـە شـەڕ ' چونکـە پێشـمەرگە پارتیزانـەکان ترسـیان لـە بۆسـەو پەلامـاری حکومـەت هەبـوو، زۆر جـار حکومـەت مەفـرەزەی جاشـی دەنـاردە گونـدەکان و خۆیـان دەکـردە پێشـمەرگە، جـا بـۆ ئـەوەی پێشـمەرگە پارتیزانـەکان هاوڕێکانـی خۆیـان بناسـنەوە وشـەی نهێنیـان دادەنـا، هەندێـك جـار وشـە نهێنیـەکان لەڕێگـەی سـیخوڕەکانی حکومەتـەوە کـە خۆیـان خزاندبـوە نـاو مەفـرەزە پارتیزانەکانـەوە دزەی پـێ دەکـراو جـاش و سـەربازانی حکومـەت بـۆ لێدانـی پێشـمەرگە کەڵکیـان لـێ وەردەگـرت.

پارتیزانـەکان بـۆ ئـەوەی لـە چـاوی جاسـووس و سـیخوڕەکان بـەدوور بـن و شـوێنی حەوانـەوەو نـان خـواردن و ڕێـی هاتوچۆیـان ئاشـکرا نەبێـت و درێـژە بـدەن بـەکاری پارتیزانـی و جێبەجـێ کردنـی ئـەو ئەرکانـەی پێیـان سـپێردرابوو دەبـوو هیـچ پاشـماوەیەکیان لـێ بەجێنەمێنێـت، بـۆ نموونـە کوانـوی ئاگریـان بەخـۆڵ پـڕ دەکردەوەو خۆڵەمێشـەکەیان پـەرت دەکـردەوە، بـە چـرۆو چڵـی دار شـوێنەواری ڕێ ڕۆیشـتن و شـوێن پێـی خۆیـان لـە ڕچـە ڕێـکان نەدەهێشـت و پاشـماوەی تـۆو چـای و توێکڵـی هێلکـەو پەتاتـەو کەلوپەلـی بەکارهاتوویـان دەخسـتە ژێرخاکـەوە تـا نەبینرێـت .

شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری یەکێك بـوو لـەو پارتیزانانـەی دەشـتی هەولێـرو فەرمانـدەی مەفـرەزە بـوە، هەمـوو هاوڕێکانـی ' ئەوانـەی لــە ژیــان مــاون باســی گــورج و گۆڵــی و زرنگــی دەکــەن لــە کاری پارتیزانیـدا، هاشـم حەمەدەمیـن ماوەیـەك لـەکاری پارتیزانیـدا هاوڕێـی بـوە گوتـی : شـەهید ئەحمـەد پارتیزانێکـی ووریـاو زیـرەك و لـە کاری پارتیزانـی زۆر شـارەزاو بەئـاگاو بەهەسـت بـوو، بـەو ڕێیـەدا نەدەگەڕایـەوە کەپێیـدا دەڕۆیشـت، بچوایـە بـۆ دەشـتی کۆیە لای خەڵـك دەیگـوت دەچـم بـۆ دەشـتی هەولێـر، هەمیشـە دڕك یـان داری بـەکار دەهێنـا بـۆ سـڕینەوەو لابردنـی شـوێن پێیەکانـی، دەروونـی خەڵکـی بـاش دەخوێنـدەوە ' بەقسـەکردن و تەماشـا کـردن دەیزانـی کەسـەکە کەسـێکی باشـە یـان خـراپ ' بـۆ حکومـەت دڵسـۆزە یـان بـۆ شـۆڕش[1].

دلێـر کانـی لەلەیـی گوتـی : شـەهید ئەحمـەد وا دەهاتـە بەرچـاو کـە چەندیـن کتێبـی لەسـەر کاری پارتیزانـی و شـێوازی ڕێڕۆیشـتن و ئیختیفـا بـوون و چالاکیـە نهێنیەکانـی خوێندبێتـەوە لەکاتێکـدا ئـەو

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ هاشم حەمەدەمین ڕەسووڵ لە ڕێککەوتی ٦-٢-٢٠١٩

نـاوی تـەواوی هاشـم حمدامیـن ڕەسـووڵە، لەسـاڵی ١٩٥٧ گونـدی سـارتکی سـەر بـە ناحیـەی سـێگردکان لەدایـك بـوە، نەچۆتـە قوتابخانـەو تەنهـا یـەك سـاڵ لـە قوتابخانـەی نەهێشـتنی نەخوێنـدەواری خوێندوویەتـی بـەڵام ئێسـتا خوێندەوارێکـی زۆر باشـەو لـە ژیانـی پێشـمەرگایەتیدا خـۆی فێـرە خوێنـدەواری کـردوە، لـە ١٢-٦-١٩٧٨ لەڕێگەی شـەهید عەلـی سـاڵحەوە دەبێتـە پێشـمەرگە کـە پێشـتر لای ئـەو لەنـاو ڕێکخسـتنە نهێنیـەکان کاری کـردوە، ئێسـتا لـە ناحیـەی تـەق تـەق دەژی، لەنـاو هێـزی پێشـمەرگە ئەفسـەرە بەپلـەی عەقیـد، بەردەوامـە لـەڕاژە و خزمەتکـردن.

نەخوێنـدەوار بـوو و لەسـەرەتای هەشـتاکان خۆی فێـرە خوێندەواری کـرد، پیاوێکـی زرنـگ و ئـازاو پشـوو درێـژو خـاوەن ئیـرادەی زۆرو خۆڕاگـر بـوو لەسـەرماو گەرمـاو برسـێتی و کاتـی تەنگانـەو شـەڕی دەسـتەویەخە، لـەکاری پارتیزانـی کەسـێکی بەئـاگاو شـارەزا بـوو، هەمیشـە خـۆی لەپێشـەوەی مەفـرەزە پارتیزانەکانـەوە دەڕۆیشـت بـۆ ئـەوەی گـەر مەترسـیەکیش هەبێـت بکەوێتـە سـەر خـۆی نـەك هاوڕێکانـی[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ فەیزوڵا ئیبراهیم ئەحمەد ناسراو بە دلێر کانی لەلەیی لە ڕێککەوتی ٢٠١٩-١٠-٧

نـاوی تـەواوی فەیـزوڵا ئیبراهیـم ئەحمـەدە، لـە سـاڵی ١٩٥٨ لـە گونـدی کانـی لەلـە لـە دایـك بـوە، لەسـاڵی ١٩٧٧ لەڕیزەکانـی یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان دەبێتـە پێشـمەرگەو یەکێکـە لەپێشـمەرگە پارتیزانەکانـی ئـەو سـەردەمەو هاوڕێـی شـەهید ئەحمەد بـوە لەژیانـی پارتیزانیـدا، ئێسـتا خانەنشـینی دێرینـەو لەناحیـەی تـەق تـەق دەژی.

# لەپارتیزانییەوە بۆ هێرش بردن

تا ساڵی ١٩٨٠ش شۆڕش لە قۆناغی بەرگری و خۆناساندن و نمایشی سیاسی و وشیارکردنەوەی کۆمەڵگەی کوردی و بەدەستهێنانی لایەنگریتی کۆمەڵانی خەڵك و ڕەگ و ڕیشە داکوتان بوو لە ڕووی سیاسی و سەربازیەوە، لە ماوەی پێنج ساڵ دا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە ڕێگەی پێشمەرگە پارتیزانەکان و کادرو ڕێخستنە نهێنیەکانی ناو شارو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆی لەسەرویانەوە ڕادیۆی دەنگی شۆڕش کە دواتر ناوی گۆڕا بە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان و چاپەمەنیەکانی شاخ توانی شوناسی خۆی بباتە نێو ماڵی زۆربەی خەڵکی کوردستان و ناوی خۆی بگەیەنێتە نێو دڵ و دەروونی زۆربەی خەڵك، لەو قۆناغەدا یەکێتی ژیرانە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیاو دوورنومای سیاسی و کۆمەڵایەتی و تێڕوانین و جیهانبینی خۆی لەمەڕ مافە نەتەوەیی و چینایەتیەکان و چارە سیاسی و دیپلۆماتیەکانی گەیاندە چین و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی کوردی بەتایبەتی توێژی خوێندکارانی زانکۆو پەیمانگاو ئامادەییەکان و فەرمانبەرانی دامودەزگا میریەکان و سەندیکاکانی کرێکاران و جوتیاران و

هۆشیار کردنەوەیان لە ڕێگەی فەلسەفەی سیاسی خۆی و لە ژێر ڕۆشنایی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم.

لەماوەی پێنج ساڵدا یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان وەك هێزێکی گەورەو کاریگەری نەك هەر کوردستان بەڵکو عێراق و ناوچەکەش دەرکەوت ، گەرچی کۆمەڵگەی کوردستان دوای نسکۆ توشی ڕەشبینی و نائومێدی گەورە بوو بوو، جگە لەمەش لەلایەن حزبی بەعس و دەزگا جیاجیاکانیەوە چاودێری ووردی هەموو خەڵك دەکراو ترس و تۆقاندنیان دەنواند تا هیچ کەسێك بیر لە شۆڕش هەڵگیرساندن و پەیوەندی کردن و هاوکاری کردنی یەکێتی و شۆڕش نەکاتەوە ، هەروەها حکومەتی بەعس هەموو تواناکانی خۆی لە رووی سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتی و ڕاگەیاندنەوە بەکارهێنا تا ڕێگە لەگەشە کردنی یەکێتیی و ڕەگ داکوتانی بگرێت و وانیشانی بدات کە سەرکردەکانیان هەڵاتوی سەربازی و گێرەشێوێن و دزو جەردەن و باکیان بە ژیانی خەڵك نیەو شۆڕشیان بۆ گەلی کورد هەڵنەگیرساندوە بەڵکو کۆمەڵە کەسێکی لات و سەرلێشێواوی بێگانە پەرستن. لەو بارەیەوە نقیب جابر عبدلا کە ئەفسەری ئەمنی بەغدا بوو لە ساڵی ۱۹۷۷ نامیلکەیەکی بەچاپ گەیاند، لە نامیلکەکەیدا دەڵێ : یاخیبوەکان بەکرێگیراوی زایۆنیزم و ئیمپریالزمی جیهانین و دەیانەوێت کوردو عەرەب بکەن بە دووژمنی یەکترو ئارامی و ئاسایشی عێراقی خۆشەویستمان لێ تێکبدەن و وڵاتمان لێ

داگیر بکەن نەك گوایە شۆڕش هەڵگیرسێنن و مافی کورد وەرگرن، براکانمان لە باکوور هەموو مافێکیان بۆ دابین کراوە پێویست ناکات هیچ کەسێك بەناوی ئەوانەوە قسە بکات و لە جیاتی ئەوان و بۆ ئەوان دروشمی بریقەدارو درۆیینە بەرز بکاتەوە، بە واتایەکی تر ئەوانەی دەڵێن شۆڕش هەڵدەگیرسێنین کەسانی نیشتیمان پەروەرو خەمخۆرو دڵسۆز نین بۆ ئەم نیشتیمانە کە نیشتیمانی عەرەب و کوردو تورکمان و هەموو ئەوانەیە کە لە سایەی حزبی بەعس تیایدا دەژین بەڵکو دزو درۆزن و تێکدەرن و مەبەستیانە بەفیتی زایۆنیزمی جیهانی ڕەوڕەوەی پێشکەوتن و ئاوەدانی عێراق ڕابگرن و تەسلیمی دووژمنانی بکەن[1] .

لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠ جەنگی نێوان عێراق و ئێران هەڵگیرسا، حکومەتی عێراق بۆ بەهێز کردنی بەرەکانی جەنگ و زاڵ بوون بەسەر ئێراندا بەشێك لەو هێزە سەربازیانەی گواستەوە کە لەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان جێگیری کردبوو، بەمەش پانتاییەکی فراوانی جوگرافی بۆ یەکێتیی واڵا بوو تاکو تیایدا چالاکیە سیاسی و ڕێکخراوەیی و تەنزیمیەکانی خۆی زیاد بکات و بگات بە زۆربەی ئەو لادێ و شوێنانەی کە پێشتر دەستی پێ نەدەگەیشت.

---

١- نەقیب جابر عبدڵا، التخریب،ل٩

جەنگی ئێران-عێراق فاکتەرێکی کاریگەر بوو تا یەکێتیی لە ماوەیەکی کەمدا گەشەیەکی هەمەلایەنەی بەرچاو بەخۆوە ببینێت، لەدوای هەڵگیرسانی شەڕی ئەم دوو وڵاتەو گەرم بوونی بەرەکانی جەنگ و کوژرانی هەزاران سەرباز لە هەردوولا بەشێکی زۆر لەو گەنجانەی بەپێی موالیدیان بانگهێشت دەکران بۆ ڕیزەکانی سەربازی ئامادە نەبوون لەڕیزەکانی سوپادا مێننەوەو خۆیان لەو شەڕەدا بەکوشتن بدەن لە جیاتی ئەوە پەیوەندیان دەکرد بەشۆڕشەوەو دەبوونە پێشمەرگە، هەندێکیان چەکەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا بەمەش ژمارەی هێزەکانی پێشمەرگە چەندین هێندەی جاران زیادی کرد کە بەشێکان دەرچووی زانکۆو پەیمانگاو کۆلیژە سەربازیەکان بوون و خاوەنی شارەزاییەکی باشی بواری سەربازی و کاری چەکداری بوون. هەروەها لەڕووی ڕێکخراوەیی و تەنزیمیشەوە بەهۆی خافڵان و تێوەگلانی دەوڵەتی عێراق لە شەڕێکی درێژخایەن ، یەکێتی توانی گەشەیەکی بەرچاو بەخۆوە ببینێت و دەستی بگات بەناوەندی شارە گەورەکان و هەزاران کەس ڕاکێشێتە ناو ڕێکخستنە نهێنیەکان و لەکاتی پێویستدا بەکاریان بهێنێت.

لەماوەی دوو ساڵی جەنگی ئەو دوو وڵاتە ژمارەی هێزی پێشمەرگە گەیشتە نزیک ٢٥٠٠ بەمەش یەکێتی ناچار بوو لە تەشکیلەی نوێدا جێیان بکاتەوەو ڕێکیان بخات، ناوی

هەرێمەکانی گۆڕی و کردی بەتیپ، سەرەتا بۆ هەر پارێزگایەك تیپێکی دروست کرد بۆ نموونە بۆ پارێزگای سلێمانی تیپی ۳۳ ی سلێمانی و بۆ پارێزگای هەولێر تیپی ۸٦ی دەشتی هەولێرو بۆ پارێزگای کەرکووك تیپی ۲۱ ی کەرکووکی دروست کرد، بەڵام بەهۆی زیاد بوونی ژمارەی هێزەکانی پێشمەرگە ژمارەی تیپەکانیش زیادی کرد بەجۆرێك بۆ هەر ناوچەیەکی دیاریکراو تیپێکی دروست کردو ناوی تیپە نوێیەکان بەناوی شاخ و دەشتەکانەوە دەنرا، بۆ نموونە تیپی ٥۷ ی سەگرمەو تیپی ۹۱ ی سەفین و تیپی ۸٥ ی بەڕانەتی و تیپی ۹۹ ی بیتوێن.

سەرەتای هەشتاکان ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی لە تیپی پارێزگاکان رێکخرابوون لە نێوان ۲۰۰ بۆ ۲٥۰ پێشمەرگە دەبوون بەڵام لەگەڵ زیاد بوونی ژمارەی هێزی پێشمەرگەو ژمارەی تیپەکان، ژمارەی ئەو کەسانەش گۆڕانکاری بەسەردا هات کە لە تیپەکاندا رێکدەخران، بۆ نموونە چەندین تیپی نوێ کرایەوە بەڵام ژمارەی پێشمەرگە لە هەر تیپێکدا کرا بە ۱٥۰ تا ۲۰۰ پێشمەرگە، هەر تیپێکیش سنورێکی بۆ دیاری کرا، واتە لەسنوری جوگرافی هەر پارێزگایەك چەندین تیپی نوێ دامەزرا بۆ نموونە تەنها لە سنوری پارێزگای هەولێر جگە لە تیپی دایك تیپەکانی ۸۷ ی قەرەچووغ و ۹۳ کۆیەو ۸٥ ی بەڕانەتی و ۷۸ی کارۆخ و ۷٤ی باڵەك و ۸۳ی هەورێ و

١٩ی کوڕەك و ٩١ی سەفین و ٩٠ی باواجی دروستکران، هەیئەتی تیپ بریتی بوو لە فەرماندەی تیپ و جێگری فەرماندەی تیپ و ڕابەری سیاسی تیپ و سێ تا پێنج فەرماندەی کەرت، بەم دواییە بەرپرسارێتیەکی تریشیان لە هەیئەی تیپ زیاد کردو ناویان نا کادری کۆمەڵایەتی کە زیاتر کاری ئەوە بوو کێشە کۆمەڵایەتیەکان ببینێت و چارەسەریان بکات، هەرچەندە لەسەرەتای هەشتاکان لە مەڵبەندەکانیش دادگای شۆڕشیان کردەوە کە تایبەت بوو بەدادگایی کردنی تاوانباران و یەکالا کردنەوەی کێشە کۆمەڵایەتیەکان ، دادوەرەکان جار جار لەگەڵ تیپەکاندا جەولەیان دەکرد بەمەبەستی لەنزیکەوە بینینی کێشەکان و وەگرتنی زانیاری پێویست . لە بارەی دادوەرەکانی شۆڕشەوە حاکم پێشڕەو سەید برایم کە خۆی یەکێك بوە لە دادوەرەکانی شۆڕش ئەم پرسیارانەم ئاراستە کرد :

پرسیار: ئایا دادگای شۆڕش کەی دامەزرا ؟

وەڵام : لە ڕێککەوتی ١-١١-١٩٧٩ دوای سێ کۆبوونەوە لەنێوان مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و هەڤاڵ مام جەلال بڕیار درا بە دامەزراندنی دادگای شۆڕش.

پرسیار : مەبەست لە دامەزراندنی دادگای شۆڕش چی بوو ؟

وەڵام : مەبەستەکانی شۆڕش لە دامەزراندنی دادگا زۆر بوون لەوانە :

١-بەدامەزراوەیی کردنی شۆڕش ' دوای ئەوەی گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆوە بینی.

٢-دەست تێوەرنەدانی هێزی پێشمەرگە لە کاروبارو ژیانی خەڵك.

٣-کەم کردنەوەی سەرپێچیەکانی هێزی پێشمەرگە.

٤-بەرقەرار کردنی جۆرێك لەدادگەری و گەڕاندنەوەی ماف بۆ خاوەنەکەی.

پرسیار: ئایا دادگای شۆڕش ئەو تاوانانەی دەبینی کە لە ناو هێزی پێشمەرگە ڕوویدەدا ؟ بە واتایەکی تر ئەو فەرماندەو پێشمەرگانەی دادگایی دەکرد کە توشی تاوان کردن و لادان و لاساری دەبوون ؟

وەڵام: هەر تاوان و کەتن و سەرپێچیەك ڕوویبدایە بەمەرجێك کەیسەکەی بگەیشتایەتە دادگای شۆڕش ' بێگومان دادگا کاری لەسەر دەکرد، بۆ نموونە لە زستانی ساڵی ١٩٨٠ پێشمەرگەیەك تۆمەتبار کرا بە خواردنی حەبی گێژ بوون, دادگا دوای

دادگایی کرن بڕیاری دا ئەو پێشمەرگەیە لە ڕیزەکانی شۆڕش دەربکرێت، هەروەها یەکێك لەبەرپرسانی هێزی پێشمەرگە بێ هیچ بڕیارێك پارەی لە خەڵك کۆکردبووەوە ' بۆیە دادگا بڕیاریدا هەموو پارەکەی لێ بسەندرێتەوە .

پرسیار : ئایا دادگای شۆڕش کەیسی سیاسی دەبینی ؟ مەبەستم ئەوەیە لەسەر جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی کەسی دادگایی دەکرد ؟

وەڵام : لەسەر بەعسی بوون و کار کردن بۆ حزبی بەعس بەڵێ خەڵك دادگایی کراوە، لەناو خودی یەکێتیش لە نێوان هەردوو باڵەکەیدا کێشە هەبووەو دژایەتی یەکتریان کردوە بەڵام وەك کێشەی کەسێتی ' هاتۆتە دادگا[1].

هەموو کەرتەکان لەژێر دسپلین و پابەند بوون بە فەرمانداری و ڕاسپاردەی هەیئەتی تیپ لەسەروویانەوە فەرماندەی تیپ دا خۆیان دەبینیەوە، هەرچەندە کەرت و هەیئەتی کەرتیش جۆرێك لە سەربەخۆیی لە چالاکی و کاری تەنزیمی و جەولەی پێشمەرگانەیان هەبوو .

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ پێشڕەو سەید برایم لە ڕێککەوتی ١١-١٢-٢٠٢٠ . ناوی تەواوی پێشڕەو سەید ئیبراهیمە، لە ڕێککەوتی ٤-٧-١٩٥٥ لەشاری کۆیە لەدایك بوە، دەرچوی زانکۆی بەغدا- کۆلیژی یاساو ڕامیارییە، لەساڵی ١٩٧٩ بۆتە پێشمەرگە لە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و یەکەم دادوەری شۆڕش بوە کە فەرمی سەرکردایەتی شۆڕش فەرمانی بۆ دەرکردوە، ئێستا لە وڵاتی ئەڵمانیا نیشتەجێیە.

بەهـۆی زیـاد بوونـی ژمـارەی ئەوانـەی ڕوویـان لەشـاخ و شـۆڕش دەکـردو دەبـوون بەپێشـمەرگە ژمـارەی تیپەکانیـش چەندین هێندە زیـادی کـرد بەجۆرێـك تـا کاتی گفتوگـۆی نێوان حکومەت و شـۆڕش لـە سـاڵی ١٩٨٤ ژمـارەی تیپـەکان لەپانـزە تیـپ تێپـەڕی، پەیکـەری هـەر تیپێـك بریتـی بـوو لـە دوو تـا چـوار کـەرت، هـەر کەرتێکیـش بریتـی بـوو لـە دوو تـا چـوار مەفـرەزە ، هـەر مەفرەزەیەکیـش بریتـی بـوو لـە پانـزە تـا سـی پێشـمەرگە، هەرچەنـدە هەمـوو تیپـەکان لـە ژمـارەی کـەرت و مەفـرەزەو ژمـارەی پێشـمەرگەکان وەك یـەك نەبـوون و دەتوانـم بڵێـم جیاوازیـان هەبـوە بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی تەشـکیلەو ژمارەیـان لـە یەکـترەوە نزیـك بـوو.

لـەدوای سـاڵی ١٩٨٣ هێرشـە زەمینیەکانـی سـوپای ئێـران بـۆ سـەر ئـەو ناوچـەو شـارانەی کـە لەسـەرەتای جەنـگ لەدەسـتی دابـوو زیـادی کـرد تـا ئـەو ئاسـتەی دەوڵەتـی عێـراق بەشـێك لـەو ناوچـەو شـارانە لەدەسـت بـدات کـە لەسـەرەتای لەشکرکێشـیەکانی داگیـری کردبـوو ، بۆیـە وەزارەتـی بەرگـری عێراقـی ناچـار کـرد زۆربـەی یەکـە سـەربازیەکانی لـە هەرێمـی کوردسـتان بـەرەو بەرەکانـی باشـوورو ئـەو ناوچانـە بگوازێتـەوە کـە فشـاری سـوپای ئێرانـی لەسـەر بـوو، بـەر لەجەنـگ حکومـەت مۆڵگـەو سـەربازگەو ڕەبیەکانـی لـە دەوروبـەری زۆربـەی دێهاتەکانـی کوردسـتان

دانابوو بۆ ئەوەی هەم لە نزیکەوە چاودێری خەڵك بكات هەم پێشمەرگە نەتوانێت بۆ نان خواردن و پشوودان و پێداویستیەکانیان و پەیوەندی بەستن بێنە ناو گوندەکان بەڵام کە جەنگی هەردوو وڵات تین و تاوی سەند نەك هەر لە دێهاتەکان بەڵکو لە دەوربەری شارەکانیش هێزە سەربازیەکانی کەم کردەوە بەمەش دەستی هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانی زیاتر ئاوەڵا کرد تا شێوەی خەبات و تێکۆشان و ئالیەتی خەباتی پێشمەرگانە بگۆڕێت بە جۆرێکی ترو لە حاڵەتی بەرگریەوە بگوازێتەوە بۆ حاڵەتی هێرش بردن و شێوەی هێزەکەی لەپارتیزانیەوە بگۆڕێت بۆ هێزێکی نیمچە ئاشکرا.

درێژە کێشانی جەنگی عێراق-ئێران و بەهێز بوونی شۆڕش و زیاد بوونی ژمارەی چالاکیەکانیان پاڵنەرو فاکتەری هەرە سەرەکی بوو تاکو حکومەتی بەعس گرنگی زیاتر بدات بە کردنەوەی فەوجی جاش و پڕچەك کردنیان، تا ساڵی ١٩٨٠ش ژمارەی مەفرەزەو یەکەکانی جاش نەدەگەیشتە سی و پێنج یەکە بەڵام لەدوای هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێ و زیاد بوونی چالاکیەکانیان ژمارەی یەکەو فەوجەکانی جاش گەیشتە دوو هێندەی جاران بەچەشنێك لەساڵی ١٩٨٨ ژمارەی فەوجی چەکدارە هەڵخەڵەتێنراوە کوردەکان گەیشتە پێنج سەد فەوج

کـە ژمـارەی چەکدارەکانیـان لـە نێـوان ٢٥٠ تـا ٥٠٠ کـەس و هەندێـك لـە فەوجەکانیـش دەگەیشـتە هـەزار کـەس. هۆکارەکانـی زیـاد بوونـی ژمـارەی جـاش لـە دوو خاڵـدا کـۆ دەکەمـەوە :

یەکـەم : بانگهێشـت کردنـی چەندیـن موالیـد بـۆ ڕیزەکانـی سـوپا و ئامـادە کردنیـان بـۆ جەنگـی ئێـران، بەشـێك لەوانـەی کـورد بـوون ، بـۆ ژیانـی خۆیـان جاشـایەتیان پـێ سـەلامەت تـر بـوو لـە سـەربازی .

دووەم : ململانـێ و شـەڕی براکـوژی هێـزو لایەنەکانـی کوردسـتان و خراپـی ڕەفتـاری بەشـێك لـە فەرماندەکانـی شـۆڕش و هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتان .

حکومەتـی بەعـس فـەوج و مەفرەزە تایبەتیەکانی جاشـەکانی بەکار هێنـا بـۆ بەگژاچوونەوەی شـۆڕش و پڕ کردنەوەی ئەو سـەربازگانەی کـە لەئەنجامـی هەڵگیرسـانی جەنـگ بەجێـی هێشـتبوو، هەروەهـا لەدەوروبـەری شـارو شـارۆچکەکان مۆڵگـەو بـارەگای بـۆ کردنـەوە تاکـو ڕێ لـە هاتوچونـی پێشـمەرگە بگـرن بـۆ نـاو شـارەکان. ناکرێـت ڕۆڵـی ئیجابیانـەی بەشـێك لەسـەرۆك جـاش و فەرمانـدەی سریـەو بەشـێك لەجاشـەکان نادیـدە بکرێـت چونکـە بەشـێکیان بەکـردار هـاوکاری شـۆڕش و پێشـمەرگە بـوون، بەناردنـی چـەك و فیشـەك و خـۆراك و پەنـا دانـی چەندیـن پێشـمەرگەی برینـدار جـا هـۆکاری ئـەم هاوکاریـە هەرچیـەك بوبێـت.

لەماوەی سێ ساڵی یەکەمی جەنگی عێراق-ئێراندا هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان لە چەندین شوێن توشی پێکدادانی توند و هێرش و پەلامارو کەوتنە بۆسەو شەڕی دەستەویەخە بوون لەگەڵ سوپاو هێزە نانیزامیەکانی حکومەتداو جەنگین لەگەڵ باڵەفڕدا، بۆ سەرکردایەتی شۆڕش دەرکەوت تواناو ئازایەتی هێزی پێشمەرگە زۆر زیاترە لەتواناو ئازایەتی سەربازو هێزە چەکدارەکانی حکومەت، بۆیە سەرکردایەتی بیری لە فروان کردن و زیاد کردنی چالاکی و هێرش و پەلاماردانی مۆڵگەو دامودەزگا سەربازی و ئەمنی و حکومیەکان کردەوە، لە ماوەی ساڵانی ١٩٨١ بۆ ١٩٨٤ سەدان سەربازگەو ڕەبیەی جاش و سەربازو جەیشی شەعبی و دەیان دامەزراوەی حکومی لە سەرویانەوە دەزگا ئەمنی و سەربازیەکانیان کەوتنە بەر لێدان و پەلامارو گرتن، بەمەش حکومەتی بەعس توانای هێزی پێشمەرگەو یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانی بۆ دەرکەوت و لەو ڕاستیە تێگەیشت کە هێزەکانی ' توانای وڵامدانەوەی هێزی پێشمەرگەی نیە یان هەشبێت زۆر لاوازەو پێشبینی دەکرد هێرش و پەلامارەکان بگەنە ناوەندی شارە گەورەکان و دەسەڵاتی بەشێك لە شارو شارۆچکەکانی کوردستان لە دەست بدات، بۆیە حکومەت هەوڵی ڕاگرتنی شەڕو دەستپێکردنی گفتوگۆیدا لەگەڵ یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، گفتوگۆی

یەکێتیی - بەعس لە ڕێگەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ( حدکا، بەتایبەتی د.قاسملو ) دەستی پێ کرد[1]، دکتۆر قاسملوو ڕۆڵی بەرچاوی بینی لە ڕێکخستنی گفتوگۆو نزیک خستنەوەی بۆچوونی هەردوولا بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن.

بۆ ئەو کاتەو بۆ حکومەتی بەعس گفتوگۆ باشترین چارەسەر بوو تا بەرەی جەنگی کورد-بەغدا ڕاگرێت و دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ یەکێتیی بکاتەوەو قورسایی جەنگ لەسەر شانی خۆی کەم بکاتەوە بەتایبەتی لەو کاتانەدا دەوڵەتی ئێران لە خۆ ئامادە کردندا بوو بۆ گرتنی فاو، چونکە جگە لە هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان هیچ هێزێکی تری پارتە کوردیەکان خاوەنی قورسایی سەربازی و توانای جەنگینیان نەبوو لەگەڵ بەعسدا، هەر بۆیەش بەعسیەکان گەر بیانویستایە شەڕی کورد-بەغدا ڕابگرن دەبوو گفتوگۆ لەگەڵ یەکێتیی بکەن نەك پارتەکانی تر، لەهەمان کاتدا بۆ یەکێتیش ڕاگرتنی شەڕ بەپێویست دەزانرا چونکە لە لایەك پەیوەندی یەکێتیی و ئێران بەتەواوی تێکچووبوو بە هۆی پشتیوانی کردنی یەکێتی لەجوڵانەوەی ڕزگاری خوازی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ناردنی هێز بۆ بەرەنگار بوونەوەی

---

١- نەوشیروان مستەفا: خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٨٤-١٩٨٨ ، ل٧

سـوپای ئێـران لـە ناوچـەو شـارەکانی کوردسـتان، لەلایەکـی تـر تێوەگلابـوو لـە شـەڕی بـەرەی جـوود، لەلایەکـی تریـش پەیوەنـدی یەکێتیـی و تورکیـا زۆر ئاڵـۆزو خـراپ بـوو، لـەو کاتـەدا یەکێتـی تەنهـا لەگـەڵ دەوڵەتـی سـوریاو لیبیـا پەیوەنـدی بـاش بـوو بـەڵام بەهـۆی بەربەسـتی جوگرافـی نەیدەتوانـی زۆر سـوود لەباشـی پەیوەندیەکانـی لەگـەڵ ئـەم دوو وڵاتـە وەرگرێـت، وێڕای ئەمانـەش هێـزی پێشـمەرگەی یەکێتـی لەیـەك کاتـدا لەشـەڕ دا بـوو لەگـەڵ سـوپای عێـراق و سـوپای ئێـران و تـەواوی هێـزە ناوخۆییەکانـی کوردسـتان کـە لەبـەرەی جـوود دا خۆیـان کـۆ کردبـوەوە. بەکورتـی یەکێتـی بەقـەد حکومەتـی عێـراق پێویسـتی بـە ڕاگرتنـی شـەڕ هەبـوو.

گفتوگـۆی نێـوان یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان و حکومەتـی عێـراق نزیـك چـواردە مانگـی خایانـد، لـەو ماوەیـەدا پێشـمەرگەو فەرمانـدەکان بەئاسـانی و بـێ ڕێگریەکـی ئەوتـۆ هاتوچـۆی نـاو شـاریان کـرد بەمەبەسـتی سـەردانی کردنی کەسـوکاریان و بەشـداری کـردن لەخۆشـی و ناخۆشـیەکانیان , بەمـەش هێـزی پێشـمەرگە تێکـەڵاوی ژیانـی شـارو خۆشـی و ڕەفاهیـەت و لەزەتـی شـار بـوو و بەشـێکیان کەسـوکاریان پاشـگەزیان کردنـەوە لەپێشـمەرگایەتی و دوای تێکچونـی گفتوگـۆ خۆیـان تەسـلیم کـردەوە، بەشێکیشـیان دوای هەڵوەشـانەوەی گفتوگـۆ کەوتنـە ژێـر کاریگـەری شـێوە

ڕفتاری جاشی ' کە خۆی دەبینیەوە لە زوڵم و خو و ڕەوشتی خراپ و نابەجێ و دزی و تاڵان کردن و دوای دەست پێکردنەوەی شەڕ لە ڕفتارو هەڵسووکەوتیاندا ڕەنگی دایەوە.

# لەچڵکنە چی ڕوویدا؟

بەستی شـەرغە لەسـەر نەخشـەی عێـراق بـە ڕووبـاری وەرزی نـاوی هاتـوە، سـەرچاوەکەی کەوتۆتـە تەپۆلکـە بـەرزو نزمەکانـی ناحیـەی دێگەڵـەو ئـاوی بارانـی تـەواوی سـنوری ناحیەکـە دێتـەوە بەسـتی شـەرغە، درێـژی بەستەکە لـە ناحیـەی دێگەڵـەوە تـا ڕۆخـی زێـی بچـووك دەگاتـە ٢٧ کـم، ئـەو گوندانـەی دەکەونـە سـەر بەسـتی شــەرغە لەبــەری ڕۆژئــاوای بریتیــن لــە گوندەکانــی بانەقەڵاتــی گـەردی ( سـەیدان)، بانەقەڵاتی شـێخان، بەردبڕ، بەلەبان، بەردەسـپی، کانــی سـلێمانە. هەروەهــا لەبــەری ڕۆژهەڵاتیشـیەوە گوندەکانــی میرکـە، نێرەگیـن، سـارتك .

چڵکنـە هەورازێکـی ڕکـە تەنهـا یـەك کیلۆمەتـر کەوتۆتـە سـەرووی زێــی بچووکــەوە، ڕێگاکــە بەناوەڕاســتی گردێکــی گــەورەدا تێدەپەڕێـت و بەسـتی شـەرغە دەبەسـتێتەوە بـە جـادەی نێـوان هـەردوو گونـدی ئاوماڵ-سـارتك، جادەکـە لەناحیـەی تـەق تەقـەوە دێــت و درێــژ دەبێتــەوە بــۆ گوندەکانــی گەرمــك، کانــی لەلــە، ئۆمەرگومبــەت، ناحیــەی ســێگردکان، ســێکانی، تــازەدێ، ئاومــاڵ، سـارتك، قەشـقە، خوڕخـوڕ، چۆمەزەردەڵـەی سـەروو، چۆمەزەردەڵـەی خـواروو، ناحیـەی پـردێ( ئاڵتـوون کۆپـری).

جاده قیرتاوەکە بەهاوبەشی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ڕێگاوبانی هەولێر و کەرکووك لە ساڵی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ دەست کرا بە دروست کردنی، کردنەوەی ئەم ڕێگایە بەشێك بوو لەپلانە سیاسی و ستراتیژیەکەی حکومەتی عێراق کە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی شۆڕش دایڕشتبوو، مەبەستیش لەدروست کردنی ئەوە بوو تا سوپای عێراق بتوانێت بەئاسانی دەستی بگات بەهەموو لایەکی ناوچەکەو بەکاری بهێنێت بۆ کێومال کردن و ڕووبەڕوو بونەوەی هێزی پێشمەرگە، بەڵام شەڕی عێراق- ئێران لە ئەیلوولی ١٩٨٠ بواری تەواو کردنی قیرتاوەکەی نەدا ' تەنها تا ناحیەی سێگردکان بەشێوەی پچڕ پچڕ تەواو کرا ئەوەی تر تێکەڵە ڕێژ کرا.

شەڕەکەی چلکنە بە شەهید بوونی سێ پێشمەرگەو کوژران و بریندار بوونی چەندین سەرباز کۆتایی هات، ڕووداوێك بوو فەرماندەی کەرت و تیپی بەئاگا هێنایەوە لەوەی هێزەکانی حکومەتی عێراق دەتوانن بە باڵەفڕ زیانی گەورە بە هێزی پێشمەرگە بگەیەنن گەر ڕەچاوی بەهێزی دووژمن نەکەن، لەبارەی ووردەکاری ئەم ڕووداوە هاشم حەمەدەمین زانیاری ووردی لا بوو، گوتی: بەیانی ڕۆژی ٨-٨-١٩٨٢ شەهید ئەحمەد قەمبەری منی ڕاسپارد تا بەتوێتا پیکابێکی کەرتەکەمان بچمە نزیك گوندی چۆمەزەردەڵە لەنزیك ناحیەی پردێ بۆ ئەوەی

زانیاری لەسەر پۆلیس و چەکدارەکانی حکومەت کۆ بکەمەوە کەپارێزگاریان لە هێڵی شەمندەفەر دەکرد بە مەبەستی ئەوەی نەخشەی گرتنی بنکە سەربازیەکە دارێژین، بەرگی مەدەنیم کردە بەرو ویستم لەحاوی سارتکەوە بکەومە ڕێ، کاتێك دوو پێشمەرگەی کەرتی یەك بەپیکابێکی داتسۆن لە بەستی شەرغە پەڕینەوەو بە ئاراستەی ئێمە هاتن، پاش هەواڵ پرسینی یەکتر ' بۆم دەرکەوت ئەو بەیانیە پیکابە داتسۆنەکەیان لە هەولێر ڕفاندوە کە سەیارەی فەرمانگەی کارەبای هەولێر بوو، هێندەی پێ نەچوو دوو کۆپتەری هێرشبەر بۆ ناوچەکە هاتن بە مەبەستی دۆزینەوەی پێکابە ڕفێنراوەکە، هەر ئەوەندەم پێ کرا توێتاکەی خۆمان ڕاگرم و خۆم بشارمەوە، کۆپتەرەکان زۆر نەوی بوون و دەگەڕان و دەسوڕان و دەچوونە سەر هەر سەیارەیەك کە لەئاسمانەوە بیانبینیایە، هاتنە سەر توێتاکەی ئێمە بەلام کە زانیان داتسۆن نیە ڕۆیشتن و لە جەولەو گەڕان بەردەوام بوون ' من لەبەر کۆپتەرەکان نەمتوانی بچمە چۆمەزەردەڵە چونکە بەردەوام لەنێوان ناحیەی پردێ و سێگرتکان و ناوچەکە بەگشتی لە گەڕان و سوڕاندا بوون، هەواڵ وا بڵاو بوەوە کە کۆپتەرەکان لەچەند شوێنێك نیشتوونەتەوە و تەقەیان لە خەڵك کردوە، کە هەواڵەکە دەگاتە شەهید ئەحمەد ترسی لەوە دەبێت کۆپتەرەکان تەقەیان لە من کردبێت، ئەویش سێ پێشمەرگە

بەناوەکانی وریا تەلخێمی و ڕێباز خەزنەیی و وشیار ئیلنجاغی بە سەیارەیەکەوە دەنێرێت بۆ تاقیبی من تا بزانێت سەلامەتم یان نا، ئەوان لەگوندی بەردەسپەوە دێن و دەیانەوێت بێنە گوندی سارتك تا هەواڵی منیان دەست بکەوێت، لە بەستی شەرغە دێنە هەورازی چڵکنەو دەیانەوێت لەوێوە بێن بەڵام دوو کۆپتەریان لێ پەیدا دەبێت و دەسڕێژیان لێ دەکەن و سەیارەکە وەردەگەڕێت، سێ پێشمەرگەکە سەرەڕای ئەوەی بە وەرگەڕانی سەیارەکەو تەقەی کۆپتەرەکان بریندار دەبن شەڕێکی زۆر باشیان کردبوو بەڵام بەداخەوە دواجار هەرسێکیان شەهید بوون و تەرمەکانیشیان گوازرانەوە بۆ فرقەی کەرکووك، لەگەڵ ئەم ڕووداوەداو لەهەمان کاتدا دوو یان سێ هاوڵاتی بە تراکتۆر بەرهەمی کشتووکاڵی دەبەن بۆ ناحیەی پردێ ئەوانیش گیران و بەکۆپتەرەکان گوازرانەوەو تا ئێستاش شوێن بزر کراون، پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵی ڕووداوەکە من لەسارتکەوە چوومە چڵکنە ' شەهید ئەحمەدو پێشمەرگەکانی تریش لە گوندی کانی سولێمانەوە هاتنە شوێنی ڕووداوەکە، سەیارەکەمان بێکەڵك بوو بوو بۆیە دواتر خۆمان سوتاندمان، هەموومان بەشەهید ئەحمەدیشەوە زۆر نیگەران بوین لەو ڕووداوە، هەر لەوێ شەهید ئەحمەد سوێندی خوارد کە تۆڵەی شەهیدبونیان بکاتەوە[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ هاشم حمدامین ڕەسووڵ لەبەرواری ٦-٢-٢٠١٩

جەوهەر ئۆمەر هاولاتیەکی شایەتحاڵە کەخۆی لەو شەڕەدا برینـدار بـوەو تـەواوی شـەڕەکەی بەچـاوی خـۆی بینیـوە ' ڕووداوەکەی بەم شێوەیە گێڕایەوە : دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ٨-٨-١٩٨٢ مـن و کەریمی مام سمایل لەدەشتی سێگردکانەوە بـە تراکتۆرەکەی ئێمە بەرەو ناحیەی پردێ بەڕێکەوتین کە بارێك خەیارمان دەبرد بۆ ئەوەی لە عەلوەی پردێ بیفرۆشین، لـە هەورازی چڵکنە شۆڕ بووینەوە بۆ ناو بەستی شەرغە بەڵام لەناوەڕاستی هەورازەکە ئۆتۆمبیلێکی کەرتی (دوو)مان بینی کە لـە جۆری پیکاب-داتسۆن بوو بەهەمان ڕێگا ( لەبەستەکەوە بە هەورازی چڵکنە ) سەردەکەوت بەرەو سارتك دەهات ' لەهەمان دەقیقەدا دوو کۆپتەری جەنگی و کۆپتەرێکی بارهەڵگرمان بینی بەخێرایی بەئاراستەی ئێمە دەهاتن، پێدەچوو ئۆتۆمبیلی پێشمەرگەکان وەك ئێمە کۆپتەرەکانیان بینیبێت بۆیە بەخێرایی ویستیان لەهەورازەکە سەرکەون بەڵام کە گەیشتنە ناوەڕاستی هەورازەکە لە نزیك ئێمە ئۆتۆمبیلەکەیان کوژایەوەو چەند مەترێك کشایەوە دواوە ئنجا ئۆتۆمبیلەکە لەسەر تەنیشت وەرگەڕا، کۆپتەرە بارهەڵگرەکە لـە گۆڕەپانێك نیشتەوەو سەربازەکانی داگرت، دوو لەپێشمەرگەکان جامی سەیارەکەیان شکاندو هاتنە دەرەوە کاتێك سەربازەکان بەکۆمەڵ بەرەو ڕوویان هاتن و ویستیان بەبێ تەقە بیانگرن

بـەڵام هـەردوو پێشـمەرگەکە لەپەنـای سـەیارەکە لێـی دامـەزران ، دەسـڕێژیان خسـتە نـاو سـەربازەکان و دوانیـان کـوژران و شـەڕ دامـەزرا، کۆپتـەرە جەنگیەکانیـش کەوتنـە تەقـە کـردن و یەکیـان هاتـە دیـار تراکتۆرەکـەی ئێمـە ، هەسـتم کـرد دەیەوێـت تەقەمـان لـێ بـکات هەرچەنـدە چەفیەیەکـی سـپیم هەڵـدا کـە ئامـاژە بـوو بـۆ ئـەوەی تێیانبگەیەنـم ئێمـە هاوڵاتیـن بـەڵام بێسـوود بـوو، بەپەلـە خۆمـان فڕێدایـە خـوارەوەو لەپەنـای تراکتۆرەکـە خۆمـان مـات کـرد ، کاتێـك کۆپتەرەکـە لەتراکتۆەکـەی ئێمـەی دا ، لەئەنجامـدا مـن و کەریـم برینـدار بوویـن، لەهەمـوو لایەکـەوە تەقـە دەکـرا ، نیـو کاتژمێـر زیاتـر شـەڕ بـوو ، لـە ئاکامـدا هـەر سـێ پێشـمەرگەکە کـە بریتـی بـوون لـە وریـا تەلخێمـی، ڕێبـاز خەزنەیـی، وشـیار ئیلنجاغـی شـەهید بـوون، پێشـمەرگەکانی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری ئازایەتیەکـی کەموێنەیـان نوانـد کـە لەگـەڵ گەلـە سـەربازێك نیـو کاتژمێـر کەوتنـە شـەڕەوە، ئـەوەی کـە زۆر کاری لـێ کردیـن ئـەوە بـوو سـەربازەکان داخـی دڵـی خۆیـان بـە تەرمـەکان هەڵڕشـت و هـەر سـێ تەرمەکەیـان دایـە بـەر فیشـەك ، دواتـر ئـەو جوتیارانەیـان بانـگ کـرد کـە لـە هەورازەکـە ڕێیـان لـێ گیرابـوو و تەرمەکانیـان بـەوان خسـتە نـاو کۆپتەرەکـەو ڕۆیشـتن، دواتـر کاك عەبـدوڵای مـام برایـم بەسـەیارەی خـۆی ئێمـەی بـردە نەخۆشـخانەی پـردێ بـەڵام لـەوێ

لەجیاتی چارەسەرو تەداوی کردنی برینەکانمان دەستگیر کراین و رەوانە کراین بۆ هەیئەی کەرکووك و بەبێ چارەسەر کردن زیندانی کراین، دوای دوو مانگ رەوانە کراین بۆ ئەمنی هەولێرو بەواسیتەیەکی زۆر پاش پێنج مانگ ئازاد کراین[1].

ئەکرەمی موهەندیس زانیاری خۆی لەسەر ئەم رووداوە خستە روو، سەبارەت بە رووداوەکە گوتی : لە رۆژی ٨-٨-١٩٨٢ ئێمە وەك پێشمەرگەکانی کەرتی دوو بە فەرماندەیی شەهید ئەحمەد قەمبەری لە گوندی بەردەسپی بووین، عەسری ئەو رۆژە شەهید ئەحمەد ' سێ پێشمەرگەی بەناوەکانی ( وریا تەلخێمی، رێباز خەزنەیی، ووشیار ئیلنجاغی) بە ئەرکێکەوە نارد بۆ گوندی سارتك، سێ پێشمەرگەکە بە توێتا پیکابێك رۆیشتن' ویستبویان لە چلّکنەوە برۆن بۆ سارتك، کە گەیشتبونە ناوقەدی هەورازەکەی چلّکنە دوو کۆپتەری شەرکەرو کۆپتەرێکی نەفەرهەلّگر گەیشتبونە سەریان، کۆپتەرەکان ویستبویان بەزندوویی بیانگرن بەلّام پێشمەرگەکان دەستیان کردبوو بە شەر، پاش چارەگێك لە شەرکردن هەر سێ پێشمەرگەکە شەهید بوون و لاشەکانیشیان بە کۆپتەرەکان گوازرانەوە بۆ فرقەی کەرکووك.

---

١- گفتوگۆ لەگەلّ جەوهەر نۆمەر لە رێککەوتی ١٤-٢-٢٠٢١

ئەکرەمی موهەندیس لەدرێژەی باسەکەیدا گوتی : دواتر تەواوی پێشمەرگەکان لەبەر جموجوڵی زۆری کۆپتەرەکان دوو دوو لە بەستی شەرغەوە بۆ شوێنی ڕووداوەکە ڕۆیشتین، وا ڕێککەوت من و کاك ئەحمەد قەمبەری پێکەوە بووین، کە گەیشتینە شوێنەکە تێبینی ئەوەمان لا دروست بوو کە دووژمن چەندین کوژراوی هەبوبێت لەو شەڕەدا چونکە لەدەوروبەری شوێنەکە خوێنێکی زۆر ڕژابوو، کاك ئەحمەد بە شەهید بونی ئەم سێ پێشمەرگەیە زۆر نیگەران و تووڕە بوو، ناوە ناوە دەیگوت خۆزگە من شەهید بام نەك ئەوان. دوای چەند ڕۆژێك لە شارەوە زانیاری گەیشتە سەرکردایەتی [1] کە لەو شەڕەدا حەوت سەربازی عێراقی کوژرابوون و لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان خوێندرایەوە. تووڕە بوون و نیگەرانی کاك ئەحمەد قەمبەری دانەدەمرکایەوەو بیری لەچالاکیەك کردەوە لەتۆڵەی ئەوان کە ڕۆژی دواتر لەگوندی ئۆمەرگومبەت داستانی تۆڵە تۆمار کرا[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ ئەکرەمی موهەندیس لە ڕێککەوتی ٩-٨-٢٠١٩

ناوی تەواوی ئەکرم ئەحمەد ڕەسووڵە، لەساڵی ١٩٥٧ لەگوندی (قۆڕیتان)ی دەشتی هەولێر لەدایك بوە، خێزاندارەو خاوەنی سێ منداڵە، دەرچووی کۆلیژی ئەندازیاری زانکۆی سلێمانیە لە ساڵی ١٩٨١، لەدوای تەواو کردنی کۆلیژ لە ١٠-٦-١٩٨٢ پەیوەندی دەکات بە هێزی پێشمەرگەوەو لە کەرتی دووی تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان دەبێت بە پێشمەرگە، ئێستا بەڕێوەبەری گشتی بەنداوەکانی هەرێمەو لەشاری هەولێر دەژی.

# داستانی تۆڵە چۆن تۆمار کرا؟

لە ٩-٨-١٩٨٢ گونـدی ئۆمەرگومبـەت بـوە گۆڕەپانـی تۆمـار کردنـی داسـتانێکی کـەم وێنـە کـە لـەو سـەردەمەدا هێـزی پێشـمەرگە خاوەنـی چـەك و تفاقـی سـەربازی سـادەو سـووك و کـەم فیشـەك و بـێ ئیمکانیـات بـوو، لەبەرانبـەردا حکومەتـی عێـراق خاوەنـی باشـترین سـوپای ڕاهێـنراو و پێشـکەوتووترین چـەك و تەکنەلۆژیـای سـەربازی بـوو لـە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت .

دوا بـەدوای کودەتـا سـەربازیەکەی سـاڵی ١٩٦٨ ، بەعسـیەکان لـە چوارچێـوەی توندوتـۆڵ کردنـی ئاسایشـی نەتەوەیـی و بـۆ بەهێـز کردنـی پێگـەی سـەربازی و سـوپایی خۆیـان لـە ناوچەکـە، هەروەهـا بـۆ ڕێگـە گرتـن لـە ئەگـەری دووبـارە بوونـەوەی کودەتـای سـەربازی تـرو لاواز کردنـی شـۆڕش و بەرهەڵسـتکارانی کـورد ، پـلان و بەرنامـەی میلیتاریـزە کردنـی عێراقیـان دارشـت و بەشـێکی زۆر لەداهاتـی ساڵانەی عێراقیـان خسـتە سـەر بودجـەی سـەربازی و چەندیـن گرێبەسـتی سـەربازیان واژۆ کـرد لەگـەڵ دەوڵەتانـی خـاوەن چـەك.

کاتێـك لـه سـاڵی ١٩٧٣ نرخـی نـەوت لـه بازاڕەکانـی جیهـان بـەرز بوونەوەیەکـی خێـرای بەخـۆوە بینـی ' دەوڵەتـی عێـراق هەلـی دەسـکەوت تـا زۆرتریـن نـەوت بنێرێتـه بـازاڕو زۆرتریـن پـاره کەڵەکـه بـکات و لەبـواری خۆپڕچـەك کـردن و میلیتاریـزه کردنـی وڵات بەکاریبهێنێـت، بـۆ ئەمـەش هەنگاوێکـی تـری نـا کـه بەخۆماڵـی کردنـی نـەوت دەسـتی پـێ کـرد و خـۆی لـه کـۆت و بەنـدی دەوڵەتـی بەریتانیـا دەرهێنـا و سـەرنجی وڵاتـه پێشـکەوتوەکانی جیهانـی ڕاکێشـاو دەیـان کۆمپانیـای بـواری نـەوت و دەرهێنـان و بەرهـەم هینانـی ڕاکێشـایه عێراقـەوە، بەمـەش دەوڵەتـی عێـراق دەرگای گەورەتریـن سـەرمایەو داهاتـی زۆرو زەوەنـدی لـێ کرایـەوە.

عێـراق لـه چوارچێـوەی پلانـه ئەمنـی و سـتراتیژیەکانی خۆیـدا بـێ گوێدانـه هەڵاوسـان و لاسـەنگی ژێرخانـی ئابـوری و لێکەوتـه خراپەکانـی ' بەپێچەوانـەی پرانسـیپه سـەربازیەکانی جیهـان و بەشـێوەی ناپەیژەیـی ژمـارەی هێـزه سـەربازیەکانی زیـاد کـرد، بـۆ ئەمـەش چەندیـن موالیـدی بانگهێشـت کـردو لـه ڕیزەکانـی سـوپادا ڕێکیخسـتن.

ئەگـەر ڕووبـەرو ژمـارەی دانیشـتوان و ژمـارەی هێزه سـەربازیەکانی عێراق بـەراورد بکەیـن بـه ڕووبـەرو ژمـارەی دانیشـتوان و ژمـارەی هێـزه سـەربازیەکانی هەریەکـه لـه دەوڵەتانـی ئێـران و سـعوودیه

ئـەوا جیـاوازی و لاسـەنگیەکی گـەورە دەبینیـن و مـەرام و نیەتـی خراپـی عێراقـمان بـۆ دەردەکەوێـت لـەم زیـاد کردنـی هێـزی سـەربازی و میلیتاریـزە کردنـەدا، بـۆ ئەمـەش سـەرژمێری سـاڵی ١٩٩٦ دەکەیـن بەپێـوەر. ژمـارەی دانیشـتوانی ئێـران (٦٢٥٠٩٠٠٠) کـەس بـوە، ژمارەی دانیشـتوانی سـعوودیە گەیشـتۆتە (٢٢٨٦٧٠٠٠) کـەس، ژمـارەی دانیشـتوانی عێراق گەیشـتۆتە (٢١٣٦٦٠٠٠) کەس[1]، هەروەهـا ڕووبـەری خاکـی ئێـران ( ١٦٢٢٠٠٠) کـم٢ و ڕووبـەری سـعوودیە ( ٢١٤٩٧٠٠ ) کـم٢ دەبێـت[2]، هەروەهـا ڕووبـەری عێـراق تەنهـا ( ٤٤٨٠٠٠ ) کـم٢ دەبێـت[3]. لەگـەڵ ئـەوەی ژمـارەی دانیشـتوان و ڕووبـەری عێـراق لـە ژمـارەی دانیشـتوان و ڕووبـەری هـەردوو وڵات کەمـترە کەچـی ژمـارەی هێـزە سـەربازیەکانی و چـەك و تفاقـی سـەربازی لـە هـەردوو وڵات زیاتـرە، بـۆ نموونـە ژمـارەی هێـزە سـەربازیەکانی ئێـران گەیشـتۆتە ٥١٣٠٠٠ سـەرباز، ژمـارەی هێـزە سـەربازیەکانی سـعوودیە گەیشـتۆتە ١٠٥٥٠٠ سـەرباز[4]، کەچـی ژمـارەی هێـزە سـەربازی و چـەك بەدەسـتەکانی عێـراق گەیشـتۆتە ٦١٨٠٠٠ کـەس[5]، ئەمـەش ئـەو ڕاسـتیە دووپـات

---

١- مسـتەفا عەلـەوی : عێـراق و تـەرازووی هێـزی سـتراتیجی لـە ناوچەکـە، گۆڤاری سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیجی، ژمـارە چـوار سـاڵی حەوتەم، ل٦٦

٢- عومـەر ڕەسـوڵ خـدر: ئابـوری عێـراق، ڕۆژنامـەی کوردسـتانی نـوێ ژمـارە ٢٩٠٢ لـە ٣٠-١٠-٢٠٠٢

٣- مستەفا عەلەوی: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣

٤- مستەفا عەلەوی: هەمان سەرچاوە

٥- جمعە کانی لەلەیی: کەرکووك لەبەردەم شاڵاوی بەعەرەب کردن دا، ل١٨

دەکاتەوە کە دەوڵەتی عێراق[١] بوون و سەروەری خۆی لە زیاد کردنی هێزە سەربازیەکانی دەبینیەوە، وێڕای ئەوەی هەردوو وڵاتی ئێران و سعوودیە لە بەرووبومی نەوت و هەناردە کردنی لە ڕیزبەندی پێشەوەی دە وڵاتە یەکەمەکەی جیهانن و دەوڵەتی عێراق لەو ڕووەوە لەوان کەمدەرامەت تر بوە.

دەوڵەتی عێراق لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا خاوەنی ٤٤ ملیۆن دۆلاری پارەی مۆڵ بوو، لەسەرەتای دەستپێکردنی جەنگی عێراق-ئێراندا و لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ پارەی مۆڵی عێراق کەم بوەوە بۆ ٣٦ ملیار دۆلارو ڕادەی قەرزەکانیشی تەنها دوو ملیۆن دۆلار بوە بەڵام بەهۆی زیاد کردنی خەرجیەکان و درێژە کیشانی جەنگ و زیادکردنی بوودجەو خەرجی جەنگ لە ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣ پارەی مۆڵ کراوی کەم دەبێتەوە بۆ شەش ملیار دۆلارو قەرزەکانیشی هەڵکشا بۆ حەڤدە ملیار دۆلار[١]. لە ناوەڕاستی هەشتاکان بەدواوە نەك هەر پارەی (مۆڵ)ی کەم بوەوە بەڵکو کەوتە ژێر باری قەرزاری کە زۆربەی قەرزەکان لەکڕینی فڕۆکەو هێلیکۆپتەر و تانك و زرێپۆش و چەك و تفاقی تری سەربازی بەکاری هێنا و لە ماوەی چوار ساڵدا ٣٨٠٠ زرێپۆش و ٢٧٠٠ تانك و ٣٨٠ فڕۆکەو ١٢٠ هێلیکۆپتەری کڕی، سەرەنجام تا ساڵی ١٩٩٠

---

١- سالار حەمەسوور باسیرە، جەنگی کەنداو هۆو ئەنجامەکانی، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی، ژمارە یەك، ساڵی دەیەم، شوباتی ٢٠٠٢، ل٤٥

قـەرزە کەڵەکـە بوەکانـی گەیشـتە ٨٠ ملیـار دۆلاری ئەمریکـی[1].

دەوڵەتـی عێـراق بەهـۆی پەلامـاردان و داگیرکردنـی کوەیتـی دراوسـێیەوە کۆدەنگـی نێودەوڵەتـی لەسـەر دروسـت بـوو کـە ئاکامەکـەی ئابلوقەدانـی ئابـووری و سـەربازیانەی لـێ کەوتـەوەو ئەنجومەنـی ئاسایشـی جیهـان بـە دەرچواندنـی چەندیـن یاسـاو بڕیارنامـە ئـەم ئابلوقەیـەی کـردە پێویسـتی ئـەو قۆناغـە کـە مەبەسـت لێـی لاواز کردنـی عێـراق و سـزادانی بـوو، بـەم هۆیـەوە عێـراق ڕێـگای فرۆشـتن و هەنـاردە کردنـی نەوتـی لـێ گیـراو بـڕی قەرزەکانـی تـا دەهـات زیـادی دەکـرد بـە جۆرێـك لەسـاڵی ١٩٩٤ قەرزەکانـی گەیشـتە ٨٦ ملیـار دۆلاری ئەمریکـی بـەم شـێوەیە ( ئەمریـکا ٢١ ملیـار، وڵاتانـی ئەوروپـای هاوبـەش ١٦ ملیـار، سـعوودیە ١٤ ملیـار، ئیماراتـی عەرەبـی یەکگرتـوو ٨ ملیـار، کوەیـت ١٤ ملیـار، یەکێتـی سـۆڤیەت ١٣ ملیـار) .

لەسـەرەتای هەشـتاکان ژمـارەی پێشـمەرگەکانی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان لـەدوو هـەزار پێشـمەرگە تێنەدەپـەڕی و چەکەکانـی دەستیشـیان تەنهـا بڕنـەو و کلاشـینکۆف و چەکـە قورسەکانیشـیان تەنهـا ئاربیجـی کۆن و بیکەیسـی ڕووسـی بوو ئەوانیـش بەژمارەیەکی کـەم و فیشـەکی کـەم .

---

١- سالار حەمەسوور باسیرە، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٦

سەرچاوەی بژێوی و باروبوی شۆڕش تەنها خەڵکی کوردستان بوو بەتایبەتی لادێنشینەکان، زۆربەی ئەوانەی دەبوون بەپێشمەرگە دەبوو چەکێك بۆ شۆڕش بکڕن، هەروەها دەوڵەمەندان بەپارە یارمەتی شۆڕشیان دەداو کەلوپەلی پێویستیان بۆ هێزی پێشمەرگە دەنارد وەك جلوبەرگ و خۆراك و داوو دەرمان و تەنانەت زۆر جار فیشەك و تفاقی سەربازیش.

هێزی پێشمەرگە بۆ نان خواردن دەچوونە مالان و لەوێش پێخەفیان وەردەگرت تا پێی بخەون، هەر لەوێش گەرم دەکرانەوەو خۆیان دەشووشت و لە ئەسپێ و ڕشك خاوێن دەکرانەوە، هەر ماڵیك ' هەر خێزانێك ' هەر جوتیارو ڕەنجبەرو شوان و گاوانێك بۆ پێشمەرگە سێبەرو پەناگەیەکی ئارام و باش بوو تا هەم لەسەرما و گەرما بیانپارێزن هەم سکی برسیان تێر بکەن، مزگەوتەکانیش بارەگایان بوو تا کۆڕو کۆبوونەوەی خۆیانی تیا ئەنجام بدەن و تیایدا پشوو بدەن و بخەون.

لەبەرانبەردا حکومەتی عێراق خاوەنی هەزاران سەربازو ئەمن و ئیستخبارات و جاسوس و جەیشی شەعبی و جاشی خۆماڵی بوو کەپاڵپشت بوون بە سەدان تانك و زرێپۆش و کۆپتەرو ئۆتۆمبیلی سەربازی مۆدرێن و هەزاران تۆپی قورس و چەکی نوێ و پێشکوتوو و بێتەل و ئامرازەکانی تری پەیوەندی کردن و گەیاندن و گواستنەوەو ملیۆنان فیشەکی هەمەچەشن و ملیۆنان

تـەن خۆراکـی جۆراوجـۆرو هـەزاران خێـوەت و هۆکارەکانـی حەوانـەوە. ئەوانـەی باسـم کـرد بەراوردێکی خێـرا بـوو لـە نێوان تواناکانـی سـوپای عێـراق و هێزەکانـی پێشـمەرگە.

لـەو ڕۆژگارەدا گونـدی ئۆمەرگومبـەت ١٣٥ خانـوی نیشـتەجێی هاوڵاتیانـی تیـا بـوو بـەڵام تەنهـا ١٦ خێـزان لەنـاو گوندەکـە مابوونـەوەو دەژیـان ' ئەوانـەی تـر ماڵیـان بـە شـێوەی کاتـی بردبـوە سـەر کێڵگـە کشـتوکاڵیەکان چونکـە لەوەرزی هاوینـدا بوون.

ئێـوارەی ڕۆژی ٨-٨-١٩٨٢ پێشـمەرگەکانی هـەردوو کەرتـی یـەك و دووی تیپـی ٨٦ ی دەشـتی هەولێـر لەژێـر فەرماندەیـی ئەحمـەد قەمبـەری و هـاوڕێ کاوە چوونـە گونـدی ئۆمەرگومبـەت، دواتـر مەفرەزەیەکیـان نـاردە گونـدی کانـی لەلـەو مەفرەزەیەکیشـیان نـاردە ماڵانـی دەم ڕووبـار، بەتەگبیـرو بەرنامـەی پێشـوەخت پێشـمەرگەکان لـە هـەردوو گونـد لەنـاو خەڵـك وا بڵاویـان کـردەوە کـە دەیانەوێـت بـۆ مـاوەی چەنـد ڕۆژێـك لـە ئۆمەرگومبـەت بمێننـەوە، مەبەسـت لـەم تەگبیـرەش ئـەوە بـوو تـا ئـەم هەواڵـە بـگات بـە حکومـەت و پەلامـاری گونـدی ئۆمەرگومبـەت بـدەن و هێـزی هـەردوو کەرتەکـەش ڕووبەڕویـان ببنـەوەو داسـتانێك تۆمـار بکـەن لـە تۆڵـەی ئـەو چەنـد شـەهیدەی هـەورازی چڵکنـە، هـەر ئـەو شـەوە پێشـمەرگەکانی هـەردوو کـەرت و مەفرەزەیەکـی خۆشـناوەتی لـە گـەرووی حەسـوونە لـە نێوان گونـدی کانـی لەلـەو

گەرمـك بۆسـەیەكیان دانـا. ئـەو شـەوە هیـچ ڕووینـەدا بـەڵام بەرەبەیانـی ٩-٨-١٩٨٢ لەگـەڵ تاریـك و ڕووونـدا حكومەتـی عێـراق بـە هێزێكـی گـەورەی سـەربازی كەپاڵپشـت بـوو بـە پێنـج كۆپتەرو شـەش ناقیلـەو چـوار زرێپـۆش و سـەدان سـەربازو جـاش و جەیشـی شـەعبی هەڵیكوتایـە سـەر گونـدی ئۆمەرگومبـەت و شـەڕ دامـەزرا .

بـەر لـە هێـرش و پەلامـاری سـوپا بـۆ نـاو گونـد ' كۆبونەوەیەكـی بەپەلـەی فەرمانـدەی كـەرت و مەفرەزەكانـی هـەردوو كـەرت ئەنجام دراو شـەهید ئەحمـەد قەمبەریـان وەك بەرپرسـی یەكـەم دیـاری كـرد، شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری بـەو شـارەزاییەی هەیبـوو لـە كاروبـاری پێشـمەرگەیی و چۆنیەتـی جەنگیـن و ڕووبـەڕو بونـەوەی دووژمـن ' هەمـوو پێشـمەرگەكانی دابـەش كـرد بەسـەر خانوەكانـی نـاو گونـد دا بەشـێوەیەك كـە بگونجێـت لەگـەڵ بـاری جوگرافـی و بـەرزی و نزمـی خانـوەكان و گـردو تەپۆلكەكانـی دەووبەریـان .

یـەك لـەو پێشـمەرگانەی بەشـداری داسـتانی تۆڵـە (شـەڕی ئۆمەرگومبـەت )ی كـردوە ئەكرەمـی موهەندیسـە، دەربـارەی داسـتانەكە گوتـی: دوای ڕووداوەكـەی چڵكنـە كـە تیایـدا سـێ پێشـمەرگەمان شـەهید كـرا لـە دوای تۆڵـە كردنـەوە دەگەڕایـن، لـەو كاتانـەدا دەنگـۆی ئـەوە هەبـوو كـە حكومـەت هێـرش دەكاتـە سـەر گوندەكانـی ڕۆژئـاوای تـەق تـەق، ئێمـەش ئەمەمـان بەدەرفـەت زانـی و ئێـوارەی هەشـتی ئابـی ١٩٨٢ هـەردوو كەرتـی

یەك و دوو لە نێوان گوندی كانی لەلەو تەق تەق تا بەرەبەیان بۆسەیەكمان دانایەوە بەو نیەتەی گەر حكومەت هێرش بهێنێت لەوێ لێی بدەین بەڵام نەهات، ئێمەش گەڕاینەوە ناو گوندی ئۆمەرگومبەت كەمێك بەر لە ڕۆژهەڵات ئنجا حكومەت هێرشی هێنا، هێزەكەی حكومەت لەهێزی تایبەت ( قوە خاصە ) و سەربازو جاش و ئەمن و ئستخبارات و چەندین باڵەفڕو زرێپۆش و كەتیبەی مەدفەعی پێكهاتبوو، تەواوی ژمارەی پێشمەرگەكانی هەردوو كەرت و مەفرەزەیەكی خۆشناوەتی نەدەگەیشتە شەشت پێشمەرگە، پاش كۆبونەوەیەكی بەپەلەو پێدانی تەوجیهات و ڕێنمایی پێویست ' بەسەر خانوەكانی گوند دا دابەش بووین و شەڕ دەستی پێ كرد، لێردا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەچەند خاڵێكی گرنگ بدەم سەبارەت بەو داستانە:

یەكەم : داستانی ئۆمەرگومبەت یەكەم شەڕی ناو گوند بوو لەسنوری پارێزگای هەولێر، بۆ پێشمەرگەش ئەزموونێكی نوێ بوو و تیایدا سەركەوتنی گەورەی بەدەست هێنا .

دووەم: خۆڕاگری خەڵكی گوندو بەدەنگەوە هاتن و هاوكاری كردن و دڵسۆزی و پەرۆشیان بۆ ژیان و سەلامەتی پێشمەرگەو سەركەوتنی، وێڕای ئەو هەموو بۆردوومان و مەترسییەی لەسەریان بوو.

سێیەم: یەکەم جار بوو لە دەشتی هەولێر بەتفەنگی بڕنەو بەرەنگاری کۆپتەر ببینەوە ئەویش شەهید ئەحمەد پێوەی هەڵسا، کۆپتەرەکان ویستیان لە گردەکانی دەورووبەری گوند هێز دابەزێنن بەڵام شەهید ئەحمەد بە تفەنگی بڕنۆ تەقەی لەکۆپتەرەکان کردو ناچاری کردن دوور بکەونەوە، بەمەش گوشاری هێزەکانی حکومەت لەسەرمان کەم بووەوە.

چوارەم : لە خۆشەویستی پێشمەرگەو جۆرێك لەپشتیوانی کردنی شۆڕش، منداڵێکی ئۆمەرگومبەتی لەگەرمەی شەڕو بۆردوومانی فرۆکەو تۆپ باراندا وێنەی شەڕەکەی لەسەر کاغەز نەخشاندبوو کە بەلای منەوە جوانترین هەڵوێستی لادێ نشین بوو بۆ پێشمەرگەو شۆڕش.

چوارەم : هەر لە نیوەڕۆوە هێزە هەمە چەشنەکەی حکومەت گۆڕەپانی شەڕیان جێهێشت کە باشترین بەڵگە بوو لەسەر ئازایەتی هێزی پێشمەرگەو ترسنۆکی هێزەکەی حکومەت بەو هەموو ئیمکانیاتەوە[1].

یەکێکی تر لەوانەی بەشداری ئەم داستانەی کردوە (سید هاشم) بوە . لەبارەی چۆنیەتی تۆمار کردنی ئەم داستانەوە گوتی:

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ ئەکرەم ئەحمەد ڕەسووڵ ( ئەکرەمی موهەندیس ) لە ڕێککەوتی ٩-٨-٢٠١٩

-لەماوەی چەند مانگێکی کەمدا کەرتی دوو زیانی گیانی زۆری بەرکەوت و زیاتر لەشەش حەوت پێشمەرگەمان شەهید بوو ئەوە جگە لە برینداربوونی چەندینی تر، ئەم زیانە گیانیە هەموو پێشمەگەکانی کەرتەکەی نیگەران و تورە کردبوو بە شەهید ئەحمەد قەمبەریشەوە، بە کورتیەکەی بەدوای تۆڵە کردنەوە دەگەڕاین تەنانەت زۆرێك لەپێشمەرگەکانی کەرتەکە دەیانگوت با بڕۆین ناحیەی تەق تەق بگرین کە بۆ ئەو سەردەمە زۆر ئەستەم بوو. عەسری رۆژی ٨-٨-١٩٨٢ تەواوی پێیشمەرگەکانی کەرتی یەك و دوو هاتینە ناو گوندی ئۆمەرگومبەت جگە لەوانەی بریندارو مۆڵەت بوون، هەردوو فەرماندەی کەرت شەهیدان ئەحمەد قەمبەری و هاوڕێ کاوەو فەرماندەی مەفرەزەکان کۆبونەیەکیان ئەنجامدا و بڕیاریاندا گەر حکومەت هێرشمان بۆ بهێنێت بەرگری بکەین ' تاوتوێی شوێنی شەڕەکە کرا ' ئایا ناو گوندی سێگردکان بێت یان گوندی ئۆمەرگومبەت؟ زۆربەمان ڕامان وابوو گوندی ئۆمەرگومبەت دابنرێت چونکە هەڵکەوتەی جوگرافی گوندەکە لەبار بوو بۆ شەڕ کردن و خۆڕاگرتن و دواتر سەرکەوتن بەسەر دووژمندا، دوای نان خواردنی ئێوارە شەهید ئەحمەد بڕیاریدا هەموومان لەسنوری گوندی کانی لەلە بۆسەیەك دابنێنەوە تا ئەگەر حکومەت هێرشی هێنا لەوێ لێیان

بدەیـن، شـەو لەبۆسـەدا بوویـن تـا بەرەبەیـان مایـنەوە بـەڵام هیـچ هێزێکـی حکومـەت نەهـات دوایـە زانیاریـمان بەدەسـت گەیشـت کـە حکومـەت لەپشـتی چیـای کانـی لەلـەوە بـە پـێ هێزێکـی ڕەوان کردبـوو بـەرەو گونـدی ئۆمەرگومبـەت، کـە دنیـا ڕوونـاك بـوەوە ئێمـەش کەمینەکەمـان هەڵگـرت و گەڕاینـەوە نـاو ئۆمەرگومبـەت، دوای گەڕانـەوەی ئێمـە لەبۆسـەکە ' حکومـەت لـە تـەق تەقـەوە بـەرەو گونـدی کانـی لەلـەو ئۆمەرگومبـەت هێزێکـی تـری سـەربازی بـەڕێ کـرد کـە لـە چەندیـن زرێپـۆش و ناقیلـەو سـەیارەی بارهەڵگـر پێکهاتبـوو، شـەهید ئەحمـەدو شـەهید هـاوڕێ کاوە ' تەواوی پێشـمەرگەکانیان دابەش کرد، پێشـمەرگەکانی کەرتی یـەك لەسـەروی مزگەوتـەوە دابـەش بـوون و کەرتـی ئێمـەش لـە خـوارووی مزگەوتـەوە تـا کۆتایـی خانـوی مـاڵان دابـەش بوویـن، مەفرەزەیەکـی خۆشناوەتیشـمان لەگـەڵ بـوو ئەوانیـش لەسـەروی گونـدەوە دابـەش بـوون، شـەهید ئەحمـەد پێـی ڕاگەیاندیـن کـە کـەس تەقـە نـەکات تـا خـۆی تەقـە نـەکات، تەگبیرکـەی ئـەوە بـوو سـەربازو جـاش بێنـە نـاو کۆڵانەکانـەوە ئنجـا بەیـەك جـار تەقەیـان لـێ بکرێـت بـۆ دوو مەبەسـت، یەکـەم : ئـەو چـەك و فیشـەکانەی کـە بەجـاش و سـەربازەکانە پـاش کوژرانیـان دەسـتی پێشـمەرگە بکەوێـت و لەشـەڕەکەدا سـوودی لـێ وەرگریـن ، دووەم : بـە کوژرانـی تـەواوی هێرشـبەرانی یەکەمیـان وەرەی حکومـەت

بڕوخێـت و توانـای پەلاماردانیـان نەمینێـت، بـەڵام بەداخـەوە پێشـمەرگەیەکی خۆشـناوەتی کـە تـازە بووبـوە پێشـمەرگەو شـارەزایی کـەم بـوو زوو تەقـەی کـرد و نەمانتوانـی ئامانجـی یەکەم بهێنینـە دی. ئیـدی شـەڕ دەسـتی پێکـرد، لەسـەرەوە کۆپتـەرەکان بـە سـارۆخ لەنـاو گوندیـان دەدا لـە لایەکـی تـر تـۆپ بـاران کرایـن تـا بیسـت دەقیقـە ئنجـا هێرشـی سـەربازو جاشـەکان دەسـتی پـێ کـرد بـەڵام لـە هەمـوو لایەکـەوە لێیـان دراو هێرشـی یەکەمیـان شکسـتی هێنـا. تـەواوی پێشـمەرگەکان دیـواری خانوەکانیـان کـون کردبـوو بـۆ ئـەوەی لـە کونـی دیوارەکانـەوە تەقـە بکـەن هـەم هاتـن و جوڵـەی هێـزی دووژمـن ببینن، شـەهید ئەحمـەد بەردەوام پێشـمەرگەکانی بەسـەر دەکـردەوە سـەرەڕای ئـەوەی تـۆپ بـاران و هێـرش و پەلامـار بـەردەوام بوو' دەیویسـت ورەو وزە بە پێشـمەرگە ببەخشـێت، لـە بڵندگـۆی مزگەوتـی گوندەکەشـەوە خوالێخۆشـبوو مـەلا برایمـی مـەلا قـەرە کـە ڕابـەر سیاسـی کەرتەکەمـان بـوو وتـاری دەداو داوای خۆڕاگـری و فیـداکاری لەپێشـمەرگە دەکـرد بەڕاسـتی ڕۆڵێکـی زۆر باشـی بینـی، چێشـتەنگاوێکی درەنـگ پـاش بۆردومانێکـی چـڕ جارێکـی تـر لـە هەمـوو لایەکـەوە هێرشـی دووەمیـان دەسـت پـێ کـرد تەنانـەت هێزی تایبەت ( قوە خاسـە ) و جـاش گەیشـتنە نـاو کۆڵانەکانـی خـواروی ئاوایـی بەڵام دیسـانەوە بەتونـدی لێیـان دراو توشـی شکسـت و کشـانەوە هاتـن.

ئەو چەند خێزانەی کە لە ناو گوند مابونەوە پاڵپشتیەکی باشی هێزی پێشمەرگە بوون لە کاتی شەڕەکەدا کە نان و ئاویان بۆ پێشمەرگە دەبرد. شەڕ تا سەعات دوانزەی نیوڕۆی خایاند و بەشکستی حکومەت و سەرکەوتنی پێشمەرگە کۆتایی هات، لەو داستانەدا دەیان سەربازو جاش کوژران و بریندار بوون و هێزی پێشمەرگەش بێ زیان بوو تەنها دوو هاوڵاتی کە کچی لالە حەکیمی ئۆمەرگومبەت بریندار بوون.

داستانی ئۆمەرگومبەت یەکەم شەڕی ناو گوند بوو لەسنوری پارێزگای هەولێر کە سەرکەوتنێکی کەم وێنە بوو بۆ ئەو قۆناغەو بۆ کەرتی یەك و دووی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بە سەرکردایەتی شەهید ئەحمەد قەمبەری تۆماری کرد[١].

شەهاب مام برایم پێشمەرگەیەکی تری بەشداربووی ئەو داستانەیە، لەبارەی داستانەکەی ئۆمەرگومبەتەوە گوتی : ئەو کاتە من لە کەرتی یەك پێشمەرگە بووم کە شەهید هاوڕێ کاوە فەرماندەی بوو، ڕۆژی پێشوو ئێمە لەگوندی سماقە بووین هەواڵمان بۆ هات کە حکومەتی عێراق هێزی سەربازی زۆری هێناوەتە سەربازگەی تەق تەق و نیەتی وایە هێرش بکاتە سەر گوندەکانی ڕۆژاوای تەق تەق، عەسر کەوتینە ڕێ و هاتینە گوندی ئۆمەرگومبەت ، لەوێ لەگەڵ کەرتی دوو

١- گفتوگۆ لەگەڵ هاشم حمدامین ڕەسووڵ لە ڕێککەوتی ٦-٢-٢٠١٩

و مەفرەزەیەکــی خۆشــناوەتی یەککــمان گرتــەوەو ئێــوارە دوای نــان خــواردن نێردرایــن بــۆ دانانــی بۆســە لەســەر جــادەی گشــتی نێــوان کانــی لەلە-تــەق تــەق لــە گــەرووی حەســوونە، تــا بەرەبەیــان لەبۆســەدا بوویــن، پێــمان وابــوو بەرەبەیــان هێزەکــەی حکومــەت دەســت دەکات بــە هێــرش کــردن و ئێمــەش لــە گــەرووی حەســوونە لێــی دەدەیــن بــەڵام خەریــك بــوو دنیــا ڕوونــاك بێتــەوە هــەر نەهــات بەناچــاری گەڕاینــەوە بــۆ گونــدی ئۆمەرگومبــەت، لەگــەڵ گەزەنگــی ڕۆژهەڵاتــدا هێزەکانــی حکومەتــی عێــراق لــە هــەورازی شــیروەزەنەوە بــەرەو نــاو گونــد بەڕێکەوتــن، لەمــاوەی کەمــتر لەچارەگێــك هەیئەتــی هــەردوو کــەرت لەگــەڵ تــەواوی پێشــمەرگەکان کۆبوونەوەیەکــی بەپەلەیــان ئەنجامــداو ئامــۆژگاری و ڕێنمایــی پێویســتیان پێــمان دا ' بەســەر خانوەکانــی نــاو ئاوایــی و کۆشــك و شــوێنە بــەرزەکان دابــەش بوویــن، کەرتــی دوو لەخوارووی مزگەوتــی ئاوایــی و کەرتــی یــەك و مەفرەزەکــەی خۆشــناوەتیش لەســەرووی مزگەوتــەوە دابــەش بوویــن.

هێزەکەی حکومەت کە بریتی بوون لە سەدان سەربازو جاش و چەکدارانی ئەمن و ئیستخبارات بەپاڵپشتی سێ کۆپتەری بارهەڵگرو دوو کۆپتەری جەنگی دەوروبەری ئاواییان ئابلووقە دا، کاتژمێر پێنج و نیوی بەیانی تازە ڕۆژ هەڵاتبوو کۆپتەرێکی بارهەڵگر هاتە سەر گردێکی بەرزی دەورووبەری ئاوایی و ویستی سەرباز دابەزێنێت بەڵام شەهید ئەحمەد قەمبەری بەتفەنگی برنۆ تەقەی لێ کردو بواری نەدا ئیتر شەڕ دامەزرا، سەرەتا لە خوارووی ئاواییەوە دەستیان کرد بە پەلاماردان پاشان لە گردەکانی دیوی ڕۆژهەڵاتیشەوە هێرشیان هێنا بەڵام پێشمەرگەکانمان لەهەموو لایەکەوە بەرپەرچی هێرشەکانیان دایەوە، ئەو کاتە لە گەرمەی شەڕدا بیرم لەو جیاوازیە زۆرە دەکردەوە کە لە نێوان هێزەکانی ئێمەو حکومەت هەبوو لە ڕووی ژمارەو چەك و تفاقی سەربازی ، ئێمە نزیك شەشت پێشمەرگە بووین و خاوەنی یەك ئاربیجی و چوار گوللەی ئاربیجی و چەکی کلاشینکۆف و ژێرسەو برنەو بووین، هیچ پێشمەرگەیەك لە سەد فیشەك زیاتری پێ نەبوو بگرە بەشێکمان پەنجا فیشەك کەمتریشمان پێ بوو، لە بەرانبەردا هێزەکەی حکومەت بریتی بوو لە سەدان چەك بەدەست و پێنج کۆپتەرو چەندین ناقیلەو زرێپۆش و سەدان چەکی قورس و سووك و هەزاران فیشەك، کەچی لەو

نابەرانبەریەشدا هێزەکەی حکومەت لەسەعات یانزەو نیوی پێش نیوەڕۆ پاش کوژران و برینداربوونی چەندین سەربازو جاش بەشکاوی گەڕانەوە ناحیەی تەق تەق[1].

مام ڕەسووڵ یەکێکە لەو پێشمەرگانەی کە بەشداری داستانی تۆڵەی کردوە، دەربارەی چۆنیەتی هێرش و پەلامارەکەی حکومەت و بەرگری کردن و تۆمار کردنی داستانی تۆڵە گوتی:
دوو ڕۆژ پێشتر کاك ئەحمەد قەمبەری زانیاری لەشارەوە بۆ هاتبوو کە حکومەت دەیەوێت هێرش بکاتە سەر گوندەکانی ڕۆژئاوای تەق تەق چونکە حکومەت دەیزانی پێشمەرگەکانی کەرتی دوو چەند ڕۆژێکە لەو گوندانە لەجەولەو مانەوەدایە، ئێمەش پێمان وابوو گەر حکومەت هێرش بکات یان بۆ سەر گوندی ئۆمەرگومبەت یان سێگردکان دەبێت، هەر بۆیە عەسری ڕۆژی ٨-٨-١٩٨٢ تەواوی پێشمەرگەکانی کەرتی دوو هاتینە ئۆمەرگومبەت و دوای نان خواردنی ئێوارە بە هاوبەشی لەگەڵ پێشمەرگەکانی کەرتی یەك و مەفرەزەیەکی خۆشناوەتی تا بەرەبەیان لە نێوان گوندی کانی لەلە و دەواجنەکەی

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ شەهاب مام برایم لە ڕێککەوتی ١٩-٣-٢٠١٩

ناوی تەواوی ( شەهاب ئیبراهیم حەمەد )ە لەساڵی ١٩٦٤ لەگوندی تاڵەبانی سەر بە ناحیەی تەق تەق لەدایك بوە، لە ساڵی ١٩٨١ لە کەرتی یەکی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بوە بەپێشمەرگە، دواتر گوازراوەتەوە کەرتی دوو، ئێستا خانەنشینی دێرینە خاوەنی پێنج منداڵە، لەناحیەی تەق تەق نیشتەجێیە.

تـەق تـەق لـە بۆسـەدا بووين بـەو مەبەسـتەی گـەر بەرەبەيـان هێـرش بهێنيـن لـەوێ هێزەكـە تێكبشـكێنين بـەڵام تـا دنيـا ڕوونـاك بـوەوە نەهاتـن ئێمـەش بەناچـاری گەڕاينـەوە گونـدی ئۆمەرگومبـەت، بـەڵام دوای گەڕانەوەمـان هێزەكـەی حكومـەت لـە سـەربازگەی قەڵاتـەوە دەسـتی كـرد بـە جموجـۆڵ بـەرەو گوندەكانـی ڕۆژئـاوای تـەق تـەق، لەگـەڵ گزنگـی خۆرهەڵاتنـدا هێزەكـەی حكومـەت لـە هـەورازی شـيروەزەنەوە بـەرەو نـاو گونـد هاتـن، پـاش كۆبونەوەيەكـی خێـرا هەمووومـان بەسـەر خانوەكانـی گونـد دا دابـەش بوويـن و ديوارمـان كـون كـرد، لـە ماوەيەكـی كەمـدا هێزەكـەی حكومـەت كـە سـەدان سـەربازو جـاش و پێنـج كۆپتـەرو چەنديـن ناقيلـەو زرێپـۆش بـوو گەيشـتنە دەوروبـەری ئاوايـی و دەسـتيان كـرد بـە هێـرش كـردن، بـەڵام لـە يەكـەم هێرشـياندا شكسـتيان خـوارد ٬ بۆيـە كۆپتـەرەكان بەسـارۆخ و دۆشـكا كەوتنـە بۆردومانـی كوێرانـەی نـاو ئاوايـی، كاتژمێـر نـۆی بەيانـی كۆپتەرێكـی بارهەڵگـر ويسـتی لەسـەر گردێكـی بـەرز كـە كەوتبـوە لای ڕۆژئـاوای گوندەكـەوە بنيشـێتەوەو هێـز دابەزينێـت بـەڵام شـەهيد ئەحمـەد برنۆيەكـەی لەمـن وەرگـرت و تەقـەی لـێ كـرد، پێـمان وابـوو پێكابـووی، دواتـر كۆپتەرەكـە بەپەلـەو لەترسـی پێكـران هەسـتايەوەو نەيتوانـی هێـز دابەزێنێـت، كۆپتـەرە بارهەڵگـرەكان لـە چەنـد شـوێنێكی تـرەوە ويسـتيان بنيشـنەوە

بـەڵام پێشـمەرگە تەقـەی لێیـان کـرد بەناچـاری دوور دەکەوتنـەوە، ژمـارەی پێشـمەرگەکانی هـەردوو کـەرت بـە مەفرەزەیەکـی خۆشناوەتیشـەوە لـە حەفتـا کـەس تێنەدەپـەڕی بـەڵام بەفیـداکاری و ئازایەتـی تـەواوی پێشـمەرگەکانمان هێزەکـەی حکومەتمـان شـکاند و کاتژمێـر یانـزەو نیـوی نیـوەڕۆ هێزەکـەی حکومـەت بەشـکاوی گەڕایـەوە ناحیـەی تـەق تـەق، ئـەوەی ڕۆڵـی گرنگـی لـە تۆمـار کردنـی ئـەو داسـتانەدا بینـی هەردوو فەرماندەی کەرت ' شـەهیدان ئەحمـەد قەمبـەری و هـاوڕێ کاوە و تـەواوی پێشـمەرگەکان بـوو کـە ئازایەتـی زۆریـان نوانـد ' هـەم ئـەو چەنـد خێزانـەی لەنـاو گونـد مابوونـەوە بەخـواردن و ئـاو هێنـان بـۆ پێشـمەرگە هـەم بانگـەوازو وتارەکانـی خوالێخۆشـبوو مـەلا برایمـی مـەلا قـەرە کـە لـە بڵندگـۆی مزگەوتەکـەوە وورەی پێشـمەرگەی بـەرز دەکـردەوە[1].

یەکێکـی تـر لـەو پێشـمەرگانەی بەشـدار بـوە لـە تۆمارکردنـی داسـتانی تۆڵـە سـامان دووبـزی بـوە، سـامان دوبـزی سـەبارەت بـە ئەنجامدانـی داسـتانی تۆڵـە گوتـی: بەر لـەوەی حکومـەت پەلاماری گونـدی ئۆمەرگومبـەت بـدات ' شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری زانیاری

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ ڕەسووڵ حمدامین لە ڕێککەوتی ١٨-١-٢٠١٩

نـاوی تـەواوی ڕەسـووڵ حمدامیـن ئیسـماعیلە، لـە سـاڵی ١٩٦٥ لـە گونـدی گەرمکـی تـەق تـەق لەدایك بـوە، سـاڵی ١٩٨٠ لـە ڕێگـەی مـام جاسـم ئیلنجاغیـەوە پەیوەنـدی کـردوە بـە ڕێکخسـتنەکانی یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتانەوە، لـە سـاڵی ١٩٨١ لـە کەرتـی دووی تیپـی ٨٦ی دەشـتی هەولێـر بـوە بەپێشـمەرگە، ئێسـتا لـە ناحیـەی تـەق تـەق دەژی و خانەنشـینی دێرینـە

هەبــوو کــە هێزێکـــی زۆری حکومــەت هێنراونەتــە ســەربازگەی قەڵاتـەی تـەق تـەق و پلانـی هێـرش و پەلامـاری هەیـە بـۆ سـەر ناوچەکـە، ئـەو سـەردەمە حکومەتـی عێـراق لەوپـەڕی بەهێـزی و توانــای ســەربازی و خاوەنــی باشــترین تەکنەلۆژیــای ســەربازی بــوو، ئەگــەر هێــزی پێشــمەرگە زانیــاری هەبوایــە لــە هێــرش و پەلامارێکـی وا بەرفـراوان ناچـار بـوو لەناوچەکـە دوور بکەوێتـەوە چونکـە نەیدەتوانـی شـەڕی بەرەیـی بـکات بـەڵام ئـەو جارەیـان خۆمـان لانـەداو هـەردوو کەرتـی یـەك و دووی تیپـی ٨٦ی دەشـتی هەولێـر لـە گونـدی ئۆمەرگومبـەت ماینـەوە بـەو هیوایـەی گـەر پەلامارمـان بـدات تێکیبشـکێنین، شـەو مەفرەزەیەکـی هاوبەشـیان نـاردە نێـوان گونـدی کانـی لەلـەو تـەق تـەق، بۆسـەیەکیان دانایــەوە تــا بەرەبەیــان مانــەوە بــەڵام تــا ئــەو کاتــە هێرشــیان نەهێنــا بۆیــە بەناچــاری مەفرەزەکانمــان گەڕانــەوە نــاو گونــد، شـەهید ئەحمـەدو شـەهید هـاوڕێ کاوە تـەواوی پێشـمەرگەکانیان بەســەر خانووەکانــی نــاو گونــد دا دابــەش کــرد کــە ژمارەمــان نزیکـەی پەنجـا تـا شەسـت پێشـمەگە دەبـوو، دوای ڕۆژهەڵاتـن حکومــەت بــە هێزێکــی گــەورەوە بــە پاڵپشــتی پێنــج کۆپتــەرو چەندیــن دەبابــەو ناقیلــە ئابلوقــەی گوندەکــەی دا، ســەرەتا لــە خــوارووی گونـدەوە هێرشـیان هێنـا پاشـان لـە گـردو تەپۆلکەکانەوە دەسـتی بەجووڵـەو پەلامـاردان کـرد، لـە هەمـوو لایەکـەوە لێیـان

دراو پەلامـاری یەکەمیـان تێکشـکا ، دواتـر کۆپتـەرەکان دەسـتیان کـرد بـە بۆردومـان کردنـی کوێرانـەو تـۆپ بـاران کـردن. لـە بڵندگـۆی مزگەوتەکەشـەوە بـە ڕێنمایـی شـەهید ئەحمـەد قەمبەری، خوالێخۆشـبوو مـەلا برایمـی مـەلا قـەرە بـە زمانـی عەرەبـی وتـاری دەخوێنـدەوەو داوای لـە سـەربازەکان دەکـرد کە شـەڕی پێشـمەرگە نەکـەن، مـەلا برایـم دەیگـوت ئێمـە دووژمنـی عـەرەب نیـن بەڵکو لەگـەڵ دەوڵەتـدا کێشـەمان هەیـەو مافـە نەتەوەییەکانمـان پێشـێل دەکات. شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری ڕۆڵـی زۆر گـەورەو گرنگـی بینـی لـە تێکشـکاندنی دووژمـن و کـوژران و برینـدار بوونـی دەیان سـەربازو جـاش، دواجـار هێزەکـەی حکومـەت بە شـکاوی گەڕانەوە تـەق تـەق. لـەو داسـتانەدا هێـزی پێشـمەرگە بـێ زیـان بـوو لەگـەڵ ئـەوەی ئەزموونـی یەکـەم جارمـان بـوو شـەڕی نـاو گونـد بەڕێـوە ببەیـن، تەنهـا دوو کچـی لالـە حەکیـم ئۆمەرگومبەتـی بەهـۆی بۆردومانەکانـەوە برینـدار بـوون، دەمەوێـت ڕۆڵ و ئازایەتـی و دڵسـۆزی خەڵکـی ئۆمەرگومـەت لەبیـر نەکـەم کـە چەنـدە هاوکارمـان بـوون لـە تۆمارکردنـی ئـەو داسـتانە[1].

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ سامان نەجمەدین عەبدوڵا لە ڕێککەوتی ١٠-٧-٢٠٢٠

نـاوی تـەواوی سـامان نەجمەدیـن عەبدوڵایـە، لەسـاڵی ١٩٦١ لەگونـدی قـەرەدەرە لـە دایـك بـوە، لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٨١ دەبێتـە پێشـمەرگە لـە تیپـی ٨٦ی دەشـتی هەولێـر، بڕوانامـەی دبلۆمـی بـاڵای هەیـە لەکۆمپیوتـەر، ئێسـتا لـە لەنـدەن نیشـتەجێیەو چـوار منداڵـی هەیـە.

لالـە حەكيـم دانيشـتوى ئـەو كاتـەی گونـدی ئۆمەرگومبـەت و یەكێـك بـوە لـە شـایەتحاڵەكان و زۆربـەی ڕووداوەكانـی بەچـاوی خـۆی بینیـوەو دوو كچیشـی لـەو شـەڕەدا برینـدار بـوون، لەبـارەی داسـتانی تۆڵـەوە گوتـی : پاشـنیوەڕۆی ڕۆژی ٨ی ئابـی ١٩٨٢ پێشـمەرگەكانی هـەردوو كەرتـی یـەك و دووی تیپـی ٨٦ی دەشـتی هەولێـر هاتنـە نـاو گونـدی ئۆمەرگومبـەت و عەسرەكـەی شـەهید ئەحمـەد و شـەهید هـاوڕێ كاوە سـەردانی ماڵـی ئێمەیـان كـرد، بـەدەم چـای خواردنـەوە گوتیـان نیەتمـان وایـە چالاكیـەك ئەنجـام بدەیـن ئەگـەر حكومـەت بەقسـەمان بـكات و هێرشـمان بـۆ بهێنێـت، پرسـیم چـۆن ؟ گوتیـان وا بڵاومـان كردۆتـەوە كـە ئێمـە لـە ئۆمەرگومبـەت دەمێنینـەوە، دەمانەوێـت ئـەم هەواڵـە لـە ڕێگـەی جاسووسـەكانەوە بگاتـە دائیـرەی ئەمـن و ئیسـتخبارات بەڵكـو هێرشـمان بـۆ بهێنـن و لێـرە داسـتانێك تۆمـار بكەیـن. ئنجـا تێگەیشـتم هـەردوو كـەرت دەیانەوێـت شـەڕی نـاو گونـد بكـەن. ئـەو كاتـە خەڵـك ماڵـی لەسـەر شـینایی (زرعـات) بـوو تەنهـا پانـزە بیسـت ماڵێـك لەنـاو گونـد مابـوون.

بەرەبەیـان هەسـتام دەسـنوێژم هەڵگـرت و نەخەوتمـەوە، نزیـك ڕۆژهەڵاتـن گوێـم لەنـەڕەی سـەیارەی گـەورە بـوو كـە دەنگەكـە لای گونـدی كانـی لەلـەوە دەهـات، دەنگەكـە دەنگـی سـەیارەی بچـووك نەبـوو بەڵكـو لـە دەنگـی دەبابە و زرێپۆش دەچـوو، بەناو

گونددا شۆڕ بوومەوە ویستم پێشمەرگەکان ببینم و ئاگاداریان بکەمەوە دیار بوو ئەوانیش ئاگادار بوون، لەگەڵ خۆرهەڵاتن لە گەرووی شیروەزەنەوە دەبابەو سەیارەی سەربازی دەرکەوتن و بەرەو دەوروبەرو دەروازەی گوند دەهاتن، پێشمەرگەکانیش جموجۆڵیان پێکەوتبوو، کاك ئەحمەد تەواوی پێشمەرگەکانی بەسەر خانوو و کۆشك و شوێنە بەرزەکاندا دابەش کردو دەستیان کرد بە کوونکردنی دیواری ئەو خانوانەی تیای دابەشبوبوون.

لەگەڵ خۆرهەڵاتدا ناو گوند بەر هاوەن و تۆپ دراو شەڕ دەستی پێ کرد، سەربازو جاش لە هەموو لایەکەوە هێرشیان هێنا، چێشتەنگاوێکی زوو دوو کۆپتەری شەڕکەرو کۆپتەرێکی نەفەرهەڵگر هاتن و دەستیان کرد بە بۆردومانی ناو گوند، لە هەموو لایەکەوە لەئاسمان و زەویەوە تەقە دەکرا ڕووەو ناو گوند، لە ئەنجامی بۆردوومانی کوێرانەی حکومەت ساروخێك بەر ماڵی ئێمە کەوت و دارو بەردی ڕووخاند بەسەرماندا لە ئەنجامدا دوو کچم بەناوەکانی حەلیمەو فاتمە بەسەختی بریندار بوون، دوای ئەوەی سەعات دوانزەی نیوەڕۆ حکومەت شکستی خوارد گەڕایەوە تەق تەق، هەردوو کچە برینداره‌کەم برد بۆ هەولێر لەوێش چارەسەر نەکران ڕەوانەی شاری بەغدا کراین و چل و پێنج ڕۆژ لە ژێر چارەسەر مانەوە.

ئـەوەی شـایەنی گوتـن و بـاس کـردن بێـت شـەهید ئەحمـەدو شـەهید هـاوڕێ کاوەو زۆربـەی پێشـمەرگەکان هێنـدە ئازایانـە بەرەنـگاری پەلامـارو هێرشـەکەی حکومـەت بوونـەوە کـە لەبـاس کـردن و پێناسـە نەیـەت، بەڕاسـتی خۆڕاگـرو ئـازاو فیـداکار بـوون شـایەنی هەمـوو پیاهەڵدانێـك بـوون .

چەنـد مانگێـك دوای ئـەو شـەڕە ڕۆژێـك لـە کۆتانـی خۆمـان هاتمـەوە مـاڵ ' عەزیـزی کـوڕم پەنجـا دینـاری دایـە دەسـتم و گوتـی : ئەمـڕۆ بەیانـی کاك ئەحمـەد قەمبـەری و هاوڕێکانـی هاتنـە ماڵـمان و ئـەو پەنجـا دینارەیـان پێـدام و گوتیـان کاتـی خۆی لـە لالـە حەکیـم قەرزمـان کـردوەو بیـدەوە دەسـتی، ڕاسـتیەکەی هیـچ شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری و کەرتەکـەی بـە جەولـە هاتنـەوە ئۆمەرگومبـەت و سـەردانی ماڵـی ئێمەیـان کـرد[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ لالە حەکیم لەڕێککەوتی ١٠-٨-٢٠١٩

# سەفەری کەرکووك

ساڵی ١٩٧٩ ئەحمەد قەمبەری سەردانی شاری کەرکووکی کردو بۆ ماوەی سێ ڕۆژو سێ شەو لە ماڵی خزمێکی لەگەڕەکی ڕەحیماوە مایەوە، ئەحمەد قەمبەری یەك لە پارتیزانەکانی دەشتی هەولێر بوو و دەزگا ئەمنیەکانی حکومەت دەیانویست بەهەر نرخێك بێت لەناوی ببەن کەچی بەنوێژی نیوەڕۆ سەردانی شاری کەرکووکی کرد، لەبارەی ئەم سەردانەیەوە محەمەدی برای گوتی :

-ماوەیەك بوو ئەحمەدی برام نەخۆش بوو، زۆر دەرمانی کوردەواریمان بۆی پەیدا کرد و لەشارەوە داو و دەمانی بۆ هات بەڵام چاك نەبووەوەو بگرە ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو بۆیە دەبوو بەهەر جۆرو ڕێگایەك بێت بینێرینە شار تا دکتۆرێکی شارەزا بیبینێت و پشکنینی بۆ بکات و نەخۆشیەکەی دەستنیشان بکرێت، بۆ ئەمەش ڕاوێژم لەگەڵ شەهید ئەحمەدو حاجی عومەری ئامۆزام کرد، بڕیارمان دا بیبەینە شاری کەرکووك ' ڕۆژێك بەتەنها سەردانی کەرکووکم کردو چوومە ماڵی کاك عەبدوڵای خاڵۆزام لە ڕەحیماوەو بابەتەکەم بۆ ئەویش باس

کـرد، کاك عەبـدوڵا ڕازی بـوو بـەوەی بەنهێنـی لەماڵـی ئـەوان بـۆ چەنـد ڕۆژێـك بمینێتـەوەو بیباتـە لای دکتۆرێکـی بـاش، دواتـر هاتمـەوە قەمبـەر ' ڕۆژی دوای ئـەوە حاجـی عومـەری ئامـۆزام و حاجـی عومـەری زاوامـان بـە ئۆتۆمبیلەکـەی خۆمـان بردیانـە کەرکـووك و لـەوێ کاك عەبـدوڵا بردبوویـە لای دکتۆرێکـی بـاش ' دوای وەرگرتنـی چارەسـەر بەنهێنـی هێنایـەوە بـان ساڵەیی و گەڕایـەوە نـاو هێزەکـەی[1].

هـەر لـەم بارەیـەوە حاجـی عومـەری ئامـۆزای شـەهید ئەحمـەد گوتـی:

-لەهاوینـی ساڵی ١٩٧٩ کاك ئەحمـەد نەخـۆش کـەوت، دکتۆرەکانی ئـەو سـەردەمەی نـاو شـۆڕش پێیـان چارەسـەر نەکـرا تەنانـەت خۆشـمان زۆر دەرمانـی کوردەواریـمان تاقیکـردەوە بـەڵام هـەر چـاك نەبـوەوە ' بۆیـە ناچـار بوویـن بەنهێنـی بیبەینـە شـار، لەپایـزی هەمـان ساڵدا بەپێـی ئـەو نەخشـەیەی دامـان نابـوو بـە ئۆتۆمبیلێکـی خۆمـان مـن و حاجـی عومـەری سـێکانی لـە ڕێگـەی پردێـوە بردمانـە شـاری کەکـووك و لەماڵـی خزمێـك بەنـاوی کاك عەبـدوڵا ئیبراهیـم سـێگردکانی دامـان نـا، ئەویـش ڕۆژی دواتـر بردیـە لای دکتۆرێکـی تایبەتمەنـد، پـاش کۆمەڵێـك پشـکنین و تیشـك' نەخۆشـیەکەی دۆزیـەوەو چارەسـەری بـۆ دانـا، دوای چەنـد

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ محمد ئۆمەر ئەحمەد لە ڕێککەوتی ٢٣-٦-٢٠١٩

ڕۆژێـك كاك عەبـدوڵا ئیبراهیـم و حاجـی مسـتەفا هێنایانـە سـنوری قەرەسـاڵم و تورکـی و گەیشـتەوە ناوچـە ئـازاد کـراوەکان، کاك ئەحمـەد بـۆ مـاوەی پانـزە ڕۆژ چارەسـەرەکانی بەکارهێنـا ئیـتر بەتـەواوی چـاك بـووەوە[1].

لەبـارەی چەنـد ڕۆژێـك مانـەوەی شـەهید ئەحمـەد لەماڵیـان ، عەبـدوڵا ئیبراهیـم زانیاریەکانـی خـۆی خسـتە ڕوو و گوتـی :

دوای ئـەوەی کاك محەمـەدی مـام ئۆمـەر هاتە ماڵمان و سـەبارەت بـە نەخـۆش کەوتنـی کاك ئەحمـەد قسـەی لەگەڵـم کـرد ، بەرنامەمـان دانـا کـە کاك ئەحمـەد بەنهێنـی بهێننـە ماڵـی ئێمـەو منیـش بیبەمـە لای دکتۆرێکـی بـاش، دوای دانانـی ئـەو بەرنامەیـە کاك محەمـەد گەڕایـەوە قەمبـەرو سـەردانەکەیان ڕێکخسـت، عەسرانێـك لەبـازاڕ هاتمـەوە ماڵـی خۆمـان ، کاك ئەحمـەد بـە نهێنـی هاتبـوە ماڵـی ئێمـە ، ڕۆژی دواتـر بردمـە لای دکتۆرێکـی شـارەزا، ئەویـش تیشـك ( ئەشـیعە ) و کۆمەڵێـك پشـکنینی بـۆ دانـا بـەڵام ئەنجامـی پشـکنینەکان دوا کـەوت بـۆ مـاوەی چەنـد ڕۆژێـك ، لەبـەر ئـەوە دوای سـێ شـەو و سـێ ڕۆژ کاك ئەحمـەد گوتـی پێویسـتە زیاتـر لـە کەرکـووك نەمێنمـەوە لەبـەر سـەلامەتی ئێـوەو خۆشـم، منیـش بەدکتۆرەکـەم گـوت نەخۆشـەکەمان دەگەڕێتـەوە لادێ و ناتوانێـت زیاتـر بمێنێتـەوە چونکـە خاوەنـی کارو کەسـابەتن،

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ عومەر حەمە ڕەشید لە ڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

دکتۆرەکـەش گوتـی بـا ئـەو بگەڕێتـەوە لادێ پێویسـتیمان پێـی نەمـاوە ' دوای دەرچوونـی ئەنجامـی پشـکنینەکان چارەسـەرەکەی بـۆ بکـڕەو بـۆی بنێـرەوە لادێکـەی خۆیـان، لەڕاسـتیدا مانـەوەی شـەهید ئەحمـەد لەنـاو شـاری کەرکـووك کارێکـی گـران بـوو چونکـە ئاشـکرا بوایـە هەموومـان شـوێن بـزر دەکرایـن، بـۆ ئـەو سـێ ڕۆژە ژوورێکـمان بـۆی دیـاری کـرد و بـە ئیختیفـا مایـەوە، دوای سـێ ڕۆژ ' ئۆتۆمبیلـی حاجـی مسـتەفا سـێگردکانیم بەکـرێ گـرت و پێکـەوە بردمـان تـا کەلـی تورکـی و دەرمانـاو ' لـەوێ سـەرنجی ڕووخسـاری کاك ئەحمـەدم دا هەسـتم بـە شـادومانیەکی زۆری کـرد دەتگـوت لـە زینـدان ئـازاد کـراوە، کاك ئەحمـەد بـە گوشـادیەوە ماڵئاوایـی لـێ کردیـن و ئێمـەش گەڕاینـەوە کەرکووك، دوای دەرچوونـی ئەجامـی پشـکنینەکان و دانانـی چارەسـەر ' لـە دەرمانخانەیـەك چارەسـەرەکەم کـڕی و ڕۆژی دواتـر ناردمـەوە بـۆ قەمبـەر[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ عەبدوڵا ئیبراهیم لە ڕێککەوتی ٤-٢-٢٠٢١

نـاوی تـەواوی عەبـدوڵا ئیبراهیـم محەمـەدە، لەسـاڵی ١٩٤٨ لـە گونـدی سـێگردکان لـە دایـك بـوە، ئێسـتا لـە شـاری هەولێـر دەژی.

# چۆن کەلی سوور بەخوێن سوور کرا؟

لە نێوان گوندی سارتك و ئاوماڵدا بەربەستێکی سورشتی هەیە کە هەردوو گوندی لە یەکتر نەدیو کردوە، خەڵکی ناوچەکە بەو شوێنە دەڵێن کەلی سوور ' کە لە تەپۆلکە گردی ووشك و ڕووت پێکهاتوەو کەم نەبێت گژو گیای لێ نەڕواوە مەگەر هەندێك بنچك و حوشترالووك و دڕکە زەردە نەبێت، سورشتی خاکەکە وایە ڕەنگی مەیلەو سوورە، خەڵکی ناوچەکە بەو جۆرە خاکە دەڵێن سوورك، هەر لەبەر ئەوەشە ناوی نراوە کەلی سوور.

دووری کەلی سوور بۆ هەردوو گوند وەك یەکە بەڵام لەسەر نەخشە کەوتۆتە ناو ئاقاری گوندی سارتك، ئەو ڕێگایەی کە لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو حکومەتی عێراق لەناحیەی تەق تەقەوە بۆ ناحیەی پردێ دروستی کرد بە ناوەندی کەلی سووردا تێدەپەڕێت و ئاودیو دەبێت بۆ بەستی شەرغە و پێنج سەد مەترێك بەلای باکوری گوندی سارتکدا تێدەپەڕێت و بە تەختایی تەنیشتی حاوی سارتکدا دەگاتە بەستی شەرغە کە سێسەد مەترێك لەزێی بچووکەوە دوورە.

لـه خـوارەوە تـا دەگەيتـە سـەرەوەی کەلەکـە سـێ پێچـی تیایـە بـەڵام پێچـی زۆر ڕك نیـن تەنهـا هەورازێکـی ئاسـاییەو بـە شێوەی پێچاوپێـچ هەڵکەوتـوە، گردەکانـی دەوروبـەری هەورازەکـە هەندێـك قەبـە دیـارن کـە بەهۆیـەوە هەورازەکـەی بـزر کـردوە و لـە شـوێنی تـرەوە بـاش دیـار نابێـت .

عـەسری ڕۆژێکـی مانگـی ئابـی سـاڵی ١٩٨٢ هەشـت پێشـمەرگە لـە گونـدی ئاوماڵـەوە بـە ئەرکێکـی پێشـمەرگانە بـەرەو گونـدی بەردەسـپی بەرێدەکـەون، لەپێچـی دووەمـی کەلـی سـوور دوو کۆپتـەری بارهەڵگـرو دوو کۆپتـەری شـەڕکەر پەلاماریـان دەدەن و دەیـان سـەربازیان بـۆ دادەبەزێنـن، سـەربازان گەمـارۆی تـەواوی کەلـی سـوور دەدەن و دەکەونـە پەلاماردانـی پێشـمەرگەکان و لـە سـەرەوەش کۆپتـەرە شـەڕکەرەکان بـە دۆشـکاو بیکەیسـی تەقـە لەپێشـمەرگەکان دەکـەن، لـە هەشـت پێشـمەرگە تەنهـا دوانیـان بـە سـەلامەتی دەرچـوون و ئەوانـی تـر شـەهیدو برینـدار بـوون.

یـەك لـەو پێشـمەرگانەی بەشـدار بـوە لـە شـەڕی کەلـی سـوور سـەباح ئیلنجاغـی بـوو، لەبـارەی ئـەو شـەڕەوە :

-چەنـد ڕۆژێـك بـەر لـە شـەڕی کەلـی سـوور بەشـێك لـە پێشـمەرگەکانی کەرتـی دوو بـە فەرماندەیـی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری بـۆ ئەنجامدانـی چالاکیـەك چووبونـە سـنوری ناوچەکانی

کەرکـووك و لــە شیوەســوور چالاکیەکیــان ئەنجامــدا، دوای ئەنجامدانـی چالاکیەکـە مەفرەزەکـە گەڕابونـەوە گونـدی قەرەسالم، حکومەتیــش زانیــاری هەبــوو لــە بــارەی شـوێنی گەڕانەوەیــان هــەر بۆیــە لـە ناحیــەی پردێــوە هێزێکــی گــەورەی بەرێخســت و پەلامــاری ناوچەکەیــداو لەچێشــتەنگاوەوە تــا عەسرێکــی درەنــگ شــەڕ دامــەزرا، لــەو شــەڕەدا چەندیــن ســەربازو جــاش کــوژران و هێزەکــەی حکومــەت بەشــکاوی گەڕانــەوە ناحیــەی پــردێ، لــە پێنــاوی ســەلامەتی گیانـی پێشـمەرگەکان شـەهید ئەحمـەد لەگـەڵ خـۆر ئاوابوونـدا بڕیاریـدا بگەڕێنـەوە سـنووری گوندەکانـی بەسـتی شـەرغە بـەڵام بەداخـەوە لە کاتی پەڕینەوەیـان لەزێی بچووك دوو پێشـمەرگەی کەرتەکەمـان بەناوەکانـی بەکـر ئیلنجاغـی فەرمانـدەی مەفـرەزەو کاکـە مەلاقەرەیــی پێشــمەرگەی کــەرت کەوتنــە نــاو ئـاوی زێـی بچـووك و خنـکان، خنکانـی ئـەو دوو پێشـمەرگەیە زۆر کاری لەئێمـەو شـەهید ئەحمـەد کـرد، بـۆ دۆزینـەوەی تەرمەکانیـان هاوڵاتیانــی دەڤەرەکــە هیمەتــی زۆر باشــیان کــرد ســەرەڕای ئــەوەی مەترســی پەلامــاری کۆپتــەرو جــاش و جەیــش هەبــوو بــەڵام زۆربــەی کات خەڵــك لــە گــەڕان و ســۆراغدا بــوون.

تــەواوی پێشــمەرگەکانی کەرتەکەمــان لــە دەشــتی ئاومــاڵ و سـێکانی دابـەش بووبـوون و لـە چاوەڕوانـی دۆزینـەوەی تەرمـی شــەهیدەکانمان بوویــن، کاتژمێــر ســێی دوای نیــوەڕۆی ڕۆژی

٢٤-٩-١٩٨٢ شەهید ئەحمەد بانگی ڕابەر سیاسی کەرتەکەمان کاك علی محموود ئیلنجاغی کردو نامەیەکی بۆ کاك شاخەوان عباسی پێ نوسی کە فەرماندەی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بوو، لە نامەکە داوای فیشەك و پێداویستی لە کاك شاخەوان کردبوو چونکە پاش ئەو چەند شەڕە پێشمەرگەکانمان فیشەکیان کەم پێمابوو، هەروەها لە نامەکە داوای تەوجیهاتیشی لێ کردبوو کە چیبکەین؟ لەو کاتەدا حکومەتی عێراق هەموو ڕێگەو ئامرازێکی بەکار دەهێنا بۆ دۆزینەوەی شوێنی پێشمەرگەو هێرش کردنە سەری، یەك لەو ئامرازانە ناردنی جاسووس بوو بۆ لادێکان بە بەرگ و ناونیشانی جیاجیاوە، چەند ڕۆژێك بوو لەشارەوە زانیاریمان بۆ هاتبوو کە ئەمنی کەرکووك پیاوێکی ڕاسپاردوە بۆ دۆزینەوەی شوێنی پێشمەرگە، زانیاریەکە وابوو کە پیاوەکە گوێدرێژێکی سپی پێیەو خۆی وەك وردەواڵە فرۆش دەناسێنیت، ئەنجومەنی کەرتەکە کە لەفەرماندەی کەرت و جێگرەکەی و دوو فەرماندەی مەفرەزەو ڕابەری سیاسی کەرت پێکهاتبوو دەیانویست پێشمەرگەکان لەچاوی جاسوس و ئەگەری هێرشی زەمینی و ئاسمانی و تۆڵەی حکومەت بەدوور بگرن هەر بۆیەش شەهید ئەحمەد لە نامەکە داوای ڕێوشوێنی پێویستی کردبوو لە فەرماندەی تیپ.

کاتژمێـر چـوارو چارەگـی عـەسر نامەکـەی دایـە یـەك لـە پێشـمەرگەکانمان بەنـاوی خـارە نـادر ( نـادر ئیلنجاغـی ) ئەویـش حـەوت پێشـمەرگەی تـری لەگـەل خـۆی بـرد بـەم ناوانـە: سـباح ئیلنجاغـی، حەمیـد سـماقە، عەلـی پونگینـە، سـەباح گەرمکـی، جەوهـەر ئیلنجاغـی، قـادر گردەسـۆری، مەجیـد سـماقەیی. کەرتـی دوو ' سـەیارەیەکی هەبـوو کـە پێشـتر لـە حکومەتـی عێـراق گرتبومـان و پێیـان دەگـوت شـلەخەجێ، بـەو سـەیارەیە بەڕێکەوتین و کاتژمێـر چـوارو نیـوی عـەسر گەیشـتینە پێچـی دووەمـی هەورازی کەلـی سـوور' کاتێکـمان زانـی کۆپتـەر گەیشـتە سـەرمان و لێـی دایـن و دەسـتی کـرد بـە دابەزاندنـی هێـزو ئابلوقەدانـی کەلـی سـوور، مـن سـەیارەکەم لێدەخـوڕی، بـە پەلـە هەمووومـان دابەزیـن و لـە کـۆردەرەو نـاو ئـاودڕو کەندولەنـدەکان دابـەش بوویـن و شـەڕ دامـەزرا، لـە لایـەك لـە گردەکانـەوە سـەربازەکان هێرشـیان بۆمـان هێنـا، لەلایەکـی تـر کۆپتـەرە جەنگیـەکان لەئاسـمانەوە دەسـڕێژیان لـێ دەکردیـن، لـە یەکـەم هێرشـیاندا فیشـەکێك بـەر قۆڵـی ڕاسـتم کـەوت بـەڵام پەکـم نەکەوتبـوو و دەمتوانـی تەقـە بکـەم.

شـەڕەکە بـوە شـەڕی دەسـتەویەخە، لەگـەڵ سـەربازەکان زۆر لەیەکـترەوە نزیـك بوویـن، ئەوانیـش وەك ئێمـە لـە کەنـدو جۆمـەکان دمەزرابـوون و نارجۆکیـان تـێ دەگرتیـن و ئێمـەش

بەنارنجۆك لەواڼمان دەگرت، لە نیو كاتژمێری یەكەمدا سێ پێشمەرگەمان شەهید بوون بە ناوەكانی مەجید سماقەیی، سەباح عبدالرحمان گەرمكی، قادر گردەسۆری.

لە ئەنجامی شەڕەكەو دەنگی تەقەی ئێمەو كیومالَی كۆپتەرەكان' هێزەكەی حكومەتی عێراق لەوە تێگەیشتبوو كە ئێمە جگە لەكلاشینكۆف هیچ چەكێكی قورس و كۆپتە رشكێنمان پێ نیە جگە لە ژێرسەیەك نەبێت كە بەدەستی كاك جەوهەر ئیلنجاغیەوە بوو ئەویش هەر لەسەرەتاوە بە سەختی بریندار بوو، بۆیە كۆپتەرەكان بۆ دۆزینەوەو كوشتنمان هێندە نەوی دەبوون دەمانتوانی یەك یەك سەرنشینەكانی ناویان ببینین، ئێمەش لە ناچاریدا تەنها بە كلاشینكۆف تەقەمان لە كۆپتەرەكان دەكرد بەلاَم كاتێك لە دەشتی ئاومالَەوە گوللە ئاربیجیەكیان لە كۆپتەرەكان گرت كۆپتەرەكان هەستان و چونە تاقی ئاسمان و كەمێك وەزعی ئێمە باشتر بوو، لەهەمان كاتدا شەهید ئەحمەد قەمبەری و تەواوی پێشمەرگەكانی كەرتی دوو دژە هێرشێكیان ئەنجامدا ئیتر هێزەكەی دووژمن كەوتنە خۆ كۆكردنەوە هەرچەندە كۆپتەرەكان بواریان نەدەدا بێن بە هانامانەوە.

کۆپتـەرە بارهەڵگـرەکان کوێرانـە شـوێنەکانی ئیمەیـان دایـە بـەر سـارۆخ، مـن جارێکـی تـر بـە پارچـەی سـارۆخ برینـدار بوومـەوە، مـام نـادر کـە فەرمانـدەی مەفرزەکەمـان بـوو ڕۆڵـی بەرچـاوی بینـی لـە بەرزکردنـەوەی ورەی پێشـمەرگەکان و هـاواری دەکـرد بجەنگـن و بـە هیـچ شـێوەیەك خۆتـان مـەدەن بەدەسـتەوەو بەقسـەکانیان فریـو نەخـۆن چونکـە دەتانکـوژن جـا لێـرە لـە بەرگـری کـردن لـە نیشـتیمانەکەمان بمریـن باشـترە.

دەنگـی تەقـەی هاوڕێکانـم کـەم بـوو بـوو گەرچـی لێیـان دڵنیابـووم هیچیـان نـە خۆیـان تەسـلیمی دووژمـن دەکـەن نـە ڕاشـدەکەن، تەنهـا جـار جـار دەنگـی مـام نـادر دەهـات، دوایـە دەرکـەوت کـە لـەو مەفـرەزە هەشـت کەسـیەمان سـێ پێشـمەرگەمان شـەهید بووبـوون و سیانیشـمان مـن و جەوهـەر ئیلنجاغـی و حەمیـد سماقەیی برینـدار بوویـن، تەنهـا خـارە نـادرو کاك علـی پونگینەیـی سـەلامەت بـوون، گەرچـی بریندارەکانیشـمان کـە خوێنیشـیان لـێ دەچـۆڕا بـەڵام بەرگریـان دەکـرد.

دوای ئـەوەی شـەهید ئەحمـەدو بەشـێك لە پێشـمەرگەکانی کەرتەکە لـە حـاوی ئاوماڵـەوە بـۆ بەهانـەوە هاتنـی ئێمـە هێرشـیان کـرد ، کۆپتـەرە بارهەڵگـرەکان بـە پەلـە پـروزێ دەسـتیان کـرد بـە کۆکردنـەوەی کـوژراو و بریندارەکانیـان و پاشـماوەی هێزەکانیـان کـۆ کـردەوەو ناوچەکەیـان بەجـێ هێشـت. لـەو شـەڕەدا حکومەتـی

عێـراق زیاتـر لـە ١٥ کـوژراو و بریـنـداری هەبـوو، ئێمـەش سـێ شـەهیدو سـێ بریندارمـان دا ' شـەڕەکە یـەك سـەعات و نیـوی خایانـد[1] .

مـام نـادر ئیلنجاغـی نـاسراو بـە خـارە نـادر فەرمانـدەی ئـەو مەفرەزەیـە بـوو کـە بـە ئەرکێکـی پێشـمەرگانە لـە دەشـتی ئاومالّـەوە بـۆ بەردەسـپی ڕەوانـە کـران . لەبـارەی ڕووداوەکـەی کەلـی سـوورەوە گوتـی : دوو رۆژ پێـش شـەڕی کەلـی سـوور پێشـمەرگەکانی کەرتـی دوو بـە فەرماندەیـی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری چالاکیەکیـان ئەنجامـدا بـوو لـە سـنووری پارێـزگای کەرکـووك، لەکاتـی گەڕانـەوەو پەڕینەوەیـان لـە زێـی بچـووك لـە بەری شـێخبزێنییەوە بۆ بەری بەسـتی شـەرغە دوو پێشـمەرگەیان کەوتنـە نـاو ڕووبارەکـەوەو خنـکان بـە ناوەکانـی بەکـر ئیلنجاغـی و کاکـەی مەلاقـەرە. ئێمـەش وەك کەرتـی یـەك کـە ئـەو کاتـە لەگونـدی سـێگردکان بوویـن ' بـۆ هـاوکاری کـردن و دۆزینـەوەی تەرمەکانیـان ڕۆیشـتینە حـاوی سـارتك و ئاومـاڵ، لـە مـاوەی ئـەو دوو ڕۆژەدا هـەم خەڵکـی ناوچەکـە هـەم پێشـمەرگەکانمان لەگەڕاندا بوویـن.

١- گفتوگۆ لەگەڵ سەباح حمد ڕەسووڵ لە ڕێککەوتی ٩-٣-٢٠١٩

ناوی تـەواوی سـباح حەمـەد ڕەسـووڵە ، لەسـاڵی ١٩٥٣ لـە گونـدی ئیلنجاغـی گـەورەی سـنوری قـەزای کۆیـە هاتۆتـە دنیـاوە، لـە تەمـوزی سـاڵی ١٩٨٢ لـە کەرتـی دووی تیپـی ٨٦ ی دەشـتی هەولێـر دەبێـت بەپێشـمەرگە، خێزانـدارەو خاوەنـی پێنـج منداڵـە، ئێسـتا خانەنشـینی دێرینـەو لەشـاری کۆیـە دەژی.

عەسری ڕۆژی ٢٤-٩-١٩٨٢ زۆربەی پێشمەرگەکانی کەرتی یەك و دوو لە دەشتی ئاومالّ لە چاوەڕوانی دۆزینەوەی تەرمی ئەو دوو پێشمەرگەیە بووین. بارودۆخی ئەو چەند ڕۆژە بۆ ئێمە نالەبار بوو چونکە حکومەت دەیویست تۆڵەی ئەو دوو چالاکیە لەهێزی پێشمەرگە بکاتەوەو زانیاریمان هەبوو کە حکومەت لە چەند لایەکەوەو بەچەند ڕێگاو شێوازێك جاسووسی ڕەوانە کردبوە ناوچەکە تاکو شوێنی پێشمەرگە بدۆزنەوەو پەلامارمان بدەن بۆیە کاك ئەحمەد قەمبەری بەکاك عەلی ڕابەری سیاسی کەرتدا نامەیەکی نوسی بۆ کاك شاخەوان کە فەرماندەی تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر بوو، لە نامەکە داوای فیشەك و پێداویستی کردبوو' هەروەها هەواڵی خنکانی ئەو دوو پێشمەرگەیەی نوسیبوو ' لەلایەکی تر داوای ڕێنمایی و پێدانی ڕێوشوێنی لێ کردبوو. من و حەوت پێشمەرگەی تر بەناوەکانی مەجید سماقەیی' قادز گردەسۆری' جەوهەر ئیلنجاغی' حەمید سماقەیی' سەباح ئیلنجاغی' سەباح گەرمکی' عەلی پونگینەیی ڕاسپێردراین تا نامەکە ببەینە گوندی بەردەسپی و تەسلیمی کاك شاخەوانی بکەین، کاتژمێر چوارو دە دەقیقەی عەسر بەڕێکەوتین، کاتێك گەیشتینە پێچی دووەمی کەلی سوور لە ئاسمانەوە دراینە بەر ساروخ و ڕێژنەی گوللەی دۆشکا، لە یەکەم هێرشی ئاسمانیدا ساروخێك بەر سەیارەکەمان کەوت، هەر ئەوەندمان

پـێ کـرا خۆمـان لـە سـەيارکە فڕێبدەينـە خـوارەوەو لـە کەنـدو جـۆم و ئـاودڕی کەلەکـە دابمەزرێيـن، کۆپتـەرە بارهەڵگـرەکان لـە سـەرەوەی کەلـی سـوور دەسـتيان کـرد بـە دابەزاندنـی سـەرباز، کۆپتـەرە شـەڕکەرەکانيش لـە دەوروبەرمـان دەخولانـەوەو کوێرانـە تەقەيـان لێمان دەکـرد، چەکەکانـی دەسـتی ئێمـە سـووك بـوون و توانـای بەرەنـگاری کۆپتـەری نەبـوو، جگـە لـە ژێرسـەيەك کـە لای کاك حەوهـەر ئيلنجاغـی بـوو ئەويـش لـە يەکـەم پەلامـاردا لەگـەڵ دوو پێشـمەرگەی ترمـان بـە ناوەکانـی سـەباح ئيلنجاغـی و حەميـد سـماقەيی برينـدار بـوو و چەکەکەيشـی بەسـاچمەی سـاروخەکان لـەکار کـەوت بۆيـە کۆپتـەرەکان بـە بـێ تـرس نـەوی دەبـوون و تەقەيـان لێـمان دەکـرد، ئێمـەش تەنهـا بـە چەکـی کلاشـينکۆف تەقەمـان لـە کۆپتـەرەکان دەکـرد. هـەر لـە هێـرش و پەلامـاری يەکەميانـدا کاك مەجيـد سـماقەيی شـەهيد بـوو.

دوای چارەگە سـەعاتێك لە هێرشـی ئاسـمانی کۆپتەرەکان، هێرشـی زەمينـی دەسـتی پـێ کـرد کـە لەهەمـوو لايەکـەوە سـەربازەکان هێرشـيان بۆمـان هێنـا، ژمـارەی هێـزە سـەربازيەکان بـە مەزەنـدە لەسـەد کـەس زياتـر بـوو کـە هەمـوو جـۆرە چەکێکيـان پـێ بـوو، لە بەرانبـەردا ئێمـە هەشـت پێشـمەرگە بوويـن بـە فيشـەکی کـەم و تفەنگـی ژەنگاويـەوە بەرەنگاريـمان دەکـرد. بەهـۆی بۆردومانـی کۆپتەرەکان و تەپوتۆزی تەقينەوەی نارنجۆك و بارووتەوە شـوێنەکە

بـوو بـوو بـە تاریکسـتان، بـەو هۆیـەی مـن فەرمانـدەی مەفرەزەکـە بـووم زوو زوو بانگـی هاوڕێکانـم دەکـرد بـۆ ئـەوەی هانیـان بدەم بـۆ خۆراگـری و فیـداکاری ' هـەم بـۆ ئـەوەی بزانـم کێیان مـاون یان کێیـان شـەهیدو برینـدار بوون، دوای سـەعاتێك لەهێـرش و پەلامارو شـەڕی دەسـتەویەخەی ئێمـەو سـەربازەکان گوێـم لەتەقینـەوەی گوللـە ئاربیجیـەك بـوو لـە نزیـك کۆپتـەرەکان ئەفلاقـی کـرد، بـە تەقاندنـی ئـەو گوللـە ئاربیجیـە کۆپتـەرە جەنگیەکان بـەرز بوونەوە بـۆ ناسـمان و کۆپتـەرە بارهەڵگرەکانیـش لـەو دیـو کەلـی سـوورەوە کەوتبوونـە کۆکردنـەوەی سـەربازو کـوژراو و بریندارەکانیـان، بارودۆخەکـە کەمێـك هێـور بـوەوەو تەقـە کـز بـوو لەسـەرمان، دیـار بـوو کاك ئەحمـەدو ئـەو پێشـمەرگانەی لـە دەشـتی ئاومـاڵ بـوون هاتـن بەهانامانـەوەو هێرشـیان هێنابـوو بـۆ سـەر کەلـی سـوور تـا ئابلووقەکـە بشـکێنن. دوای یـەك کاتژمێـرو نیـو لـە شـەڕی دەسـتەویەخەو ڕووبـەڕوو بونەوە لەگـەڵ چەندین کۆپتەردا هێزەکـەی حکومـەت بـە پەلەپـروزێ ناوچەکەیان بەجێهێشـت و بە شـکاوی گەڕانەوە. لەو هێرش و پەلامارەدا ئێمە سـێ پێشـمەرگەمان بەناوەکانـی مەجیـد سـماقەیی' سـەباح گەرمکـی' قـادر گردەسـۆری شـەهید بـوون و سـێ پێشـمەرگەی ترمـان بەناوەکانـی جەوهـەر ئیلنجاغـی' حەمیـد سـماقەیی' سـەباح ئیلنجاغـی برینـدار بـوون[1].

١- گفتوگۆ لەگەڵ مام نادر ئیلنجاغی لە ڕێککەوتی ٢٧-٧-٢٠٢٠

ناوی تـەواوی نـادر کەریـم خالـدە، لـە سـاڵی ١٩٥٢ لەگونـدی ئیلنجـاغ لەدایـك بـوە، لـە

پێشمەرگەیەکی تری بەشدابووی شەڕی کەلی سوور جەوهەر ئیلنجاغیە، سەبارەت بە چۆنیەتی هێرش و پەلامارە ئاسمانیەکەی حکومەتی عێراق بۆ کەلی سوورو چۆنیەتی بەرەنگار بوونەوەی گوتی : عەسری ڕۆژی ٢٤-٩-١٩٨٢ شەهید ئەحمەد مەفرەزەیەکی هەشت کەسی ڕاسپارد تا نامەیەکی ئەو بگەیەنینە دەستی کاك شاخەوان عباس فەرماندەی تیپ لە گوندی بەردەسپی، مەفرەزەکە بریتی بووین لە خارە نادر فەرماندەی مەفرەزەکە، علی پونگینەیی، سەباح گەرمکی، مەجید سماقەیی، سەباح ئیلنجاغی، حەمید سماقەیی، قادر گردەسۆری، جەوهەر ئیلنجاغی، بەسەیارەیەکی کەرتەکە کەوتینە ڕێ، وا تێبگەم کاك سەباح ئیلنجاغی سەیارەکەی لێدەخوڕی، سەعات چوارو نیوی عەسر گەیشتینە پێچی دووەمی کەلی سوور کاتێك کۆپتەر گەیشتە سەرمان، کۆپتەرە جەنگیەکان دەستیان کرد بە تەقە کردن لێمان و کۆپتەرە بارهەڵگرەکانیش سەربازیان دابەزاند و چواردەورمان گیراو شەڕ دەستی پێ کرد، من چەکی ژێرسەم پێ بوو و کاك سەباح بڕنەو ' شەش پێشمەرگەکەی تریش کلاشینکۆفیان پێ بوو، هیچ کام لە چەکەکانمان شەڕی کۆپتەری پێ نەدەکرا ' کۆپتەرەکانیش لەوە تێگەیشتبوون کە چەکی قورسمان

---

ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی دەکات بە ئەڵقە ڕۆشنبیریەکانی کۆمەڵەوە، لە ساڵی ١٩٨٢ دەبێتە پێشمەرگە لە تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، ئێستا بەپلەی عەمید نەفسەری ئاسایشە ' لەشاری کۆیە نیشتەجێیە، خێزانـدارەو خاوەنی حەوت منداڵە.

پـێ نیـە بۆیـە بـە بـێ تـرس نـەوی دەبـوون تـا بماندۆزنـەوەو تەنانـەت بەدەسـت بمانگـرن، لەگـەڵ سـادەیی چەکەکانمـان و کەمـی ژمارەمـان و برینـدار بوونـی دوانمـان لـە یەکـەم پەلامـاردا هێشـتا بەرگریـمان دەکـردو هێرشـی سـەربازەکانمان تێکدەشـکاند.

لـە نیـو سـەعاتی یەکـەم مـن برینـدار بـووم و ئـاگام لەخـۆم بـڕا ئیـتر نازانـم شـەڕەکە چەنـدی خایانـد و دواتـر چـی ڕوویـدا تـا ڕۆژی دواتـرو دوای لـە ئاگاهاتنـەوەو سـارێژ بوونـی برینەکانـم ئنجـا زانیـم سـێ پێشـمەرگەمان شـەهید بـوەو سـێی ترمـان برینـدار بوویـن[1].

نوسـەری ئـەو نامەیـەی درایـە ئـەو مەفـرەزە هەشـت کەسیە کاك عەلـی ئیلنجاغـی بـوو، لـە بـارەی چۆنیەتـی و هـۆکاری نوسـینی ئـەو نامەیـە گوتـی :

بارودۆخـی ئەوسـای کەرتـی دوو ئـەوەی دەخواسـت کـە کاك ئەحمـەد قەمبـەری بـە نامەیـەك فەرمانـدەی تیپـی لـێ ئـاگادار بکاتـەوە، لـەو کاتانـەدا کەرتەکەمـان تـازە لـە شـەڕێك گەڕابوونـەوەو زۆربـەی پێشـمەرگەکان فیشـەکیان کـەم پـێ مابـوو،

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ جەوهەر ئیلنجاغی لەڕێککەوتی ٩-٨-٢٠١٩

نـاوی تـەواوی جەوهـەر ئۆمـەر حەمەدەمیـن لـە سـاڵی ١٩٦٢ لـە گونـدی ئیلنجاغ لەدایـك بـوە، لـە سـاڵی ١٩٨٢ لـە کەرتـی دووی تیپی ٨٦ ی دەشـتی هەولێـر بـوە بەپێشـمەرگە، خاوەنـی چـوار منداڵـەو ئێسـتا خانەنشـینی دێرینـەو لـە شـاری هەولێـر نیشـتەجێیە.

وە لەکاتی گەڕانەوەشیان دوو پێشمەرگەمان لە زێی بچووك خنکابوون و هەموومان بە هاوڵاتیانی دەڤەرەکەشەوە سەرقاڵی دۆزینەوەی تەرمەکانیان بووین، من و کاك ئەحمەدو بەشێك لە پێشمەرگەکان لە دەشتی ئاومال و بەشەکەی تر لە حاوی سێکانی بوون، بەو حوکمەی کاك ئەحمەد خوێندەوار نەبوو بانگی منی کرد تا نامەیەکی بۆ بنوسم و بینێرێت بۆ کاك شاخەوان عەباس فەرماندەی تیپ، لەسەر داواکاری کاك ئەحمەدو بۆچوونی خۆشم لە نامەکە داوای فیشەکمان کرد هەروەها هەواڵی شەهید بوونی ئەو دوو پێشمەرگەیەشمان بۆ نارد، ئەو مەفرەزەیەی ڕامانسپارد لە هەشت کەس پێکهاتبوو کە بریتی بوون لە ( کاك علی پونگینەیی فەرماندەی مەفرەزەکە، خارە نادر، سەباح گەرمکی، سەباح ئیلنجاغی، حەمید سماقەیی، جەوهەر ئیلنجاغی، قادر گردەسۆری، مەجید سماقەیی )، کاتژمێر چوارو چارەگی عەسر نامەکەم دایە دەست خارە نادرو بەڕێکەوتن، هێندەی پێ نەچوو دەنگی کۆپتەرو تەقەیەکی زۆر هات، لێمانەوە دیار بوو کە کۆپتەرەکان زۆر نەوی بوون و لە دەوروبەری کەلی سوور دەخولانەوەو تەقەیان دەکرد، تێگەیشتین کە کۆپتەرەکان لە مەفرزەکەی ئێمەیان داوە، کاك ئەحمەد بەپەلە بانگی برادەرانی کرد تا دژە هێرشێك ئەنجام بدەین بەو مەبەستەی قورسایی شەڕەکەیان لەسەر

کەم بکەینەوە، دوای کاتژمێرێك شەڕ بەداخەوە لەو مەفرەزە هەشت کەسیە سێیان ( سباح گەرمکی، قادر گردەسۆری، مەجید سماقەیی ) شەهید بوون و سێ پێشمەرگەی ترمان (سەباح ئیلنجاغی، حەمید سماقەیی، جەوهەر ئیلنجاغی) بریندار بوون، تەنها خارە نادرو کاك عەلی پونگینەیی بە سەلامەتی دەرچوون، ئەو مەفرەزەیە سەرەڕای ئەوەی چەکی قورسیشیان پێ نەبوو بەڵام توانیان لەگەڵ کۆپتەرو سەربازێکی زۆر بجەنگن و هێزەکەی حکومەت بشکێنن[1] .

یەك لە کادرەکانی ئەو سەردەمەی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان مامۆستا کاکلە ڕەشە کە ئەوسا ئەندامی کەرتی ڕێکخستنی دەشتی هەولێر بوە [2] دەربارەی ڕووداوێك گوتی :

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ علی مەحموود حەمەد لە ١٤-٢-٢٠١٩

ناوی تەواوی علی مەحموود حەمەدە، لەساڵی ١٩٥٤ لە گوندی ئیلنجاغی گەورەی سەر بەناحیەی تەق تەق لەدایك بوە، دەرچووی کۆلیژی یاسایە، خێزاندارەو خاوەنی پێنج منداڵە، لە ساڵی ١٩٦٩ پەیوەندی کردوە بە یەکێتی قوتابیانی کوردستان و پاشان پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، لە ساڵی ١٩٧٧ پەیوەندی کردوە بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانەوە، لە بەرواری ٢٦-٣-١٩٨٢ لەسەر ڕاسپاردەو داوای ڕێکخستن بوە بە پێشمەرگەو کراوە بەڕابەری سیاسی کەرتی یەکی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، ساڵی ١٩٨٤ بەشداری کردوە لەخولی پێگەیاندنی کادیران لە گوندی کانی تووی دۆڵی مەرگە، دوای ڕاپەڕین بەپلەی نەقیب لەدەزگای ئاسایش دامەزراوەو خولی پێگەیاندنی ئەفسەرانی تەواو کردوە، دواین پلەی عەمید بوە لەپایەی یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی ڕەگەزنامەی هەرێمی کوردستان، لە ٣١-١-٢٠١٨ خانەنشین بوە.

-ئێمە وەك كەرتی ڕێكخستنی دەشتی هەولێر چەند ڕۆژێك دوای شەڕەكەی كەلی سوور چوینە گوندی ئاومالّ ' بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ من و كاك جەلال شووشە چوینە مالّێك ' منداڵێكی ئەو خێزانەم بینی لەسەر كاغەزێكی سپی وێنەی پێشمەرگەیەكی كێشابوو لەوێنەكە پێشمەرگەكە چەكێكی ئاربیجی لەسەر شان بوو و دەیویست كۆپتەرێك بپێكێت وبیخاتە خوارەوە ' لێم پرسی ئەو وێنەیەی كێشاوتە وێنەی چ پێشمەرگەیەكە ؟ گوتی ئەوە وێنەی كاك ئەحمەد قەمبەریەو دەیەوێت كۆپتەرێك بخاتە خوارەوە، دیاربوو منداڵەكە چەند ڕۆژێك پێش ئەوە كاك ئەحمەدی بینی بوو كە بەئاربیجی تەقەی لە كۆپتەرەكان كردبوو ئەویش كردی بە وێنە، ئەمەش بەڵگەی ئەوە بوو كاك ئەحمەد لەلای خەڵك فەرماندەیەكی خۆشەویست بوو[1].

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ كاكلە ڕەش لە ڕێككەوتی ٢٤-٨-٢٠١٩

ناوی تەواوی كاكل ئەحمەد مەعروفە، لەساڵی ١٩٦١ گوندی سەید عوبێدی سەر بەناحیەی دیبەگە لەدایك بوە، لەساڵی ١٩٨٠ بەهۆی ئاشكرا بوونی لەكاری ڕێكخستن لەلایەن دزگا ئەمنیەكانەوە دەستگیر دەكرێت، دوای ئازاد بوونی لەساڵی ١٩٨٢ دەبێتە پێشمەرگە لە ڕیزەكانی یەكێتیی نیشتیمانیی كوردستان، دواتر دەكرێت بە ئەندامی كەرتی ڕێكخستنی دەشتی هەولێر، هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لەیاسا ' ئێستا فەرمانبەرە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر و لەشاری هەولێر نیشتەجێیە.

دوا بـەدوای کۆتایـی هاتنـی شـەڕی کەلـی سـوور بەپەلـە هـەر سـێ بریندارەکەیـان بـە سـەیارە گەیانـدە گونـدی ئۆمەرگومبـەت و جوابیـان بـۆ دکتـۆر ڕەفعـەت هیدایـەت دکتـۆری تیپـی ٨٦ی دەشـتی هەولێـر نـارد تـا بـە زووتریـن کات چارەسـەریان بـکات . لەبـارەی چۆنیەتـی چارەسـەر کردنـی هـەر سـێ بریندارەکـە دکتـۆر ڕەفعەتمـان دوانـد، گوتـی :

ئـەو ڕۆژەی شـەڕەکەی کەلـی سـوور ڕوویـدا ئێمـە وەك کەرتـی تیـپ لـە بایزاغـەو سـماقە بوویـن، کاتێـك جوابمـان بـۆ هـات تـا بچیـن چارەسـەری بریندارانـی شـەڕەکە بکەیـن، بەپەلـە چوومـە گونـدی ئۆمەرگومبـەت و لـە ماڵێـك چارەسـەری سـەرەتاییم بۆیـان کـردو خوێـن بەربوونەکەیانـم ڕاگـرت، دواتـر بـە بریندارەکانـەوە چووینـە گونـدی ئیلنجـاغ تـا لـەوێ کەسـێك ڕاسـپێرم کەلوپەلـی پزیشـکیمان لـە شـارەوە بـۆ بهێنێـت و چارەسـەری تەواویـان بـۆ بکـەم، لیسـتێکم نوسـی لەحـەب و دەرزی و لەفـاف و گـۆزو خێتـی دوورینـەوەی بریـن و هەندێـك کەلوپەلـی تـر ' لیسـتی پێویسـتیەکانم دایـە ژنێکـی ئیلنجاغـی بەنـاوی زولێخـا دایکی کاك هیدایـەت و کاك ڕەسـووڵ ' دواتـر ناردمانـە کۆیـە، کـە هاتـەوە هەمـوو کەلوپەلەکانـی بـە زیـادەوە هێنابـوو ' هـەر سـەیرمان پـێ هـات بـەو مـاوە کەمـەو لـەو هەلومەرجـە سـەخت و پڕ چاودێریـە توانـی ئـەو هەمـوو کەلوپەلەمـان بـۆ بهێنێـت، جگـە لەوانـەش

کەباب و پاکەتی جگەرەشی هێنابوو، هەڵوێستی ئەو ژنە شایستەی باس کردن و پیا هەڵدان و لەبیر نەچوونەوەیە.

لە ماوەیەکی کەمدا هەر سێ بریندارەکەم چارەسەر کرد[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر ڕەفعەت هیدایەت لە ڕێککەوتی ٢٤-٦-٢٠٢٠

ناوی تەواوی ڕەفعەت هیدایەت حەمە ساڵحە، لەساڵی ١٩٥٥ لەگوندی خورخوڕ لە دایك بوە، دەرچووی کۆلیژی ڤێرتەرنەری زانکۆی مووسڵە، لە ٢٣-٢-١٩٨١ دوای ئاشکرا بوونی لەکاری ڕێکخستن ' شاری هەولێر بەجێدەهێڵێت و دەچێتە سەرکردایەتی و دەبێتە پێشمەرگە، لە ١٧-٣-١٩٨١ بە فەرمانی سەرکردایەتی دەگوازرێتەوە بۆ قوەتی دەشتی هەولێر کە لە هەمان کاتدا نوسراوی گۆڕینی ناوی قوەتی هەولێر بۆ تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێری پێ ڕەوانە دەکەن و ئەو بەڕەسمی دەکرێت بە دکتۆری تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، خاوەنی پێنج منداڵەو ئێستا لە شاری هەولێر نیشتەجێیەو خانەنشینی مەدەنیە.

# دۆزەخێك لەپردی ساماڵ

هێشـتا مـەلا بانگـی عـەسری نەدابـوو مەفرەزەیەکـی کەرتـی دووی تیپـی ٨٦ی دەشـتی هەولێـر لـە نێـوان کۆیـەو دێگەڵـە لەکاروانێکـی سـەربازیان داو زیانـی گـەورەی گیانـی و ماددیـان گەیانـدە هێزەکـەی حکومـەت، شـوێنی ئەنجامدانـی چالاکیەکـە بـە ئۆتۆمبیـل تەنهـا پێنـج دەقـە ڕێ دوور بـوو لـە سـەربازگەی کۆیـەوە، هەروەهـا هـەردوو لای شـوێنی ئەنجامدانـی چالاکیەکـە ڕەبیـەی سـەربازی حکومەتـی لـێ بـوو کـە ژمـارەی چەکدارانـی نـاو هـەردوو ڕەبیەکـە لـە ٣٠ کـەس زیاتـر بـوو، هەریـەك لـەو دوو ڕەبیەیـە چەکـی بیکەیسـی و ئاربیجیشـیان لا بـوو جگـە لـە چەکـی کلاشـینکۆف و نارنجـۆك و هـەزاران فیشـەك، بـەڵام بـە نوێـژی نیـوەڕۆ لـە کاروانێکـی سـەربازی دراو هێزەکانـی حکومـەت نەیانتوانـی بچـن بەهانـای هێـزە تێکشـکاوەکەیانەوە.

مامۆسـتا سـەیفەدین ئـەو سـەردەمە ڕابـەری سیاسـی کەرتـی دوو بـوەو یەکێـك بـوە لـە بەشـداربوانی چالاکیەکـە گوتـی:

-ئێـوارەی ڕۆژی ١٦-٧-١٩٨٢ تـەواوی پێشـمەرگەکانی کەرتـی دوو لـە گونـدی گۆپتەپـە نانمـان خـوارد، دوای نـان خـواردن کاك ئەحمەد

قەمبەری منی جیا کردەوەو گوتی ئێمە ئەمشەو بۆ هەندێك کاروباری تایبەتی جەولەیەك دەکەین تۆش لێرە بمێنەوە ئەگەر کاروباری ڕێکخستنت هەبوو ئەنجامی بدەو سبەی شەو یەکتر دەبینینەوە، بەم قسانەی کاك ئەحمەد زانیم کە بەرنامەی ئەنجامدانی چالاکیەکیان هەیە چونکە هەرجارێك چالاکیەکیان ئەنجام دابێت پێشتر ئەم قسانەی بۆ دەکردم، لەمەشدا مەبەستی ئەوە بوو من نەبەن بۆ چالاکیەکە چونکە پێی وا بوو نابێت ڕابەر سیاسیەکان بەشداری چالاکیەکان بکەن نەبادا شەهید بن ' بە شەهید بوونی ڕابەری سیاسی' هێزی پێشمەگە دەشڵەژێت، چەند جارێك بەم شێوەیە منیان بەجێ هێشتبوو بۆیە بڕیارمدا بەبێ ئاگای ئەو' شەو لەگەڵیان بکەومە ڕێ و نەهێڵم هەستم پێ بکەن، کاتژمێر نۆو نیوی شەو کاك ئەحمەدو پێشمەرگەکان گۆپتەپەیان بە جێهیشت و بەدوای یەکتردا کەوتنە ڕێ، منیش بەدوای ئەواندا ڕۆیشتوم بێ ئەوەی بهێڵم هەستم پێ بکەن، شەو لەجادەی نێوان کۆیە-دێگەڵە پەڕینەوەو چوینە کانی کەوان، بەرەبەیان کاك ئەحمەد پێشمەرگەکانی بەسەر کردەوە تا لەژمارەو سەلامەتیان دڵنیا بێت، کاتێك لێم نزیك کەوتەوە لەو تاریکیەدا منی ناسیەوەو گوتی مامۆستا ئەوە تۆی ؟ ئەی نەمگوت تۆ مەیە؟ منیش گوتم کاك ئەحمەد ڕاستە ڕابەری سیاسیم بەڵام

خـۆ پێشـمەرگەم، ناکرێـت لـە چالاکیـەکان بەشـدار نەبـم، ئیـتر بڕیـارم داوە ئێـوە لەکـوێ بـن منیـش لـەوێ بـم. ئـەو شـەوە تـا پاشـنیوەڕۆی ڕۆژی دواتـر بـە نهێنـی لـە کانـی کـەوان ماینـەوەو هـەر یەکەمـان نوشـتێك نانمـان هێنـا بـوو تـا ئـەو شـەو و ڕۆژەی لــەوێ دەمینێینــەوە برسـیمان نەبێـت، ڕۆژی ١٧-٧-١٩٨٢ کاتژمێـر چـواری عــەسر تـەواوی هێزەکەمـان کـە ٢٥ تـا ٣٠ پێشـمەرگە دەبوویـن دابـەش کـرد بـۆ چـوار مەفـرەزە، مەفـرەزەی یەکـەم و دووەم بـۆ تەقـە کـردن لـە هـەردوو ڕەبیـە سـەربازیەکە تـا سـەرقاڵیان بکـەن و نەپرژێنـە سـەر پەلاماردانمـان، مەفرەزەی سێیەم بـۆ دانانـی بۆسـە تاکـو ئەگـەر هێزەکانـی حکومـەت لەکۆیـەوە هێرشـمان بـۆ بهێنـن ئـەوا لێیـان بـدەن و ڕێگەیـان نـەدەن بگـەن بـە فریـای هیـزە تێکشـکاوەکەیانەوە، مەفـرەزەی چـوارەم لەسـەر جـادەی گشـتی لـە سـێ شـوێنی جیـا جیـا بـە درێژایـی ٥٠٠ مەتـر کـە هـەر حەفتـا هەشـتا مەترێك و سـێ پێشـمەرگە پێکـەوە بـن لـە ئامـادە باشـی تـەواودا بـن بـۆ لێـدان لـە کاروانـە سـەربازیەکە، مـن و کاك هیـوا ئەشکەوسـەقایی و کاك کاروان مامقلینجـی پێکـەوە دانرایـن، هێزەکـەی حکومـەت کاتژمێـر چـوارو دە دەقیقـەی عـەسر گەیشـتە ئاسـتمان و هەمـوان لەیـەك کاتـدا دەسـتمان بـە تەقـە کـردن کـرد ' لەمـاوەی چارەگێـك شـەڕ کـردن هێزەکـەی حکومـەت تێکشـکا، لـەو شـەڕەدا ١٣ سـەرباز کـوژراو چەندیـن برینداریـان

هەبوو لەگەڵ تێکشکاندنی چەندین ئۆتۆمبیلی سەربازی و دەستکەوتنی چەندین پارچە چەکی سووك و قورس[1] .

هەر لەبارەی چالاکیەکەی پردی ساماڵ سەلام مام عەباس گوتی: لە سەرەتای ساڵی هەشتاکان حکومەتی عێراق بۆ پێشگرتن لە چالاکی و بۆسەی هێزی پێشمەرگەو دابین کردنی سەلامەتی و ئاسایش بۆ ڕێگاوبانەکان ناچار بوو جگە لەڕەبیە هەمیشەییەکانی مراباتیش لە نێوان شارەکان دابنێت و لە کاتژمێر ٨ ی بەیانیەوە بۆ ٥ ی پاش نیوەڕۆ لە نێوان دوو کیلۆمەترو چەند سەربازێکی دادەنا ، ئەرکیان پارێزگاری کردنی هێزەکانیان بوو کە لەنێوان شارەکان هاتوچۆیان دەکرد، هەر لەو چوارچێوەیەدا جادەی نێوان کۆیەو هەولێریش بە مرابات پڕ دەکرایەوە، دیار بوو شەهید ئەحمەد قەمبەری زانیاری تەواوی هەبوو کە هەموو ڕۆژێك سەعات ٤ تا ٥ ئێوارە چەند ئیڤاو ناقیلەیەك دوای

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا سەیفەدین لە ڕێککەوتی ٩-٨- ٢٠١٩

ناوی تەواوی سەیفەدین عەلی ئەحمەدە، لە ساڵی ١٩٥١ لەگوندی کەندارەقەل لەدایك بوە کە کەوتۆتە سنوری ناحیەی دیبەگە، ساڵی ١٩٧٠ خانەی مامۆستایانی تەواو کردوەو لە ساڵی ١٩٧٣ بەمامۆستا دامەزراوە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی کردوە بەئەڵقە ڕۆشنبیریەکانی کۆمەڵەوە لە ڕێگەی مامۆستا حەسەن ئەنوەر ( مامۆستا کاوە )، لەڕێکەوتی ١٥-١١-١٩٨١ دەبێتە پێشمەرگە، دوای گەڕانەوەی لە سەرکردایەتی دەبێتە ئەندامی کەرتی ڕێکخستن و دواتر دەکرێتە ڕابەری سیاسی کەرتی دوو، لەو کاتەوە تا دوای ڕاپەڕین چەندین پلەو ئەرك و بەرپرسیارێتی باڵای پێ سپێردراوە، لە ساڵی ٢٠٠٢ دەبێتە بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشی هەرێم- ئیدارەی سلێمانی، مامۆستا سەیفەدین شەش منداڵی هەیەو ئێستا لە سنووری هەولێر گوندی پیرداود دەژی

تـەواو بوونـی ئەرکەکانیـان دەهاتـن مراباتـی نێـوان هەولێـرو کۆیەیـان کـۆ دەکـردەوە، بـۆ ئەمـەش نەخشـەی چالاکیەکـی دارشـت. کاك ئەحمـەد تـەواوی پێشـمەرگەکانی کەرتـی دووی دابەش کـرد بەسـەر چـوار بـەش دا بەشـی یەکـەم بـە سەرپەرشـتی مـام عەبـاس ئیلنجاغـی لەبـەری جـادە بـەلای کۆیـەدا ؛ ئەرکـی ئـەم مەفرەزەیـە ئـەوە بـوو ئەگـەر هێزەکانـی عێـراق لـە کۆیـەوە هاتـن بـە هانـای هێزەکانیـان ئـەوا لێـی بـدەن و ڕێگـەی نـەدەن پێشـڕەوی بـکات و پەلامـاری هێزەکانمـان بـدات، مەفـرەزەی دووەم بـە سەرپەرشـتی شـەهید حەمەزیـاد تاڵەبانـی لـە پشـتی جـادەوە بـۆ لێـدان لـەو ڕەبیـە سـەربازیەی کـە کەوتبـوە دامێنـی باواجـی تاکـو مەشـغوولی بکـەن و نەتوانـن بێـن بـۆ هـاوکاری هێزەکانـی سـەر جادەیـان، دوو مەفرەزەکـەی تریـش لەسـەر جـادەی گشـتی لـە بۆسـەدا بـن، مەفـرەزەی یەکـەم بەسەرپەرشـتی شـەهید بەکـر ئیلنجاغـی بـوو، مەفـرەزەی دووەمیـش کـە شـەهید ئەحمـەد خـۆی ڕاسـتەوخۆ سەرپەرشـتی دەکـرد، کاتژمێـر چـوارو نیـوی عـەسر دوو ئیڤـاو ناقیلەکـە بـەدوای یەکـدا هاتـن ؛ ئیـتر لەلایـەن هـەردوو مەفرەزەکـەوە هێزەکـەی حکومـەت درایـە بـەر ڕێژنـەی گوللـەو شـەڕ دەسـتی پـێ کـرد، دوای چارەگێـك هێزێکـی حکومـەت لـە سـەربازگەکەی کۆیـەوە هاتـن بەهانـای هێزەکەیـان لـە پـردی سـاماڵ بـەڵام لەلایـەن مەفرەزەکـەی مـام عەباسـەوە لێیـان درا،

شەڕەکە تا دەمەو ئێوارەی خایاندو هێزەکانی حکومەت زیانیان زۆر بوو، ئێمەش بێ زیان بووین[1].

هەر لەبارەی داستانەکەی پردی سامالەوە بابەشێخ گوتی: دوای نەخشە کێشانی ئەم چالاکیە، شەهید ئەحمەد قەمبەری فەرماندەی کەرتەکە، مەفرەزەکەی ئێمەی ڕاسپارد تا لە تەمتەمە شاخەکانی خوار پردی سامالەوە لەبۆسەدا بین بۆ ئەوەی لەو هێزە بدەین کە پێشبینی دەکرا لە کۆیەوە بەهانای هێزەکەیان بێت، مەفرەزەکەی ئێمە بریتی بووین لە مام عەباس ئیلنجاغی فەرماندەی مەفرەزە، شەهید بێکەس، خەبات، ڕەووف، من، دوای ئەوەی دوو ئیڤاو ناقیلەکە کەوتنە بۆسەی مەفرەزەکانی ترمان و لێیان درا، هێزێکی گەورەی حکومەت لە سەربازگەی کۆیەوە بەرەو شوێنی شەڕگەکە هاتن و ئێمەش لەو هێزەمان دا و شەڕ دەستی پێ کرد تا نزیک ئێوارە، دوای ئەوەی هێزەکەی حکومەت شکستێکی کەمەرشکێنیان پێ کەوت تەواوی پێشمەرگەکانی کەرتی دوو بێ هیچ زیانێک بەرەو گۆپتەپە گەڕاینەوە، ئەوەی شایەنی گێڕانەوە بێت خەڵکی گۆپتەپە بە

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ سەلام مام عەباس لە ڕێککەوتی ٢-١١-٢٠٢٠

ناوی تەواوی سەلام عەباس حەمەدەمینە، لە ساڵی ١٩٦٢ لە گوندی ئیلنجاغی دەشتی کۆیە لە دایك بوە، لە نەورۆزی ١٩٨٢ لە هەرێمی دەشتی هەولێر لە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان دەبێتە پێشمەرگە، ئێستا خانەنشینی دێرینەو لە گوندی ئیلنجاغ دەژی.

ژن و پیاوەوە لەپێشوازیمان بوون و هەواڵی سەلامەتی ئێمەیان دەپرسی و هەموویان ئاویان بۆمان هێنابوو[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ ئەحمەد حەمەدەمین ئەحمەد ناسراو بە بابەشێخ لە ٢-١١-٢٠٢٠

ناوی تەواوی ئەحمەد حەمەدەمین ئەحمەدە، لەساڵی ١٩٦١ لەگوندی ئیلنجاغی دەشتی کۆیە لەدایك بوە، لە ٢١-٥-١٩٨١ لە هەرێمی دەشتی هەولێر لە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستانی دەبێتە پێشمەرگە، ئێستا کەمئەندامی سەنگەرەو لەگوندی ئیلنجاغ نیشتەجێیە.

# پاڵەوانێك لەپێناسەی هاوڕێکانیدا

لەبارەی کەسێتی شەهید ئەحمەد قەمبەریەوە زۆر لە هاوڕێ و هاوسەنگەرو کەسە نزیکەکانیم دواند، تەنانەت ئەوانەشم هێنایە گۆ کە ڕۆژگارێك لە تەمەنی منداڵی و گەنجی، لە کاری شوانی و سەپانی و وەرزێری، لە ژیانی پێشمەرگایەتی هاوڕێی بوون. هەموویان بێ کەم و زیاد باسی ڕەوشت بەرزی و هێمنی و ژیری و دەستپاکی شەهید ئەحمەدیان کرد. ئەو ناساندن و پێناسەیەی بەویان بەخشی لەبەر خاتری هیچ کەسێك نەبوو تەنانەت لەبەر ئەوەش نەبوو کە ناوبراو لەژیاندا نەماوەو جۆرێك بێت لە مردوو پەرستی بەڵکو ڕاستیەکی بەرجەستەبوی ئەویان خستە ڕوو.

یەك لەو پێشمەرگەو کادرانەی کە ڕۆژگارێك لەگەڵ شەهید ئەحمەد قەمبەری ژیاوەو بۆ ماوەیەك کادری ڕێکخستنی کەرتەکەی بوە ' سەفین مەلا قەرەیە، لەو بارەیەوە دیمانەیەکمان لەگەڵی ساز دا:

پرسیار: یەکەم جار کەی و لەکوێ ئەحمەد قەمبەریت ناسی ؟

وەڵام : لـە کۆتایـی سـاڵی ١٩٨٠ ئێمـە لەگـەڵ شـەهید عەلـی ساڵح لـە دەشـتی کۆیـە بوویـن، کاك ئەحمـەد تـازە لەسـەرکردایەتی گەڕابـوەوەو هاتـە لای ئێمـە ٬ لـەوێ بینیـم و یەکترمـان ناسـی ، ڕۆژان و سـاڵانی دواتـر بوینـە دوو هـاوڕێ و ئاشـنای یەکـتر.

پرسـیار : ئەحمـەد قەمبـەری بـاوەڕی پتـەوی بـە یەکتـا پەرسـتی هەبـوو لـە هەمـان کاتـدا کادری کۆمەڵـەش بـوو٬ ئایـا چـۆن توانیبـووی هاوسـەنگی نێـوان ئایـن و ئایدیۆلۆژیـا ڕابگرێـت لەکاتێکـدا کۆمەڵـە زادەی فەلسـەفەی ماکسـیزم بـوو ؟

وەڵام : کاك ئەحمـەد لـە هەنـاوی کۆمەڵگەیـەك هاتبـوە دنیـاوە و گـەورە بـوو بـوو کـە پـڕ بـوو لـە ململانێـی چینایەتـی، دەتوانـم بڵێـم بەهـۆی چەوسـانەوەی چینایەتیـەوە بەشـێوەی خۆڕسـك هەڵگـری ئایدیۆلۆژیـای چـەپ بـوو جگـە لـەوەی کۆمەڵـە پـەروەردەی کـرد بـوو ٬ لەهەمـان کاتـدا کۆمەڵگـەی کوردسـتان کۆمەڵگەیەکـی موسـڵمانەو وابەسـتەیە بـە ئایـن و بنەماکانـی ٬ ئەویـش وەك هـەر تاکێکـی ئـەم کۆمەڵگەیـە بـاوەڕی بەپیرۆزیـەکان و بەهـا ئاینیـەکان هەبـوو، هـەر بۆیـە شـەهید ئەحمـەد لەلایـەك کۆمەڵـە بـوو بـۆ هەڵتەکاندنـی بیـری کۆنەپەرسـتی و دواکەوتوویـی و چەوسـانەوە ٬ لەلایەکـی تـر پابەنـد بـوو بـە سـەرەتاکانی ئاینـی ئیسـلام ٬ توانیبوشـی بەباشـی گوزارشـت لەهـەردوو بیرکردنـەوەو ئاراسـتەکەی بـکات، دەبێـت ئـەو ڕاسـتیەش بزانیـن گەرچـی

کۆمەڵـە لەسـەر ڕەگ و ڕیشـەی ئایدیۆلۆژیـای مارکسـیزم دامەزرابوو بـەڵام واقعـی کۆمەڵگـەی کوردسـتانی بـاش خوێندبـوەوەو ئـازادی تـەواوی دابـوە ئەندامەکانـی لەپەیـڕەوی کـردن و پابەنـد بوونیـان بـە ئاینـی ئیسـلامەوە هـەر بۆیـە کاك ئەحمـەد یەکێـك بـوو لـەو کادرە زرنگانـەی توانیبـووی هاوسـەنگی نێـوان ئایـن و ئایدیۆلۆژیـا ڕاگرێـت و بـاوەڕی پتـەوی بـە هـەردوو ئاراسـتەکە هەبـوو، کادری وەك کاك ئەحمـەد قەمبەریـمان زۆر بـوو بـۆ نموونـە شـەهید عەلـی سـاڵح ' شـەهید مـەلا عەزیـز بەردەسـپی ' شـەهید کاوە مەخمـووری و چەندینـی تـر .

پرسـیار : ئاسـت و توانـاو بەرپرسـیارێتی شـەهید ئەحمـەد قەمبەری چـۆن هەڵدەسـەنگێنی بـۆ سـەرکردایەتی کردنـی کەرتێکـی ئـەو ڕۆژگارە کـە ناوچەیەکـی فراوانـی لەبـەر دەسـت بـوو ' لەلایەکـی تـر دەسەڵاتیشـی زۆر بـوو لـە ناوچـە ئازادکـراوەکان ؟

وەڵام : ئاسـت و توانـاو بەرپرسـیارێتی بابەتێکـی ڕێژەییـەو لەکەسـێکەوە دەگۆڕێـت بـۆ کەسـێکی تـر، گەرچـی شـەهید ئەحمـەد نەخوێنـدەوار بـوو بـەڵام مـاوەی پارتیزانـی لـەدوای دەسـتپێکردنەوەی شـۆڕش بـۆ ئـەو بـوە فێرگـەو قوتابخانەیەکـی گـەورە و زانیاریەکـی لەبـن نەهاتـوو لـەکاری پێشـمەرگەیی و چۆنیەتـی مامەڵـە کـردن لەگـەڵ پێشـمەرگەو هاوڵاتیـان بـۆ ئـەوەی ئەکادیمیانـە زانستی سـەربازی و پەروەردەیـی خوێندبێـت،

بۆیە دەتوانم بڵێم فەرماندەیەکی سەرکەوتوو بوو لە هەموو ڕوویەکەوە[1].

بەو هۆیەی بەندە زۆر لەناو خێزانە ژیاوم و وەك کوڕی چوارەمی ئەو خێزانە تەماشا کراوم ، بەر لەوەی زێنەب دایکی شەهید ئەحمەد قەمبەری وەفات بکات چیرۆکی ژیانی شەهید ئەحمەدی بۆ باس کردووم چونکە دەمێك بوو دەمویست چیرۆکی پاڵەوانەکانی کوردستان ، ئەوانەی بەبێ هیچ مەبەست و پاڵنەرێکی شەخسی ببوونە پێشمەرگەو بەشداری بەرچاویان کردبوو لە جەنگی ڕزگارکردنی کوردستان بنوسمەوەو لە شەهید ئەحمەدەوە دەست پێ بکەم. منیش بە ئامانەتەوە گوزارشتەکانی وەك خۆی دەنوسمەوە تەنها ئەوە نەبێت قسەکانیم ڕێکخستوەو شێوازی ڕێزمانیم پێ بەخشیوە، زێنەب گوتی:

١- گفتوگۆ لەگەڵ سەفین مەلا قەرە لە ڕێککەوتی ٣-٢-٢٠٢١

ناوی تەواوی مەناف نادر قادرە ، بە سەفینی مەلا قەرە ناسراوە، لەساڵی ١٩٥٦ لە گوندی مەلا قەرە هاتۆتە دنیاوە، دەرچووی ئامادەیی کشتووکاڵیە، لە هاوینی ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندی کردوە بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، لە بەرواری ١٢-٩-١٩٨٠ لە هێزی دەشتی هەولێر ( قوەی هەولێر ) لە ڕیزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان دەبێتە پێشمەرگە، پلەکانی پێشمەرگایەتی بەم شێوەیە بڕیوە : فەرماندەی مەفرەزە، فەرماندەی کەرت، جێگری فەرماندەی تیپ، فەرماندەی تیپ، فەرماندەی لەشکر، ئەندامی سەرکردایەتی ئێستا خانەنشینی دێرینەو لەشاری هەولێر نیشتەجێیە

ئـەو سـەردەمەی ئەحمـەد لەدایـك بـوو بـەراورد بـە ئێسـتا ژیـان و ئامرازەکانـی ژیـان سـادە و دەسـتکەوتنیان سـەخت بـوون، بـۆ نموونـە سـەیارەو تراکتـۆرو دەڕاسـەو مەکینـەی درومـان و مەکینـەی ئـاو نەبـوو، دەسـکەوتنی خـۆراك و پۆشـاك و جلوبـەرگ زۆر گـران بـوو، پـارە بەئاسـانی دەسـت نەدەکـوت، کەرەسـتەی پاککـەرەوەی وەك سـابوون و تایـت زۆر دەگمـەن بـوو لەجێـی ئـەوان شـتێك هەبـوو پێیـان دەگـوت گـر (گڵ) ' بـەو گرە خەڵك خۆی دەشوشـت و منداڵـی پـێ پـاك دەکـردەوە لـە جیاتـی سـابوون و تایـت، بـۆ منداڵانیـش نـە دایبـی هەبـوو نـە شـیری قوتـوو، هەندێـك ژن بـە شـێوەی سورشـتی یـان بـە هـۆی نەخۆشـیەوە شـیری کـەم بـوو ئیـدی منداڵەکەشـی هەمیشـە برسـی دەبـوو سـەرەڕای ئـەوەی کـە منـداڵ نەخـۆش دەکـەوت داو و دەرمـان نەبـوو و خەڵـك بەئاسـانی نەدەگەیشـتە شـار تـا منداڵەکانیـان چارەسـەر بکـەن. ئەحمـەد وەك هـەر منداڵێکـی تـری ئـەو سـەردەمە بـەو قۆناغـە سـەختەدا تێپەڕیـوەو ئێمـەش پێـوەی مانـدوو بوویـن، تـا تەمەنـی بـوە دوو سـاڵ شـیری خۆمـم پـێ دا، ئەگـەر بـەراوردی بکـەم بـە منداڵـە هاوتەمەنەکانـی خـۆی کەمـتر لـەوان کێشـەو گرفتـی هەبـوە، منداڵێـك بـوو کـەم دەگریـا و هـاوار هـاواری نەدەکـرد، عەجـوول و سـەرکێش و بێعـار نەبـوو، ڕقـی نەدەگـرت و تەریـك نەبـوو. دوای دوو سـاڵەش هەڵسـوکەوت و ڕفتـارو ئـاکاری خـراپ

نەبوو و لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆیدا دەگونجاو یاری دەکرد، شەڕانگێز نەبوو، تا گەورەش بوو کەس نەهاتە لامان ناوی بەخراپ بهێنێت یان سکاڵای لەسەر بکەن .

کە تەمەنی گەیشتە دە دوانزە ساڵان هەستم پێ دەکرد وەك کەسێکی گەورە نەك منداڵ خۆی نیشان دەدا و دەیویست ئەمەش بەکردەوە بسەلمێنێت، بۆ نموونە کە باوکی کاری دەکرد دەیویست هاوکاری بکات و بەشێك لە ئەرکەکانی رۆژانەی بخاتە سەر شانی خۆی ' ئەمەم لە منداڵانی تری هاوتەمەنی خۆی کەم دەبینی، لە هەرەتی گەنجیشدا کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ و خاوەنی خوو و ڕەوشتی بەرز بوو، نەدەچووە ئەو ماڵانەی کچی عازەبیان هەبوایە یان ئەگەر ماڵە خزمێك بهاتنایەتە ماڵمان و کچی عازەبیان هەبوایە ئەو دەڕۆیشتە دەرەوەو شەرمی دەکرد.

کە گەورەش بوو ڕێزی من و باوکی و خزم و دەرو دراوسێو خەڵکی تری زۆر دەگرت تەنانەت ڕێزی بۆ ئەوانەش دادەنا کە لەخۆی بچووك تر بوون، هەمیشە بە (کاك ) بانگی پیاوانی ئاوایی و هاوتەمەنەکانی خۆی دەکرد، کاروباری ڕۆژانەی وەکو جوت کردن و دروێنەو خەرمان کوتان و قوڕکاری و ئاودێری بە باشی ڕادەپەڕاند، یەك لە خاسیەتەکانی ئەوە بوو هەر بەڵێنێکی بدایە جێبەجێی دەکردو لەقسەکردندا ڕاستگۆ

بــوو، ئەحمــەد هــەر لەگەنجیــەوە مەعیــدەی ئــازاری هەبــوو ' نەیدەتوانـی هەمـوو خواردنێـك بخـوات بەتایبەتـی سـاوارو بـڕووش و كفتــە، خواردنــی ئــەو ســەردەمەش كەنگــرو كاردی و ســاوارو بــڕووش و لۆبیــاو تۆڵەگــەو بامیــەو تەماتــە بــوو، هەندێــك جــار لەبـەر دڵـی مـن خواردنەكـەی دەخـوارد گـەر مەعیدەیشـی ئـازاری پــێ بگەیشــتایە.

كـە بـوە پێشـمەرگەش هەڵسـوكەوتە باشـەكانی نەگـۆڕا، زۆر جـار لەگـەڵ هاوڕێكانـی دەهاتـەوە مـاڵ ' ئێمـەش لەبـەر ئـەوان برنـج و گۆشـتمان ئامـادە دەكـرد، بیرمـە جارێكیـان كـە هاتـەوە كۆمەڵێك پێشــمەرگەی لەگــەڵ بــوو ' وا هەســتم كــرد زۆر لاوازو بێهێــز بـوە بۆیـە ویسـتم نـاو ناندێنەكـە بەجیـا قاپێـك گۆشـتی بدەمـێ بیخـوات بــەڵام قبووڵــی نەكــردو گوتــی بــێ هاوڕێكانــم هیــچ شـتێك ناخـۆم و لێـم حەرامـەو جۆرێكـە لـە خیانـەت، لـە كاتـی نـان خواردنیشـدا ئـاگام لـێ بـوو گۆشـتە باشـەكانی بـۆ ئـەوان دادەنـا، هەروەهـا ئێمـەی دەنـارد جلوبەرگەكانیـان بـۆ بشـۆین و لەڕشـك و ئەسـپێ پاكیـان بكەینـەوە. هەمیشـە دەیگـوت هاوڕێكانـم وەك ئێـوە خـۆش دەوێـت .

لەڕادە بەدەر منی خۆشدەویست منیش بۆ ئەو وا بووم، کە گەورەش بوو وەك منداڵێکی بچووك لە باوەشم دەگرت و ماچم دەکردو بۆنی بەژن و باڵایم دەکرد[1].

محەمەد برای شەهید ئەحمەد لەبارەی کەسێتی و هەڵسوکەوت و ڕفتارو ئاکارەکانیەوە گوتی: چەند ساڵێکی کەم لەو بە تەمەن تر بووم، سەردەمی منداڵی و گەنجی و گەورەبوونمان پێکەوە بەڕێکردوە، هەرگیز لە هیچ قۆناغێکی ژیانمان دڵمان لە یەکتر نەشکاوەو لە یەکتر دڵگیر نەبووین، بە کاکە بانگی کردووم و زۆر ڕێزی منی دەگرت، منداڵێکی بێعارو هارو هاج و شەڕانگێز نەبوو، نەدەچووە بەگژ کەسدا، کە تەمەنیشی بۆ گەنجێتی هەڵکشا گەنجێکی سەرەڕۆ نەبوو بەڵکو شەرمن و لەسەرخۆ و هێمن بوو، هەر کارێکمان پێ بسپاردایە وەك

---

١- زێنەب خدر ئیبراهیم، لە ساڵی ١٩٢٩ لە گوندی سێکانی هاتۆتە دنیاوە، لە ساڵی ١٩٤٧ لەگەڵ ئۆمەر ئەحمەد باوکی شەهید ئەحمەد قەمبەری هاوسەرگیری کردوە، ئۆمەر بەر لە زێنەب هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی تر ئەنجام داوە بەناوی زبێدە شێخ سەلام خەڵکی بانەقەڵاتی سەیدان، لەزبێدە دوو کچی هەبوە بەناوەکانی ڕەحیمەو فاتمە، دوای ئەوەی مام ئۆمەر ژنی یەکەمی بەهۆی نەخۆشیەوە دەمرێت ئنجا هاوسەرگیری لەگەڵ زێنەب دا دەکات، لە زێنەبیش پێنج کوڕی هەبوە بە ناوەکانی محمد ' ئەحمەد ' سلێمان ' خالید ' عەبدولا، بەڵام سلێمان و خالید و زەکیە هەر لەتەمەنی منداڵیدا و مردوون ، ئەوەی جێگەی داخە ئەم خێزانە لە ماوەی پانزە ڕۆژدا دووان لە منداڵەکانی بەناوی خالیدو زەکیە لە تەمەنی حەوت ساڵی و چوار ساڵیدا بەنەخۆشی دەمرن. هەروەها دوو کچیشی هەبوە بەناوەکانی مریەمەو زەکیە. دەستنیشان کردنی زێنەب لە لایەن مام ئۆمەرەوە لە ڕێگەی خزمایەتی و ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەوە بوە کە خەڵکی هەردوو گوندی قەمبەرو سێکانی پێکەوە بەستبووەوە، ژنێکی خانەدان و میوان دۆست و دۆستی شۆڕش و پێشمەرگە بوە، لە ساڵی ٢٠٠١ لە تەمەنی ٧٢ ساڵی لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردوە.

خـۆی جێبەجێـی دەکـردو گوێڕایـەڵ بـوو، شـارەزایی لـە هەمـوو کارێـك پەیـدا کردبـوو، بەرخەوانــی و شـوانی کـردوە، شـوانێکی بــاش بــوو بــۆ مــەڕو ماڵاتەکەمــان، ســەپانی و گێــرەو دروێنــەو جووتــی دەکــردو ئاودێرێکــی بــاش بــوو. بــڕوا ناکــەم هیــچ کەسێکی خەڵکی ئاواییش لێـی دڵگـران بووبـن و هەمـوو خەڵـك خۆشیان دەویسـت چونکـە بەڕاستی دەسـت و دەم و داوێـن پـاك بــوو و ڕێــزی لــە خەڵــك دەگــرت. لــە ژیانــی پێشمەرگایەتیشــدا کەسێکی دڵسـۆزو پـاك و خـاوەن کیانـی هـاوکاری بـوو، جارێکیـان شـەهید ئەحمـەدو شـەهید ڕێبـاز هاتنـە ماڵـی ئێمـەو داوای ١٠ دینـار قەرزیـان لـێ کـردم، منیش پرسـیم بـۆ چیتانـە ؟ گوتیـان دەمانەوێـت هـاوکاری مـاڵ و منداڵەکـەی شـەهید عەلـی سـاڵح بکەیـن ' خۆمـان ١٠ دینارمـان پێیـە تـۆش ١٠ دینارمـان بـە قـەرز بدەیتـێ دەیکەینـە هـاوکاری بـۆ منداڵەکانـی، منیـش گوتـم بـرام مـن بیسـت دینارەکەتـان دەدەمـێ هـەر مەمدەنـەوە[1].

قاسـمی حاجـی عومـەر کـە کوڕی خوشـکی شـەهید ئەحمـەدە گوتی : شـەهید ئەحمـەد خاوەنـی ڕەوشـت و ئـاکاری جـوان و سورشـتێکی دەگمـەن بـوو، چەنـد قازانـج و بەرژەوەنـدی و سـەلامەتی خـۆی دەویسـت سـەد هێندەش هـی دەوروبەرو هاوڕێکانـی، دوو نموونەی زنـدووم لەلایـە، یەکـەم : جارێکیـان خـۆی و پێشـمەرگەکانی هاتنـە

١- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد ئومەر ئەحمەد لە ڕێککەوتی ١٩-٥-٢٠١٩

سێکانی و جوابی بۆ ئێمە نارد کە نیوەڕۆ میوانی ئێوە دەبم و خواردنێکی باش لێ بنێن، دایکیشم چێشتێکی باشی بۆ نیوەڕۆ ئامادە کرد کاتێك نیوەرۆ پێنج پێشمەرگە هاتنە ماڵمان بۆ نان خواردن و گوتیان کاك ئەحمەد ئێمەی ناردۆتە ئێرە، دوایە زانیمان خۆی چوبوە ماڵێکی هەژارو خواردنێکی ئاسایی خواردبوو' وە پێنج پێشمەرگەی لەجێی خۆی ناردە ماڵی ئێمە تا ئەوان گۆشتەکە بخۆن. دووەم : جارێکی تر هاتە ماڵی ئێمە بە باوکمی گوت ئەگەر چوویتە شار سەعاتێکم بۆ بکڕە پارەکەت دەدەمەوە، باوکیشم هەر لەو هەفتەیە چوە کەرکووك لەوێ سەعاتێکی زۆر باشی بۆ کڕی پێیان دەگوت ئۆریان' دایە دەست خاڵم ئەحمەد، باوکم پارەکەی لێ وەرنەگرتەوە گەرچی خاڵم زۆر هەوڵیدا پارەکەی بداتێ، دوای یەك دوو مانگێك بە جەولە هاتنەوە گوندی سێکانی سەعاتەکەی پێ نەمابوو، باوکم لێی پرسی کاك ئەحمەد کوا سەعاتەکەت ؟ ئەویش گوتی پێشمەرگەیەك پێی گوتم سەعاتەکەت زۆر جوانە منش پێشکەشی ئەوم کرد[1].

یەکێك لەهاوڕێ نزیکەکانی شەهید ئەحمەد قەمبەری ماموستا سدیقە کە لە زۆربەی بابەتە سیاسی و فکریەکانی ئەو سەردەمە هاوڕاو هاوبۆچوون بوون و پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان هەبوە،

١- گفتوگۆ لەگەڵ قاسم عومەر خدر لە ڕێککەوتی ٦-٢-٢٠١٩

لـە بـارەی چۆنیەتـی ناسـین و ئاسـت و توانـای بەرپرسـیارێتی شـەهید ئەحمـەدو ڕۆڵـی پێشـمەرگەیی گوتـی: لـە کۆتایـی مانگـی یانـزەی سـاڵی ١٩٨٠ ئـەو کاتـەی تـازە لەنـاو زینـدان دەربـازم ببـووم و گەیشـتبوومە نـاو شـۆڕش، لەگـەڵ زۆرینـەی پێشـمەرگەو کادرەکانـی ئـەو سـەردەمە خۆمـان بـە یەکـتر ناسـاند، یەکێـك لـەو پێشـمەرگەو فەرمانـدە دڵسـۆزو خاکیانـەی کـە ناسـیم شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری بـوو، هـەر زوو بوینـە هاوڕێـی نزیـك، لـە دەشـتی هەولێـرو بەسـتی شـەرغە ماوەیەکـی زۆر پێکـەوە بوویـن، ئـەو فەرماندەیەکـی لێهاتـووی قـوەی دەشـتی هەولێـر بـوو، منیـش بەرپرسـی کۆمەڵـە بـووم لەنـاو جەمـاوەرو پێشـمەرگە، شـەهید ئەحمـەد لـەڕووی هوشـیاری چینایەتیـەوە هەسـتێکی ڕەسـەن و قـووڵ و سورشـتکردی هەبـوو کـە کـەس نەیدەتوانـی فریـوی بـدات، بـە باشـی لـە هاوکێشـە کۆمەڵایەتـی و سیاسـیەکانی سـەردەمەمی خـۆی تێدەگەیشـت، هەروەهـا لـەڕووی سـەربازیەوە فەرماندەیەکـی لێوەشـاوەو خاوەنـی ئازایەتیەکـی بێوێنـە بـوو، ئەگـەر تەمـەن مـەودای بدابـا ئەسـتێرەکەی بـەرەو فەرمانـدەی باڵاتـر هەڵدەکشـا. شـەهید ئەحمـەد خاوەنـی ڕەوشـتێکی بـەرزو نموونەیـی بـوو، ئـەم خاسـیەتە نموونەیـی و دەگمەنـە هـەم لەنـاو جەمـاوەر هـەم لەنـاو هێـزی پێشـمەرگە ڕەنگـی دابـوەو چـاو لـە جوانـی و ڕێ و ڕێبازەکـەی دەکـرا هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو پێگـەی

سەرەکی ڕێکخستنی کۆمەڵەم لە کەرتی تیپ و کەرتی یەکەوە گواستەوە بۆ کەرتی دوو کە شەهید ئەحمەد فەرماندەی بوو ، لەوێ چاکتر کاری ڕێکخستنم ڕادەپەڕاند چونکە ئاسوودە بووم بە هاوڕێیەتیان[1].

یەك لەپێشمەرگەکانی کەرتی دوو کە زۆر سەرسام بوە بە کەسێتی شەهید ئەحمەد ، ڕەزاق گەرمکیە، ڕەزاق گوتی : دەتوانم کەسێتی شەهید ئەحمەد بۆ سێ جۆر پۆلین بکەم، جۆری یەکەم لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە : هەڵسووکەوت و ئاکارو ڕفتاری مایەی سەرنجی خەڵك و هاوڕێکانی بوو ، دەیویست تەواوی پێشمەرگەی کەرتەکەی خاوەنی هەمان خاسیەتی ئەو بن کە بریتی بوو لە دەست پاکی ، ڕەوشت بەرزی ، سادەو خاکی ، دەم پاکی. خۆی بەگەورە نەدەبینی و لەخۆبایی و لووت بەرز

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا سدیق لەڕێککەوتی ٢٩-٦-٢٠٢٠

ناوی تەواوی سدیق ساڵح عەزیزە، برای شەهید جەمیل ڕەنجبەرە هەر بۆیەش بەشێك لە هاوڕێکانی دوای شەهید بوونی جەمیل ڕەنجبەر بە سدیق ڕەنجبەر بانگیان کردوە، لە ساڵی ١٩٥٤ لەگوندی گۆمەگرِوی سەر بەناحیەی قوشتەپە لە دایك بوە، لە ساڵی ١٩٧٤ خانەی مامۆستایانی تەواو کردوەو لە هەمان ساڵدا بوە بەپێشمەرگەو مامۆستا لە شۆڕشی ئەیلوول، لەساڵی ١٩٧٠ پەیوەندی دەکات بە ئەڵقە ڕۆشنبیریەکانی کۆمەڵەی مارکسی-لینینی، لە ساڵی ١٩٨٠ لەکاری ڕێکخستن ئاشکرا دەبێت و دەستگیر دەکرێت، پاش چەندین مانگ دەتوانێت پەنجەرەی بەندینخانە بشێکێنێت و خۆی دەرباز بکات، لە مانگی یانزەی هەمان ساڵ دەبێتە پێشمەرگە، ساڵانی دواتر تا ساڵی ١٩٨٥ دەکرێت بە لێپرساوی کەرتی ڕێکخستنی ڕەواندوز، ئەندامی کۆنفرەنسی یەك و سێی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوە ، خاوەنی چوار منداڵەو ئێستا لە وڵاتی هۆڵندە نیشتەجێیە.

نەبوو، یەکێك لەخاسیەتە باشەکانی ئەوە بوو کە ناوچەگەرێتی نەدەکرد و هەموو ناوچەو شارەکانی کوردستان بە ناوچەو شاری خۆی دەزانی لە کاتێکدا بەشێك لە فەرماندەکان ئەقلیەتی ناوچە گەریتی بەسەریاندا زاڵ بوو. جۆری دووەم لەڕووی سیاسیەوە : وێرای ئەوەی نەخوێندەوار بوو بەڵام بەئاشکرا درکی بەو ڕاستیە دەکرد کە گەلی نەخوێندەوار زوو ناگات بە ئامانج و ئاواتەکانی ' بۆیە خۆ فێر کردن و خۆ پێگەیاندنی لەخۆیەوە دەستی پێ کرد ' ئەو پێشمەرگانەشی هان دەدا کە خوێندەوار نەبوون تا خۆیان فێرە خوێندەواری بکەن و کتێب بخوێننەوە، بە درێژایی ئەو ماوانەی دەست بەتاڵ بووین خۆم فێرە خویندەواری کرد بەجۆرێك ئێستا سەدان کتێبم خوێندۆتەوە. دوای قاڵ بوونەوەی لە ژیانی پێشمەگایەتی و بینینی سەدان کۆبوونەوەو گوێ گرتن لە ووتارە ڕادیۆییەکان و لێدوانە سیاسیەکان ' بوو بوو بە سیاسیەکی زرنگ و سەری دەردەچوو لەهاوکێشە سیاسیەکان و تاکتیکی سیاسی . سێیەم لە ڕووی سەربازیەوە : بەو هۆیەی شەهید ئەحمەد لە ساڵی ١٩٧٦ وە پێشمەرگە بوو ' بوو بوو بە یەك لە فەرماندە هەرە شارەزاو ئازاکانی کوردستان بە جۆرێك وا هەستت دەکرد کە دەرچووی کۆلیژی سەربازی بێت هێندە شارەزا بوو بوو لە کاری پارتیزانی و چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دووژمن دا

و بەکارهێنانــی دەیـان تاکتیکـی سـەربازی، ترسـی خسـتبوە دڵـی دووژمنــەوە[1].

گەرچــی مامۆســتا گوشــاد عەبدولڕەحــمان لــە ڕاگەیانــدن و چاپەمەنیەکانــی ئەوســای شــۆڕش پێشــمەرگە بــوە بــەڵام زۆر جـار کـە بەجەولـە گەڕاوەتـەوە دەشـتی هەولێـر هەمیشـە لەگـەڵ شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری و پێشـمەرگەکانی کەرتـی دوو جەولـەی پێشـمەرگانەی کـردوە ' بۆیـە مامۆسـتا گوشـاد لەنزیکـەوە ئـاگاداری هەڵسـوکەوتی پێشــمەرگانەی شــەهید ئەحمــەدو ئــاکارو ڕفتــاری کۆمەڵایەتـی و توانـا سـەربازیەکەی بـوە، لەبـارەی کەسـێتی گشـتی شـەهید ئەحمـەد قەمبەریـەوە گوتـی : گەرچـی شـەهید ئەحمـەد نەخوێنـدەوارو کـوڕە جوتیـار بـوو بـەڵام بەهـەوڵ و ماندووبونـی خـۆی بــوو بــە یەکێــك لــە فەرمانــدە هــەرە ئــازاو خــاوەن دسـپلینە سیاسـی و سـەربازیەکان، زۆر پابەنـد بـوو بـەو دسـپلینە سیاسـیەی کـە بەرژەوەنـدی گشـتی بخاتـە پێـش بەرژەوەنـدی حـزب و بەرژەوەنـدی حـزب بخاتــە پێــش بەرژەوەنــدی خــۆی ئەمــەش لەوپـەڕی قـووڵ بوونـەوەو قاڵبوونـەوەی سیاسـیەوە سـەرچاوەی

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ ڕەزاق گەمکی لە ڕێککەوتی ٨-١١-٢٠٢٠

نـاوی تـەواوی ڕەزاق عەبدولڕەحـمان سـەعیدە، لەسـاڵی ١٩٥٧ لـە گونـدی گەرمکـی سـەر بـە ناحیـەی تـەق تـەق لـە دایـك بـوە، لـە ٢٠-٩-١٩٨٠ لەهەرێمـی دەشـتی هەولێـر لای شــەهید عەلــی ســاڵح دەبێتــە پێشــمەرگە ' دواتــر لەکەرتــی دوو درێــژە دەدات بــە پێشـمەرگایەتی، لەشـاخ خـۆی فێـرە خوێنـدەواری کـردوە، ئێسـتا لـە ناحیـەی تـەق تـەق دەژی و خانەنشـینی مەدەنیـە.

گرتبـوو، كاك ئەحمـەد هێنـدە شـارەزای كاروبـاری پێشـمەرگانەو چـەك و چەكـداری و تاكتيكـی جەنـگ و كاری پارتيزانـی بـوو وا دەهاتـە بەرچـاو كـە دەرچـووی فێرگـەو كۆليـژی سـەربازی بێـت، بـۆ پێشـمەرگەو كاری پێشـمەرگانە بـوو بـە مەدرەسـە بۆيـە پێشـنيار دەكـەم كـە خـوو و ڕەوشـت و ئـاكارو دڵسـۆزی و لەخۆبوردەيـی و شـارەزايی و ئەزموونەكانـی بخرێتـە نـاو پرۆگرامـی كۆليژی سـەربازی و خوێندنـی ناوەنـدە سـەربازيەكان چونكـە دەبێتـە بنەمايەكـی پتـەو بـۆ كاروبـاری سـەربازی ئێسـتای وڵات[1].

شـەريف كوێخـا سـاڵح گەرمكـی يـەك لـەو پێشـمەرگانەيە كـە بـۆ ماوەيـەك هـاوڕێ و هاوسـەنگەری ئەحمـەد قەمبـەری بـوە ' لـە چێشـتەنگاوێكدا دوانـدم و گوتـی : جيـاوازی شـەهيد ئەحمـەد قەمبـەری كـە فەرمانـدەی كەرت بوو لەگـەڵ فەرمانـدەكانـی تر ئەوە بـوو بەهيـچ شـێوەيەك و لەهيـچ كارێكـدا خـۆی جيـا نەدەكـردەوە لەپێشـمەرگەكانی كەرتەكـە، بـە واتايەكـی تـر وەك فەرمانـدە خـۆی دەرنەدەخسـت و لافـی پێـوە لـێ نـەدەدا تـا دەوروبەری وا هەسـت بكـەن كـە ئـەو فەرمانـدەی كەرتـەو خاوەنـی هەموو بڕيارێكـە ' هەر ئـەم خاسـيەتەش بـوو وای لێكردبـوو فەرماندەيەكـی خۆشەويسـت

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ مامۆستا گوشاد لەڕێككەوتی ٢٩-٦-٢٠٢٠

ناوی تـەواوی گوشـاد عەبدولڕەحـمان بايـزە، لـە سـاڵی ١٩٥٦ لـە گونـدی ئيلنجاغی دەشـتی كۆيـە لەدايـك بـوە، دەرچـووی كۆليـژی ياسـايە لـە زانكـۆی سـلاحەدين، سـاڵی ١٩٨١ دەبێتـە پێشـمەرگە، چـوار منداڵـی هەيـەو ئێسـتا لـە قـەزای كۆيـە نيشـتەجێيە

و دەستڕۆیشتوو بێت و هەمیشە بڕیارەکانی جێبەجێ بکرێت، من نەمبینیوە هیچ پێشمەرگەیەك توانیبێتی لە کەرتی دوو لاساری بکات و گوێڕایەڵی کاك ئەحمەد نەبوبێت. بۆ نموونە دەیگوت دەبێت پێشمەرگە خاوەنی سیفەتی دەست و دەم و داوێن پاکی بێت , خۆی لەپێشەوە ئەم ئامۆژگاریەی جێبەجێ دەکرد ئنجا بەسەر پێشمەرگەدا دەیسەپاند[1].

محەمەد عەبدولا مەولوود ئۆمەرگومبەتی گوتی : ئەو کاتەی شەهید ئەحمەد دەهاتە ماڵی ئێمە من خوێندکار بووم و داوای لێ دەکردم فێرە خوێندەواری بکەم، منیش بەپێی ئەو توانایەی هەمبوو و لە مامۆستاکانمەوە فێر بووبووم ' ئەلف و بێی کوردیم فێر دەکردو بەحینجە پیتەکانم لە ئەلفەوە پێ دەگوت، گەرچی ئەو بەتەمەنیش بوو بەڵام باش فێرە خوێندەواری ببوو، هەر جارێك دەهاتە ماڵی ئێمە لەجارەکانی پێشوو باشتر بوو، هەموو جارێکیش پێی دەگوتم ئەم چاکەیەی تۆ لە بیر ناکەم ' تۆ نەوەی ئایندەی ئەم وڵاتەی ' دەزانم دوای تەواو کردنی خوێندن دەبی بەپێشمەرگە، منیش بەو قسەیەی بستێك باڵام دەکرد، گەرچی بەهۆی خراپی هەلومەرجی سیاسیەوە خوێندنم پێ

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ شەریف کوێخا ساڵح گەرمکی لە ڕێککەوتی ١٤-١٢-٢٠٢٠

ناوی تەواوی شەفیق حەمە ساڵح حەمەدەمینە، لە ساڵی ١٩٥٤ لەگوندی گەرمکی تەق تەق لەدایك بوە، لە ساڵی ١٩٨٢ لە تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر لە کەرتی دوو دەبێتە پێشمەرگە، ئێستا خانەنشینی دێرینەو لەناحیەی تەق تەق نیشتەجێیە.

تـەواو نەکـرا بـەڵام دواتـر بـووم بەپێشـمەرگە، شـەهید ئەحمـەد منداڵانـی زۆر خۆشدەویسـت و هەمیشـە هانـی منداڵانـی دەدا تـا بخوێنیـن و گەلەکەمـان لـەم کوێرەوەریـە ڕزگار بکەیـن[1].

کازم ئاوماڵـی یەکێـك بـوە لـە هاوڕێـی سـەردەمی پێشـمەرگایەتی شـەهید ئەحمـەد، لەبـارەی کەسـێتیەوە گوتـی : فەرماندەیەکـی دەسـت و دەم و داوێـن پـاك بـوو، هەمـوو خەڵکـی بەخوشـك و بـرای خـۆی دەزانـی، لەهەمـوو کۆبونەوەکانـی تەئکیـدی لـەوە دەکـردەوە کـە دەبێـت ژنـان و کچانـی خەڵـك بـە خوشـك و دایکـی خۆمـان بزانیـن و هەرکەسـێك لەمەبدەئـی پاکـی لابـدات دەبێـت سـزا بدرێـت و کۆمەڵـە قبووڵـی نـاکات، بـرادەری هەمووومـان بـوو و ئێمـەی لەخـۆی خۆشـتر دەویسـت، زۆر ڕقـی لـەدرۆ دەبـووەوە ' هـەر کەسـێك درۆیەکـی لەگـەڵ بکردایـە لەپێـش چـاوی دەکـەوت، هەمیشـە لەگـەڵ خۆشـی و ناخۆشـیەکانی پێشـمەرگەدا ژیـاوە، وەك ئێمـە دەهاتـە بۆسـە دانانـەوەو وەك ئێمـە حەرەسـیاتی دەگـرت و نـان و خـۆراك و جلوبـەرگ و پێـڵاوی وەك ئێمـە بـوو، هەرگیـز خـۆی جیـا نەدەکـردەوەو حـەزی بەدەعـوەت و نانـی تایبەتـی نەبـوو، گـەر دەعوەتیشـیان بکردایـە زۆر جـار کۆمەڵێـك پێشـمەرگەی لـە جیاتـی خـۆی دەنـارد تـا ئـەوان خواردنـە باشـەکە بخـۆن، تـا بڵێـی ئـازا بـوو و لـە گوللـەو هێرشـی دووژمـن نەدەترسـا، پیاوێکـی

---

[1] - گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد عەبدوڵا مەولوود لە ڕێککەوتی ١٩-٨-٢٠١٩

ووره بەخش بوو، هەموومان باوەڕی پتەومان پێ بوو و پێمان وابوو گەر ئەومان لەگەڵ بێت هیچ هێزێك دەرەقەتمان نایەت[1].

دلێر کانی لەلەیی یەکێك بوو لە هاوڕێ پارتیزانەکانی و تا ساتە وەختی شەهید بونیشی لەگەڵی بوو، گوتی: یەکێك بوو لە فەرماندە هەرە ئازاکانی شۆڕشی نوێ، جارێکیان مامەڕیشە هاتە دەشتی هەولێرو سنووری سێگردکان، هەموو خەڵك بەپێشمەرگەکانیشەوە زۆر عەوداڵ بوون تا مامەڕیشە لەنزیکەوە ببینن چونکە ناوبانگی مامەڕیشە لە هەموو کوردستان دەنگی دابووەوە کەچی مامەڕیشەش دەگەڕا تا شەهید ئەحمەد قەمبەری بدۆزێتەوەو بیناسێت، شەهید ئەحمەد لەپاکی و بێگەردی نموونەی کەم بوو، ژیان و نان خواردن و جلوبەرگی لەگەڵ پێشمەرگە هیچ جیاوازیەکی نەبوو چونکە خۆی دەیویست وەك پێشمەرگە بژی و وەك پێشمەرگە بەشداری شەڕو نەبەردیەکان بکات، کەسێکی ڕەوشت بەرزو دەست و دەم پاك بوو، هەمیشە دەیگوت ئەوەی دەست و دەم و داوێن پاك نەبێت لەم کەرتە جێی نابێتەوە[2].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ کازم ئاوماڵی لە ڕێککەوتی ١١-٢-٢٠١٩

ناوی تەواوی کازم عومەر حەمەدەمینە، لە ساڵی ١٩٦٦ لە گوندی ئاوماڵ لەدایك بوە، لەبەرواری ٢٠-٨-١٩٨٢ لە کەرتی دووی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر دەبێتە پێشمەرگە، ئێستا فەرمانبەری هۆبەی کشتووکاڵی ناحیەی سێگردکانەو لە گوندی ئاوماڵ نیشتەجێیە

٢- گفتوگۆ لەگەڵ دلێر کانی لەلەیی لە ڕێککەوتی ٢٩-٧-٢٠١٩

ماموستا سەیفەدین بۆ ماوەیەك كادرو ڕابەری سیاسی كەرتەكەی شەهید ئەحمەد قەمبەری بووەو هاوڕێی سەدان جەولەو دەیان نەبەردی و پێكدادانەكان و كاری پێشمەرگانەی بووە، ئەویش لەبارەی كەسێتی شەهید ئەحمەدەوە دواو گوتی : یەكێك بوو لەو فەرماندانەی هەرگیز خۆی نەدەدزیەوە لە چالاكی و نەبەردیەكان و هەمیشە خۆی لەدەستەی هێرش بردن دادەنا، وەك پێشمەرگە دەژیا، سادەو خاكی بوو، خاسیەتێكی تری شەهید ئەحمەد ئەوە بوو كە زۆر گرنگی دەدا بە لایەنی ڕۆشنبیری سیاسی و دەیویست پێشمەرگەكان كەسانی هۆشیارو سیاسی بن، بۆ ئەمەش هەمیشە داوای لە من دەكرد ناوەرۆكی ئەو كتێبانەی دەمخوێندەوە بكەمە بابەتی كۆبوونەوە بەپێشمەرگە[1].

بابەشێخ یەك لەپێشمەرگەكانی كەرتی دوو بووەو بۆ ماوەیەك لەگەڵ شەهید ئەحمەد ژیاوەو بەشێك لە یادەوەری ئەو ڕۆژگارەو خاسیەتەكانی شەهید ئەحمەدی باس كردو گوتی : پیاوێكی كۆمەڵایەتی بوو، خەڵك خۆشیان دەویست و پرس و ڕایان پێ دەكردو ڕێزی زۆریان لێ دەنا، كەسێكی سەخی تەبیعەت بوو، جارێكیان بەجەولە هاتینە گوندی سێگردكان، چەند پێشمەرگەیەك چوینە دووكانی ماموستا ڕەسووڵ تا كێك و بیبسی بخۆینەوە، كاتێك كاك ئەحمەد هاتە لامان و

١- گفتوگۆ لەگەڵ سەیفەدین عەلی ئەحمەد لە ڕێككەوتی ٩-٨-٢٠١٩

داوای کێك و بیبسیمان بۆ ئەویش کرد، کردمانە گاڵتەو گەپ و جۆرێك لەگێچەڵ کردن بە کاك ئەحمەد[1] گوتمان تۆ پارەکەی بدە، ئەویش گوتی بەسەر چاو، هەموو گیرفانەکانی گەڕا پارەی نەدۆزیەوە، تومەس نیو دیناری پێ بوو بوو بەڵام بزری کردبوو. کاك علی مەحموودیش هەمان چیرۆکی گێڕایەوەو خۆی یەك لەو پێنج پێشمەرگەیە بوە کە لەناو چیرۆکەکە بوو[1].

مامۆستا بەکر مستەفا یەکێکی ترە لە هاوڕێ نزیکەکانی شەهید ئەحمەد قەمبەری، بە پێویستم زانی ئەم پرسیارانەی ئاراستە بکەم :

-بۆ یەکەم جار کەی بوو شەهید ئەحمەد قەمبەریت ناسی؟

-لە تەمووزی ساڵی ١٩٨٠ بوومە پێشمەرگە لە هەرێمی هەشتی هەولێر، چووینە ناوچەی خۆشناوەتی لە گوندی کونەفلووسە ماینەوە، چەند پێشمەرگەیەك کە من نەمدەناسین لە نزیکمان وەستابوون، فەرماندەکەمان چەکێکی کلاشینکۆفی پێنج بزمارو تاقمێکی شەش مەخزەنیان پێدام کە ئەو سەردەمە باشترین چەك بوو چونکە هێشتا چەکی کلاشینکۆف کەم بوو لەناو هێزی پێشمەرگە، زۆر دڵخۆش بووم کە یەکەم ڕۆژ بوومە پێشمەرگە باشترین چەکیان پێدام بەڵام نیو سەعاتی

١- گفتوگۆ لەگەڵ ئەحمەد حەمەدەمین ناسراو بە بابەشێخ لە ڕێککەوتی ١٣-٢-٢٠١٩

پـێ نەچـوو مامۆسـتا کاوە ( حەسـەن ئەنـوەر) کـە ڕابـەر سیاسـی هەرێمەکـە بـوو چەکەکـەی لـێ سـەندمەوەو دایـە پێشـمەرگەیەك لـەو پێشـمەرگانەی کەنزیکـمان بـوون و نەمدەناسـین، پرسـیم بـۆ لێتـان سـەندمەوەو داتانـە ئـەو برایـە ؟ مامۆسـتا کاوەش گوتـی ئـەو پێشـمەرگەیە نـاوی ئەحمـەد قەمبەریـەو زۆر دەمێکـە پێشـمەرگەیە تـۆش تـازە هاتـووی' دەبێـت چەکـە باشـەکە بدرێتـە کەسـێکی لـە تـۆ مسـتەحەق تـر، بـەو قسـەیە زۆر خۆشـحاڵ بـووم کـە شـۆڕش ڕێـز لـە تێکۆشـەرەکانی خـۆی دەگرێـت و بەچاوی بایەخـەوە لێیان دەڕوانێـت، ڕاسـتیەکەی منیـش ئـەوم لـە خـۆم بـە مسـتەحەق تـر دەزانـی و چـووم پیرۆزباییـم لـێ کـرد. ئـەوە یەکـەم ڕۆژی ناسینی مـن و شـەهید ئەحمـەد بـوو.

- کەسـێتی گشـتی شـەهید ئەحمـەد چـۆن هەڵدەسەنگێنی؟ئاسـت و توانـا سـەربازیەکانی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری چـۆن هەڵدەسـەنگێنی ؟ ئایـا شـیاو بـوو بـۆ ئـەو بەرپرسـیارێتیانەی پێـی سـپێردرابوو ؟

-لەڕاسـتیدا کاك ئەحمـەد خاوەنـی باشـترین کەسـێتی بـوو، دەتوانـم کەسـێتیەکەی لەسـێ ئاسـت بـاس بکـەم، ئاسـتی یەکـەم لەگـەڵ سـەرووی خـۆی ' لـەم ڕووەوە جێـی بـاوەڕو متمانـەی فەرمانـدەی تیـپ و سـەرکردایەتیەکەی بـوو ' گـەر هـەر ئەرکێکـی پێشـمەرگانەیان پـێ بسـپاردایە بـێ کەمـو زیـاد جێبەجێـی دەکـردو

خـۆی نەدەدزیـەوە لەهیـچ ئەرکێـك تەنانـەت گـەر بـە شـەهید بوونیشـی کۆتایـی پـێ بهاتایـە، ئاسـتی دووەم لەگـەڵ خـوارووی خـۆی ' لـەم ڕووەشـەوە زیـادە ڕەوی ناکـەم ئەگـەر بڵێـم هێنـدە خاکـی و گونجـاو بـوو کـە هەمـوو پێشـمەرگەکانی کەرتەکـەی پێوەی پابەنـد بـن و لـە ئـەرك و فەرمانەکانـی لا نـەدەن و گوێڕایەڵـی بـن ' لەنـاو هێـزی پێشـمەرگە یـەك لـە فەرمانـدە هـەرە خۆشەویسـتەکان بـوو، ئاسـتی سـێیەم لەگـەڵ جەمـاوەر' گەرچـی ئـەو فەرماندەیەکـی سـەربازی بـوو بـەلام چونکـە قاڵبـووی ژیانـی پێشـمەرکایەتی و سـەدان کـۆڕو کۆبوونـەوە بـوو بۆیـە بـوو بـوو بـە باشـترین کادری سیاسـی و کۆمەڵایەتیـش ' توانیبـووی بەجۆرێـك جەمـاوەر لەخـۆی ڕازی بـکات تـا ئاسـتی خۆشویسـتن و سەرسـام بـوون پێـوەی، دەتوانـم بڵێـم ڕفتـارو هەڵسـووکەوت و ڕەوشـت و ئـاکاری هێنـدە بـاش بـوون کـە خەڵـك متمانـەی زۆریـان پـێ بێـت, هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو جەمـاوەرو خەڵکـی دەڤـەرە جیـا جیـاکان و گوندنشـین خۆشـیان دەویسـت[1].

دکتـۆر ڕەفعـەت هیدایـەت لەبـارەی کەسـێتیە سیاسـی و چینایەتیەکـەی شـەهید ئەحمـەدەوە گوتـی : گەرچـی نەخوێنـدەوار بـوو بـەڵام بـەو هۆیـەی مەبەسـتی بـوو ڕۆشـنبیریەکی گشـتی پەیـدا بـکات هەمیشـە لەگـەڵ کادرو ئـەو پێشـمەرگانەی خوێندنیـان

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ مامۆستا بەکر مستەفا لەڕێککەوتی ٧-٧-٢٠٢٠

تەواوکردبوو هەروەها لەگەڵ ڕابەری سیاسیەکان دەکەوتە گفتوگۆ سەبارەت بە بابەتە چینایەتیەکان و فەلسەفەی سۆسیالستی و بابەتی سەرمایەداری بۆیە بوو بوو بە ڕۆشنبیرێکی گەورەو تێگەیشتوو، جارێکیان من هاوەڵیان بووم بۆ سەردانی کردنی گوندی پونگینە کە زۆر نزیك بوو لە هەولێرو سەربازگەو ڕەبیەکانی حکومەتەوە، لەو جەولەیەمان دوو پێشمەرگەمان لەگەڵ بوو تازە هاتبوونە ناو شۆڕشەوە بەڵام جلوبەرگی زۆر جوان و نوێیان لەبەر بوو و کیرفانیان پڕ بوو لە پارەو جگەرەی گرێڤن و ڕۆسمەنیان دەکیشاو شێوەیان لەکوڕە دەوڵەمەند دەچوون، شەهید ئەحمەدیش ئەو تێبینیەی لا دروست بوو بوو کە ئەو دوو پێشمەرگەیە زۆر جیاوازن لەپێشمەرگەکانی تر، ئێوارە لە پونگینە نانمان خواردو گەڕاینەوە ناو مزگەوتی گوند، لەوێ شەهید ئەحمەد ویستی کەسێتی ئەو دوو پێشمەرگە تازەیە هەڵبسەنگێنێت و خۆڕاگری و ئازایەتیان تاقی بکاتەوە بۆیە گوتی ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە، شەو مانەوە لە پونگینە زۆر مەترسیدار بوو چونکە ئەمن و مەفرەزە خاسەو جاش بە ئاسانی دەگەیشتنە پونگینەو هیچ پێشمەرگەیەك نەیدەتوانی لەوێ بمێنێتەوە، ئێمە شەهید ئەحمەدمان بە فەرماندەیەکی زرنگ و بەتوانا دەزانی و دەمانزانی لە خۆوە بڕیاری وا نادات بۆیە هەموومان ڕەزامەندیمان نیشاندا تەنها ئەو دوو

پێشـمەرگەیە نەبێـت تەنانـەت هەندێـك قسـەی نەشیاویشـیان کـرد بۆیـە شـەهید ئەحمـەد هـەر لـەوێ هەردووکیانـی چـەك کـردو گوتـی کـوڕە سـەرمایەدار بـۆ پێشـمەرگایەتی ناشـێت[1].

یـەك لـەو پێشـمەرگانەی کـە بـۆ ماوەیـەك جێگـری شـەهید ئەحمەد قەمبـەری بـوە دکتـۆر خـدرە کـە بەمـەلا خـدر نـاسراوە، لەبـارەی توانـاو ئاسـتی هووشـیاری شـەهید ئەحمـەدەوە گوتـی : گەرچـی ئەحمـەد قەمبـەری لـەرووی تەعلیمیـەوە نەخوێنـدەوار بـوو بـەڵام وەك خوێندەوارێکـی شـارەزا لـە فەلسـەفەی مارکسـیزم و هاوکێشـە سیاسـیەکان دەردەکـەوت، بیـر تیـژو وورد بیـن بـوو ' دەیتوانـی گفتوگـۆی هەمەلایەنـە لەسـەر بابەتـە چینایەتـی و نەتەوەییـەکان بـکات، ئـەم ئاسـتە باشـەش لەوەوە سـەرچاوەی گرتبـوو بەدرێژایی چەندیـن سـاڵی پێشـمەرگایەتی بەشـداری دەیـان کۆبوونـەوەو گفتوگـۆی کادرران و ڕابـەر سیاسـیەکان کردبـوو' هەوڵـی دەدا زانیـاری نـوێ دەسـتبکەوێت و کتێبـی بەوانـە دەخوێنـدەوە کـە خوێنـەر بـوون.

مـەلا خـدر لەبـارەی ڕووە سـەربازیەکەی شـەهید ئەحمـەدەوە گوتـی : یەکێـك بـوو لـەو فەرماندانـەی کـە زۆر لەخۆبـووردو بـوو، بەواتایەکـی تـر باکـی بەمانـدوو بـوون نەبـوو و لەمـردن نەدەترسا و هەمیشـە خـۆی لەدەسـتەی هێرشـبەر دادەنـا و هـەر شـوێنێك

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ دکتۆر ڕەفعەت هیدایەت حەمەساڵح لە ڕێککەوتی ٢٤-٦-٢٠٢٠

مەترسی لەسەر بوایە خۆی لەوێ دەبوو ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی هەموو پێشمەرگەکانی کەرتەکەی کەسانی ئازاو چاونەترس بن لەهەمان کات دا خۆشیان بوێت و پابەندو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن ' لە تاکتیکی جەنگین و هونەری جەنگ زۆر شارەزا بوو ' وا دەهاتە بەر چاو کە دەرچووی کۆلیژو فێرگەی سەربازی بێت.

لەبارەی ڕەوشت و ئاکاری شەهید ئەحمەدەوە گوتی : کاك ئەحمەد لەناو کۆمەڵگەی لادێ نشین هاتبوە دنیاوەو بە دابوونەریتی کوردەواریانەش پەروەردە کرابوو ' ئەو دابوونەریتەش ڕەنگی دابوەوە لە ڕفتارو هەڵسوکەوت و ئاکارەکانی کە بریتی بوون لە ڕەوشت بەرزی و دەست و دەم پاکی و ڕاستگۆیی، هەرگیز جوێنی نەدەدا ' زوو توڕە نەدەبوو، بەدوای پارووی چەورو شوێنی گەرم و نەرم نەدەگەڕا ' هەمیشە بەرژەوەندی هاوڕێکانی دەخستە پێشەوەی بەرژەوەندی خۆی[1].

شەماڵ عەبدوڵا بۆ ماوەیەك ڕابەری سیاسی کەرتی دووی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بوە لە سەردەمی شەهید ئەحمەد قەمبەریدا، جگە لەوەش هاوڕێیەکی نزیکی یەکتر بوون، دەربارەی کەسایەتی و ئاکارو توانای شەهید ئەحمەد قەمبەری گوتی : لەناو شۆڕش بەگشتی و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان

---

١- چاوپێکەوتن لەگەڵ مەلا خدر

بەتایبەتـی نموونـەی وەك شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری دەگمـەن بـوو، بۆیـە دەڵێـم دەگمـەن چونکـە کـە بـوە پێشـمەرگەو پلەکانـی پێشـمەرگایەتی بـڕی خوێنـدەواری نەبـوو هـەم حـەزی لـە وەرگرتنـی پلـەو بەرپرسـیارێتی نەبـوو بەڵکـو لەسـەر فەرمانـی سـەروو دەکـرا بـە بەرپـرس، ئـەو لـە فەرمانـدەی مەفـرەزەوە قۆناغەکانـی بەرپرسـیارێتی بـڕی تـا گەیشـتە جێگـری کـەرت و پاشـان فەرمانـدەی کـەرت، دڵنیـا بـووم شـەهید نەبوایـە دەکـرا بـە فەرمانـدەی تیـپ، ئـەو سـەردەمە هیـچ کەسـێك لـە خـۆوە یـان بەمەعسـوبیەت و واسـیتە پلـەی وەرنەدەگـرت بەڵکـو دەبـوو توانـای لـە ئاسـت بەرپرسـیارێتیەکەی بوایـە، ئـەوەی شـەهید ئەحمـەد جیـا دەکاتـەوە لـە فەرماندەکانـی تـر ئەمانـە بـوون:

یەکـەم: هەرگیـز خـۆی داوای پلـەی نەکـردوە بەڵکـو بـە زۆر لێکـردن ڕازیـان دەکـرد تـا بەرپرسـیارێتی نوێـی پـێ بسـپێردرێت.

دووەم: نەخوێنـدەوار بـوو بـەڵام چونکـە مەبەسـتی بوو لەسیاسـەت و بارودۆخـی سیاسـی کوردسـتان و وڵاتانـی جیهـان تێبـگات هەمیشـە لـەکادرو ڕابـەر سیاسـیەکان پرسـیاری سیاسـی دەورژانـدو دەیویسـت وەڵامـی دروسـتی دەسـت بکەوێـت. سـەدان جـار کەوتۆتـە مناقەشـەو گفتوگـۆ لەسـەر بابەتـە جیاجیاکانـی ئـەو سـەردەمە.

سێیەم: شەهید ئەحمەد بەداهێنەری شێوەی نوێی کۆبونەوەی پێشمەرگە دادەنرێت، داوای لە ڕابەری سیاسی دەکرد ناوەرۆکی ئەو کتێبەی کە دەیخوێندەوە بکاتە بابەتی کۆبونەوەی پێشمەرگەو تێگەیاندنی هێزی پێشمەرگە، داوای دەکرد دەرگای پرسیارو بەدواداچوون و گفتوگۆ بۆ پێشمەرگە بکرێتەوە.

چوارەم: لەگەڵ ڕابەر سیاسی و کادرەکانی ڕێکخستن زۆر تەبا بوو بە پێچەوانەی زۆرێك لە فەرماندەکانی تر کە زۆر باوەڕیان بە ڕابەر سیاسی و کادر نەبوو بگرە دەکەوتنە دژایەتی و ململانێ و هەندێك جار گاڵتە کردنیش پێیان.

سەرەڕای ئەوەی نەخوێندەوار بوو بەڵام بەهۆی ئەو ئەزموونە زۆرو زەوەندەی لە ژیانی پێشمەرگایەتی و کۆبونەوەکان و پرسیار کردنەکانی دەستی کەوتبوو ' بوو بە کادرێکی سیاسی و هۆشیارو تێگەیشتوو و خاوەن ڕۆشنبیریەکی بەرز، جگە لەوەش کەسێتی شەهید ئەحمەد زادەی ئەو بارودۆخە نالەبارە ئابوری و سیاسیە بوو بۆیە تەقەڵاکانیشی پڕ بەرهەم بوو تا ببێت بەو کادرە چاوکراوەو شارەزایە. لەبواری سەربازیشدا دەگمەنترین فەرمادە بوو، گەر کەسێکی نەناس خۆی و پێشمەرگەکانی کەرتەکەی ببینیایە نەیدەزانی کامیان فەرماندەی کەرتەکەن هێندە سادە بوو، ئەو لەگەڵ پێشمەرگەدا هیچ جیاواز نەبوو، ئەم گوتەیە لەسەر شەهید ئەحمەد بوو بوو بە وێردی سەر زاری خەڵك،

دەیانگوت ئەحمەد قەمبەری بۆ نان خواردن لەدواوەیە بەڵام بۆ شەڕو هێرش کردن لەپێشی پێشەوەیە، بۆیە بەپیاوی مەیدانی ناوبانگی دەرکردبوو، نەخشەی هەر چالاکیەکی دابنایە بە ڕاوێژ لەگەڵ ڕابەر سیاسی هەڵسەنگاندنی بۆ دەکردو خۆی لەدەستەی هێرش کردن یان بابڵێین خۆی لەپێشەوە دادەنا، هەتا بڵێی پیاوێکی ئازاو نەترس بوو، هەمیشە دەیگوت مردنێمان لەپێشە کەواتە ئەو مردنە با لە پێناوی کوردستان بێت. لە دڵەوە پێشمەرگەکانی خۆشدەویست و ڕێزی لە هەمووومان دەگرت و بە (کاك ) بانگی دەکردین، ووشەی نەشیاو و بریندارکەری بەکار نەدەهێنا، زۆر ڕقی لەدرۆ بوو ' دەیگوت ئەوەی درۆم لەگەڵ بکات بۆ هەتا هەتایە لەپێش چاوم دەکەوێت، خۆیشی بەکردەوە زۆر ڕاستگۆ بوو، یەکێك لەخاسیەتە هەرە جوان و باشەکانی خو و ڕەوشتی بەرز بوو' هەموو ژن و کچی خەڵکی بە خوشك و دایك دەزانی و هەمیشە لە کۆبونەوەکانی دەیگوت: ئەو ماڵ و خێزانەی بۆ نان خواردن ڕووی تێدەکەن بەماڵی برای خۆتانی بزانن، گەر ئەوەی بەڕەوشت نەبێت لەم کەرتە جێی نابێتەوە، هەروەها دەیگوت زیادە خەرجی بە هیچ خێزانێك مەکەن چیان هەبوو بیخۆن چونکە ئێوە بۆ گۆشت و پڵاو نەبوون بەپێشمەرگە[1].

١- گفتوگۆ لەگەڵ شەماڵ عەبدوڵا لە ڕێککەوتی ٢٤-٦-٢٠٢٠

ناوی تەواوی زرار عەبدوڵا مستەفایە لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا نازناوی (شەماڵ)ی

سامان نەجمەدین عەبدولا یەکێکی ترە لە هاوڕێکانی شەهید ئەحمەد قەمبەری گوتی: شەهید ئەحمەد پەیوەندیەکی زۆر باشی لەگەڵ پێشمەرگەدا هەبوو، هەمومانی خۆشدەویست، توانیبووی متمانەیەکی زۆر لەناو پێشمەرگەکانی کەرتی دوو دروست بکات، ئەو متمانەو باوەڕە هۆکارێك بوو بۆ سەرکەوتنمان لە هەموو هێرش و پەلامارێکی دووژمندا، بەڵگەش ئەوەیە شەهید ئەحمەد لەهەر شەڕێك بوایە هەموو پێشمەرکەکان دەیانگوت ترسمان نیەو سەردەکەوین. فەرماندەیەکی خاکی و سادە بوو وەك پێشمەرگە دەژیا، وەك چۆن خۆی هەوڵی دەدا فێرە خوێندەواری بێت و هۆشیاریەکی گشتی بەدەست بهێنێت ئاوهاش هانی ئەو پێشمەرگانەی دەدا کە نەخوێندەوار بوون تا خۆیان فێرە خوێندەواری بکەن[1].

عەبدوڵای برای شەهید ئەحمەد لە بارەی ڕووداوێکەوە گوتی: ڕۆژێکی هاوینی ساڵی ١٩٧٩ من و دایکم چووبوینە سەر ئەو پارچە زرعاتەی کە هەمانبوو لە بەستی قەمبەر خەریکی داو لێدان بووین، هێندەی پێ نەچوو کاکم ئەحمەد بەتەنها هاتە لامان، سڵاوی کردو هەردووکمانی لە ئامێز گرت و یەکترمان

---

پێ دراوە، لەساڵی ١٩٥٩ لە گوندی گردئارەق لە ناوچەی بەڕانەتی پارێزگای هەولێر لەدایك بوە، دەرچووی کۆلیژی یاسایە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠ دەبێتە پێشمەرگە، ئێستا لە هەولێر نیشتەجێیەو ڕاوێژکاری یاسایی پەرلەمانی کوردستانە.

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ سامان نەجمەدین عەبدولا لەڕێککەوتی ١٠-٧-٢٠٢٠

ماچ کرد، دوای کەمێك دانیشتن بەدایکمی گوت دەچم
هەندێك تەماتەو بامیە لێ دەکەمەوەو بە گوێدرێژەکە بۆ
برادەرانمان دەیبەم، دواتر گوتی : من نەخۆشم و بۆ چارەسەر
دەچمە ئێران پێویستیم بە مەبلەغێك پارە هەیە بمدەنێ،
دایکم پێشتر زۆر تکای لێ کردبوو کە واز لە پێشمەرگایەتی
بهێنێت بەڵام کاکم ڕازی نەبوو و بەقسەی نەکردبوو بۆیە
دایکم خۆی لێ عاجز کردبوو و وا نیشانی دەدا کە عاجزە
لێی، بۆ ئەوەی کاکم بەقسەی بکات و چەك دابنێت ' دایکم
گوتی پارەت نادەمێ، دواتر من و کاکم پێکەوە دەستمان کرد
بەڕنینی تەماتەو بامیە ' دوای کەمێك کاکم پێی گوتم : بڕۆ
بەدایکم بڵێ تەنها ١٠ دینارم بداتێ ' منیش چووم و پەیامەکەم
بە دایکم گەیاند بەڵام دایکم بۆ فشار خستنە سەری بەوە
ڕازی نەبوو، هاتمەوە لای کاکم و ڕازی نەبوونی دایکمم پێ
ڕاگەیاند، دوای ماوەیەکی کەم دیسان کاکم منی ناردەوە لای
دایکم بەڵام ئەمجارە بۆ پێنج دینار، منی قاسید دیسانەوە
پەیامەکەی کاکمم پێ گەیاندەوە، دایکم جەرگی بۆ کاکم
بە ئازار کەوتبوو ' لەلایەك حەزی دەکرد هەرچی پارەمان
هەیە بیداتێ تا چارەسەری خۆی پێ بکات ' لەلایەکی تر
سوور بوو لەسەر فشارەکانی تا واز لەپێشمەرگایەتی بهێنێت،
لە نێوان ئەم دوو هەڵبژاردەیە ' دایکم ئازارەکانی بڕیاری

بـژاردەی دووەمـی پـێ دا و پێنـج دینـاری پـێ دا. دوای ئـەوە کاکـم منـی لـە ئامێـز گـرت و ماڵئاوایـی لێـمان کـردو ڕۆیشـت، ئـەو تـا لەگـەرووی هێلانـە قـەل ئاودیـو بـوو مـن بەدڵێکـی غەگینـەوە هـەر لێـم دەڕوانـی، دواتـر چوومـەوە لای دایکـم بینیـم بـە کـوڵ دەگریـەت، دوای ئـەو سـەفەرە یـەك سـاڵی ڕەبـەق نەمانبینیـەوە[1].

محەمــەد عەبدولحەمیــد ســێگردکانی لەپێناســاندنێکی کــورت دا گوتـی : لـەدوو قۆناغـی جیـادا ئەحمـەد قەبـەری لەماڵـی ئێمـە بـۆ ماوەیەکـی درێـژ ماوەتـەوە، جـاری یەکـەم لەسـەردەمی پارتیزانـی لە سـاڵی ١٩٧٨ و جاری دووەم لەسـەرەتای سـاڵی ١٩٨٣ لە شـەڕی ناوخـۆ ، جگـە لـەوەی وەك خزمێـك شـارەزای خـو و ڕەوشـت و ئـاکاری بـووم لـەو دوو ماوەیـەش دا باشـتر ناسـیم و زانیـم خاوەنـی کەســایەتی و خــوو و ڕەوشــتێکی بــەرزە ' کەســێکی لەســەرخۆو هێمـن بـوو ' بەهەمـوو جـۆرە خواردنێـك ڕازی بـوو، هەمـوو ماڵـە جوتیارێکـی بـە بـرای خـۆی دەزانـی و هەمیشـە بـۆ دڵخـۆش کردنـی خەڵـك هەوڵـی دەدا، جـاری دووەم کـە لـە ماڵـی ئێمـە بـوو ئـەو کاتـەی ڕۆیشــت بـۆ دواجـار خواحافیـزی لـێ کردیـن ' تەنانـەت گوتـی گەردنـم ئـازاد بکـەن ڕەنگـە نەتانبینمـەوە[2].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ عەبدولا قەمبەری لە ڕێککەوتی ٧-٢-٢٠٢٠

٢- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد عەبدولحەمید حەمەدەمین
لەســاڵی ١٩٥٣ لــە گونــدی ســێگردکان لەدایــك بــوە، ئێســتا لــە ناحیــەی قوشــتەپە نیشــتەجێیە

# بڵێسەی جەنگی ناوخۆ

شـەڕی ناوخـۆو یەکـتر کوشـتن و یەکـتر سـڕینەوە مێژوویەکـی قـووڵ و دوورو درێـژی هەیـە لەنـاو گەلانـی جیهانـدا، مەبەسـت و ئامانجیـش لێـی ' سـەرکەوتنی هەندێکـە بەسـەر هەندێکـی تـری هەمـان گـەل و نەتـەوەدا، پاڵنـەرو فاکتـەری هـەرە سـەرەکیش لـەم جەنـگ و یەکـتر کوشـتنانە یـان ناکۆکـی و جیـاوازی ئایدیۆلـۆژی و فیکـری و سیاسـین یـان بەرژەوەنـدی و پاوانخـوازی و بەدەسـتهێنانی دەسـەڵات و توانـاو سـەپاندنی ئەقـڵ و شـێوەی بیرکردنـەوەی بەشـێکە بەسـەر ئـەوەی تـردا، ڕەنگـە خوێندەوارانـی کـورد بۆچونیـان وابێـت کـە گەلـی کـورد لەنـاو گەلانـی جیهانـدا پشـکی شـێریان بەرکەوتبێـت لـەم یەکـتر قبـووڵ نەکـردن و شـەڕی براکـوژی و جەنگـە نێوخۆییانـەی بەرۆکـی نەتـەوەو گەلانـی جیهانـی گرتـوە، ئـەم تێڕوانینـەش لـەوەوە سـەرچاوەی گرتـوە کـە لـە دێـر زەمانـەوە ڕۆڵەکانـی ئـەم گەلـە هێنـدەی خەریکـی شـکاندن و لاواز کردنـی یەکـتری بـوون نیـو هێنـدە بەرەنـگاری دووژمنەکانیـان نەبووبنـەوە. ئـەم تەماشـاکردن و تێڕوانینـە خەریکە ببێتـە تێڕوانینێکـی گشـتی تاکـی کـورد کەچـی تاکـو هەنووکـەش بەردەوامـن لەسـەر یەکـتر سـڕینەوەو یەکـتر کوشـتن.

نموونەی زۆرو زەوەند هەن تا ئەم تێروانینە بەڕاست و دروست بزانرێت، میر عەبدولڵای بابان و عەبدولڕەحمانی برای کەوتنە وێزەی یەکتر تا ئەمیان زاڵ بێت بەسەر ئەویاندا، لە قۆناغێکی تری هەمان میرنشیندا خالد پاشا کە ئامۆزای عەبدولڕەحمان پاشای بابان بوو بەفیتی والی بەغدا بەشێك لە لەشکری میرنشینەکەی دابڕی و کەوتە دژایەتی و شەڕەوە لەگەڵ میرنشینی بابانـدا.

میر محەمەد پاشای ڕەواندووزو دوو مام و برایەکی کەوتنە شەڕ لەگەڵ یەکتر ' دواجار میر محەمەد سەرکەوت و براو مامەکانی شکاندو هەندێکیانی کوشت، لە میرنشینی بۆتانیش براو ئامۆزاکان لەسەر جێنشینی کەوتنە شەڕی یەکترو لەشکری عوسمانیەکانیان هێنایە سەر پایتەختی میرنشینەکەو سەدان کەسیان لە یەکتر کوشت، سوڵتان سولێمانی قانوونی دوای گەڕانەوەی لە داگیرکردنی شاری بەغدا ' لەنزیك شاری هەولێر لە ساڵی ١٥٣٤ ز میر عەزەدین شێر میری سۆرانی کوشت بەفیتی حوسێن بەگی داسنی کە کەسایەتیەکی ناسراوی ئێزیدیەکان بوو، لەم کارەشیدا حوسێن بەگ مەبەستی بوو ڕەزامەندی سوڵتان بەدەست بهێنێت و دوای عەزەدین شێر بکرێت بەمیری سۆران، لە قۆناغێکی تری میرنشینی سۆراندا جارێکی تر میر محەمەد لەگەڵ ئێزیدیە کوردەکان

کـە هاوخوێنـی بـوون کەوتنـە جەنگـەوەو هەزارانیـان ، لـە یەکـتر کوشـت، لـەدوو سـەردەمی جیـاوازدا میرنشـینی سـۆران و میرنشـینی بابـان دژ بەیەکـتر جەنـگاون لــە ناوچەکانــی دووکان و مەرگــەو پشـدەرو کۆیـە' بـەو هۆیـەوە سـەدان جەنگاوەریـان بەکوشـتن دا.

بەدرێژایـی دوو سـەد سـاڵ میرنشـینە کوردیـەکان خەریکـی لەناوبـردن و سـڕینەوەی یەکـتر بـوون و هەمیشـە پەنایـان بـۆ سـەفەوی و عوسـمانیەکان بـردوە تـا بەکـتری پـێ بشـکێنن، دواجـار سـوڵتان مەحمـوودی دووەم لـە مـاوەی سـاڵانی ١٨٠٨ ز بـۆ سـاڵی ١٨٣٩ ز سـەرجەم میرنشـین و قـەوارە نیمچـە سیاسـیە جیاجیاکانـی کـوردی ڕووخانـد کـە زۆربەیـان بـە هـاوکاری و ڕێخۆشـکەری میـرو سـەردارو پیـاوە گەورەکانـی کـورد خـۆی بـوو.

لەسـەردەمی تازەشـدا شـەڕی ناوخـۆ دەردێکـی کوشـندە بـوەو هێـزو توانـاو خەرجیەکـی زۆری گەلـی کـوردو جوڵانـەوەی ڕزگاری خـوازی کـوردی بەهـەدەر داوەو هێـزە کوردیـەکان نەیانتوانیـوە خۆیانـی لـێ بـەدوور بگـرن:

-لـە سـاڵی ١٩٦٤ سـەرکردایەتی بارزانـی و باڵـی مەکتەبـی سیاسـی پارتـی بــە سـەرکردایەتی ئیبراهیـم ئەحمـەد بەهـۆی جیـاوازی سیاسـی نێوانیانـەوە کەوتنـە وێـزەی یەکـتر ' لـەو شـەڕانەدا دەیـان پێشـمەرگەی هـەردوولا کـوژران .

-لـە سـاڵی ١٩٧٣ لەنێـوان پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و حزبـی شـیوعی عێـراق شـەڕ هەڵگیرسـاو هێزیـان بـۆ سـەر یەکـتری ڕێکخسـت بـەو هۆیـەوە چەندیـن پێشـمەرگەی هـەردوولا کـوژران و شـیوعیەکان ناچـار بـوون لەبـەرەی حکومەتـی عێـراق بمێننـەوە.

-لـە سـاڵی ١٩٧٦ سـەرکردایەتی کاتـی پارتـی دیموکراتی کوردسـتان ( قیادە موەقەتە ) ٣٧ پێشـمەرگەی یەکێتیان کوشـت کە لەسـوریاوە دەگەڕانـەوە بـۆ کوردسـتان، کوشـتنی تـەواوی مەفرەزەکـەی یەکێتیـی بـە ئیبراهیـم عەزۆشـەوە ' یەکـەم چەخماخـەی شـەڕی ناوخـۆ بـوو لـە دوای نسـکۆ.

-لـە سـاڵی ١٩٧٨ سـەرکردایەتی کاتـی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان لەسـێ سـنوور ( هــەکاری ) لــە هێزەکانـی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتانان دا کە بەهۆیەوە سـەدان پێشـمەرگە ژیانیان لەدەسـت دا ' لەناویانـدا دکتـۆر خالیـدو عەلـی عەسـکەری بـوون .

-لـە سـاڵی ١٩٨٠ لـە نێـوان کۆمەڵـەی ئێـران و حزبـی دیموکـرات شـەڕ هەڵگیرسـا، ململانێـی نێوانیـان تـا سـاڵی ١٩٩١ ی خایانـد.

-لـە سـاڵی ١٩٨٠ شـەڕی نێـوان پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و حزبـی دیموکـرات هەڵگیرسـا، هێزەکانـی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان هـاوکاری سـوپای ئێرانیـان کـرد بـۆ دەستبەسـەرا گرتنـی ناوچـە ڕزگارکراوەکانـی ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان، دڕدۆنگـی نێـوان

ئـەم دوو حزبـە چارەسـەر نەکـرا تـا ۲۰۰۰ کـە بـە هـۆیـەوە سـەدان پێشـمەرگەی هـەردوولا لەبەیـن چـوون.

-لـە سـاڵی ۱۹۸۰ بـۆ سـاڵی ۱۹۸٦ شـەڕی نێـوان پارتـی دیموکراتـی کوردســتان و یەکێتیــی نیشــتیمانیی کوردســتان جارێکــی تــر هەڵگیرســایەوە.

-لـە سـاڵی ۱۹۸۱ تـا سـاڵی ۱۹۸٦ شـەڕی نێـوان یەکێتیی نیشـیمانیی کوردسـتان و حزبی سۆسیالسـتی کوردسـتان هەڵگیرسـا.

-لە سـاڵی ۱۹۸۱ تا سـاڵی ۱۹۸٦ شـەڕی نێوان یەکێتیی نیشـتیمانیی کوردسـتان و حزبی شـیوعی عێراق هەڵگیرسا.

-لە سـاڵی ۱۹۸۱ تا سـاڵی ۱۹۸٦ شـەڕی نێوان یەکێتیی نیشـتیمانیی کوردسـتان پارتی سۆسیالسـتی کورد-پاسـۆك هەڵگیرسا.

-لـە سـاڵی ۱۹۸۵ شـەڕی نێـوان پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و پارتـی کرێکارانــی کوردســتان دەســتی پــێ کــرد، لەســاڵی ۱۹۹۳ و ۱۹۹۵ و ۱۹۹۹ و ۲۰۰۰ شــەڕی نێوانیــان چەندبــارە بۆتــەوەو تــا ئێســتاش نەگەیشــتوون بــە ڕێککەوتــن.

-لــە ســاڵی ۱۹۸۷ لێکــترازان و جیابوونــەوەو شــەڕی ڕاگەیانــدن لــە نێـوان سـەرکردەکانی سـازمانی خەبـات ڕوویـدا کـە بەهۆیـەوە چەندیــن ئەنــدام و پێشــمەرگەی یەکتریــان کوشــت.

-لـە سـاڵی ١٩٩٣ شـەڕ لەنێـوان پارتـی کرێکارانـی کوردسـتان و پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان ڕوویـدا.

-لـە سـاڵی ١٩٩٣ شـەڕ لەنێـوان پارتـی کرێکارانـی کوردسـتان و یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان ڕوویـدا.

-لـە سـاڵی ١٩٩٣ شـەڕ لەنێـوان بزووتنـەوەی ئیسـلامی و یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان ڕوویـدا.

لـە سـاڵی ١٩٩٣ شـەڕ لەنێـوان پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و حزبـی سۆسیالسـت دیموکراتـی کوردسـتان ڕوویـدا.

-لـە سـاڵی ١٩٩٤ شـەڕ لـە نێـوان پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان هەڵگیرسـا.

-لـە سـاڵی ٢٠٠٠ لێکـترزان و جیابوونـەوەو شـەڕی ڕاگەیانـدن لـە نێـوان سـەرکردەکانی کۆمەڵـەی ئێـران ڕوویـداو بـوون بـە دوو حزبـی جیـاواز.

-لـە سـاڵی ٢٠٠٦ لێکـترازان و جیابوونـەوەو شـەڕی ڕاگەیانـدن کەوتـە نێـوان سـەرکردەکانی حزبـی دیموکـرات و بـوون بـە دوو حزبـی جیـاواز.

-لەسـاڵی ٢٠٠٦ بـۆ جـاری دووەم کۆمەڵـەی ئێـران لێکترازانـەوەو شـەڕی ڕاگەیانـدن کەوتـە نێوانیـان و بـوون بـەدوو حزبـی جیـاواز.

-لەساڵی ٢٠٠٧ لێکترازان و جیابوونەوەو شەڕی ڕاگەیاندن لە نێوان سەرکردەکانی یەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان ڕوویداو بوون بەدوو حزبی جیاواز.

-لەساڵی ٢٠٠٩ لێکترازان و جیابوونەوەو شەڕی ڕاگەیاندن لە نێوان سەرکردەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ڕوویداو بوون بەدوو حزبی جیاواز.

دوای پێنج سەد ساڵ لەیەکتر کوشتن و شەڕی براکوژی و یەکتر سڕینەوەو هێنانی سوپاو لەشکری بێگانە بۆ سەر یەکتری هێشتا پارتە کوردیەکان عاریان نەناوەو لەو ڕاستیە نەگەیشتوون کە بە پەلاماردان و یەکتر کوشتن ناتوان کۆتایی بە بوونی یەکتر بهێنن، جگە لە بەهەدەردانی هێزو ووزەی گەلەکەیان و ڕشاندنی خوێنی هەزاران ڕۆڵەی گەلەکەیان هیچی تریان دەست نەکەوتوەو لە داهاتووشدا هیچیان ناکەوێت.

# باليسان چەقی ململانێ

گونـدی باليسـان کەوتۆتـە چەقـی ناوچـەی خۆشـناوەتی و سـەر بەقـەزای شـەقڵاوەیە، بەگوێـرەی گێڕانـەوە زارەکیـەکان بێـت تەمەنـی ئـەم گونـدە لەپێنـج سـەد سـاڵ زیاتـرەو هاوتخوببـە لەگـەڵ هەریەکـە لـە گوندەکانـی کانـی بـەرد، شـێخ وەسـانان، بێـراوە، دەراش، تووتمـە، بالـوکاوە. ناوچـەی خۆشـناوەتی بەگشـتی و گونـدی باليسـان بەتايبەتـی بەلانکـەی شـۆڕش دادەنرێـت و خزمەتـی بەرچـاوی هێـزی پێشـمەرگەی کوردسـتانیان کـردوە بـێ جیـاوازی ، وێـڕای ئـەوە بەشـێکی زۆریـان لـە هـەردوو شۆڕشـدا پێشـمەرگە بـوون و سـەدان قوربانیـان لـەو پێنـاوەدا داوە، باليسـان لەسـاڵی هەشـتاکان زیاتـر لـە ٢٥٠ خێزانـی تیـا ژیـاوە، لـە ٢٨-٢-١٩٩٩ بەفەرمانێکـی ئەنجومەنـی وەزیـران کـرا بەناحیـە، لـە ١٥-٤-١٩٩٩ یەکـەم بەڕێوەبـەری ناحیـە کـە ساڵح ئەکـرەم حەیـدەری بـوو دەسـت بـەکار بـوو [١].

بـۆ سـاڵی هەشـتاکان دۆڵـی باليسـان ناوچـەی جـێ ناکـۆك بـوو لـە نێـوان هێـزو لایەنـە سیاسـیەکان بـەڵام زیاتـر لەژێـر ڕکێفـی

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ فرسەت سابیر مستەفا لەڕێککەوتی ٧-٧-٢٠٢٠

هێزەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بوە ، چونکە بارەگای مەڵبەندی چواری ئەو کاتەی هەولێری یەکێتیی لە بالیسان بوو، هەموو حزبەکان ویستوویانە لە دەڤەری خۆشناوەتی هەژموونیان هەبێت، چونکە ناوچەیەکی ستراتیژی بوە بۆ مانەوەو گەشەکردنیان، هەر بۆیە دۆڵی بالیسان بوە بەجێی ململانێ و پێکدادانی چەکداری.

مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٣ دۆڵی بالیسان کەوتە بەر هێرش و پەلاماری چەندین حزب و پارتی هاوپەیمان کە خۆیان لە بەرەیەکی سیاسی و سەربازیدا دەبینیەوە بەناوی بەرەی جوود، ئەم بەرەیە ٧-١٢-١٩٨٠ لە نێوان هەریەکە لە حزبی شیوعی عێراق ، حزبی سۆسیالستی کوردستان ، پارتی دیموکراتی کوردستان بە دەستپێشخەری حزبی شیوعی عێراق پێکهات، نەوشیروان مستەفا ئەمین لە کتێبی پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن پێی وایە ئامانج لە دروست کردنی ئەم بەرەیە دژایەتی کردن و لاواز کردنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بوە، هەر لەو بارەیەوە دەڵێت : مەبەستیان بوو بەتیرێك دوو نیشان بشکێنن، یەکەمیان یەکێتی کە لە ڕووی پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی و جەماوەریەوە لەچاو هەموو هێزەکانی کوردستان بەهێزتر بوو، بە هاوپەیمانێتیەکی سێقۆڵی گەمارۆ بدەن و باڵا دەستی یان هاوسەنگی پێشمەرگەیی و سیاسی لەگەڵ دروست

بکەن. دووەمیان مستێ لەدەمی حازم و هاوڕێکانی بدەن[1].

لەدوای پێکهێنانی بەرەی جوود پەیوەندی نێوان یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و لایەنەکانی ناو بەرە بە قۆناغێکی دژوارو پڕ ململانێدا تێپەڕی و هەمیشە بیانویان بە یەکتر دەگرت و دڕدۆنگ بوون، لە جیاتی ئەوەی بەرەیەکی فراوانی چەکداری پێکبهێنن و سەرقاڵی حکومەتی عێراق ' بە شەڕی ئێرانەوە بقۆزنەوەو بەرنامەیەکی سیاسی هەمەلایەنە بۆ چۆنیەتی ڕووبەڕوو بونەوەی دەوڵەتی عێراق دارێژن کەچی کەوتنە وێزەی یەکتر، لەو سەروبەندەدا حزبێکی تر بەناوی پاسۆك چوە ناو بەرەی ( جود )ەوە. پاسۆك کورتکراوەی پارتی سۆشیالستی کوردە، لە ١١-٩-١٩٧٥ بە نهێنی لەشاری کەرکووك لەلایەن هەریەکە لە فەرهاد عەبدولقادر ' ئازاد مستەفا ' شێرزاد فاتح دامەزا[2]، هەرچەندە تەواوی هێزە چەکدارەکانی پاسۆك لە ٢٠٠ کەس تێنەدەپەڕی بەڵام هەرچۆنێك بێت لەڕووی چەندایەتی و ڕاگەیاندنەوە سەنگی دایە بەرەی جوود.

گەرچی لە ڕووی سیاسی و ئایدۆلۆژیەوە پاسۆك لەیەکێتی نیشتیمانی کوردستان نزیك بوو بەڵام لەواقعدا هاوپەیمانی حزبەکانی ناو بەرەی جوود بوو، دەشێت خوێندەوارانی کورد

---

١- نەوشیروان مستەفا ئەمین: پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن، ل١٧٧

٢- زانا قەڤێ : پارتی سۆشیالستی کورد-پاسۆك ١٩٧٥-١٩٩١،ل٩٢

ئەو پرسیارە مێژووییە بورژێنن لە کاتێکدا حزبی شیوعی عێراق و پاسۆك و حزبی سۆسیالستی کوردستان لەڕووی فکری سیاسی و ئایدۆلۆژیەوە لە یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانەوە نزیك بوون و هەموویان زادەی یەك کانیاوی ئایدیۆلۆژی بوون، بۆچی دۆستایەتی پارتیان پێ باشتر بوو نەك یەکێتیی ؟

نوسەرو ڕووناکبیر سامی قادر لەو بارەیەوە گوتی : جیاوازی و ململانێی هەرە سەرەکی نێوان یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و سێ حزبە چەپەکەی ناو بەرەی جوود لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو ، یەکێتیی لەماوەی پێنج ساڵدا واتە لەساڵی ١٩٧٥ وە بۆ ساڵی ١٩٨٠ توانیبووی بیروباوەڕو تێگەیشتن و سیاسەتی خۆی بگەیەنێتە هەموو لایەکی کوردستان و جەماوەرێکی زۆر لەخۆی کۆ بکاتەوە ، لەڕووی فیکری و ئایدیۆلۆژیەوە ڕەزامەندی جەماوەری کوردستان بەدەست بهێنێت و فەلسەفەی مارکسیزم متوربە بکات بەکۆمەڵگەی مسوڵمان نشینی کوردستان ، یەکێتی لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ دا خاوەنی سێ تا چوار هەزار پێشمەرگە بوو، هەزاران گەنجی لە ڕێکخستنەکان بەگەڕ خستبوو، هەرچی سێ حزبەی تره نەیانتوانیبوو خۆیان لەو بەرگە کۆن و تەقلیدیە چەپگەراییە ڕزگار بکەن و بەهەمان ئاستی یەکێتیی خۆیان بەخەڵك بناسێنن و خەڵك لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە ، ئەمەش پەرچەکرداری سێ حزبەکەی بەدوای خۆیدا هێنا

هـەر بۆیـە دەیانویسـت لـە ڕێگـەی یەکخسـتنی هەڵوێسـتیان و دژایەتـی کردنـی یەکێتـی ' ڕێگـە لـە گەشـەکردنی یەکێتـی بگـرن و لاوازی بکـەن[1].

بـۆ چنـگ کەوتنـی وەڵامـی هەمـان پرسـیار دکتـۆر کاوە محمـوود سـکرتێری حزبی شـیوعی کوردسـتان گوتی : بەرەی جوود بەرەیەکی ئایدیۆلـۆژی نەبـوو تـا وا لێکبدرێتـەوە کـە حزبـی شـیوعی لـەڕووی فەلسـەفەی سیاسـیەوە لەگـەڵ یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان ناکـۆك بوبێـت و لەگـەڵ پارتـی دیموکـرات کـۆك بوبێـت، دەشـێت ناکۆکیـەکان هـۆکاری تـری هەبووبـن، بەڵکـو بـەرەی جـوود چەتری کۆکردنـەوەی ئـەو حزبانـە بـوو کـە بـۆ ئـەو سـەردەم و هەلومەرجـە لەگـەڵ یەکـتر هـاوڕا بـوون.

ڕاسـتیەکەی ئێمـە وەك حزبـی شـیوعی شـانازیمان بـەو هێـزو لایەنانـەوە کـردوە کـە لـە ڕووی فکـرەوە نزیکایەتیـمان هەبـوەو هەوڵـمان داوە ئایدیۆلۆژیـا بکەیـن بـە ئامرازێـك تا لەگـەڵ یەکێتیی و لایەنەکانـی تـر یـەك بـەرەی هاوبـەش و فـراوان پێکبهێنیـن ' باشـترین بەڵگـەش ئەوەیـە لەگـەڵ یەکێتیـی دا لەبـەرەی جەوقـەد پێکـەوە ئەنـدام بویـن و لەسـەر زۆر بابەتـی هەسـتیاری ئـەو ڕۆژگارە هـاوڕا بوویـن[2].

١- گفتوگۆ لەگەڵ سامی قادر لە ڕێککەوتی ٣-١١-٢-٢٠

٢- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ دکتۆر کاوە مەحموود، لە ڕێککەوتی ١٣-١٢-٢٠٢٠
ناوی تـەواوی کاوە مەحمـوود شـاکرە، لەسـاڵی ١٩٥٨ لەشـاری کەرکـووك لەدایـك بـوە،

بۆ دەسکەوتنی هەمان وەڵام و زانینی هۆکارەکانی شەڕی حزبی سۆسیالست و یەکێتیی و دروستکردنی بەرەی جوود کورتە گفتوگۆیەکمان لەگەڵ محەمەدی حاجی مەحموود سکرتێری حزبی سۆسیالستی دیموکراتی کوردستان ساز دا، گوتی :

-بۆ وڵامدانەوەت پێویست دەکات بۆ ڕووداوەکانی سەردەمی زووتر بگەڕێینەوە، بەواتایەکی تر ئەو ڕووداوانە باس بکەین کە بوونە هۆکاری یەکگرتنی ئەو چوار حزبە لەبەرەی جوود دا، وەکو دەزانن ئێمە وەك بزووتنەوەی سۆسیالستی باڵێکی سەرەکی پێکهێنەری یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بووین بەڵام ئەو هەستەمان لا دروست بوو کە ڕێگری هەیە لەگەشەکردنی بزووتنەوەی سۆسیالستی ' ڕێگری و لەمپەرەکانیش پەیوەست بوون بەسیاسەتی ناوخۆیی، با لە کارەساتی هەکاریەوە دەست پێبکەم، کاتێك هێزەکانی یەکێتیی لەهەکاری لێیان درا زۆربەی کادرو سەرکردەکانی بزووتنەوە تیاچوون بۆ نموونە شەهید عەلی عەسکری ' دکتۆر خالید و چەندین کادرو پێشمەرگەی تر، بەڵام سەرکردەو کادرەکانی کۆمەڵە ئازاد کران بۆ نموونە ملازم عومەر' شەهید ئازاد هەورامی ' کاك حامیدی حاجی غالی' علی شیعەو چەندینی تر.

---

لەساڵی ١٩٨٠ بوە بە پێشمەرگە لەڕیزەکانی حزبی شیوعی عێراق_کوردستان، دکتۆرای هەیە لە زانستە ئاینیەکان، ئێستا سکرتێری حزبی شیوعی کوردستانەو لەسلێمانی نیشتەجێیە

-هۆکارەکەی چی بوو؟

- کاك سامی عەبدولرەحمان کە سەرکردایەتی قیادە موەقەتەی دەکرد خۆی بەمارکسی دەزانی ' پێی وابوو لە ڕووی ئایدیۆلۆژیەوە لە کۆمەڵە نزیکترە و ڕەنگە لە ئەنجامدا لەگەڵ برادەرانی کۆمەڵە یەکبگرنەوە.

-پێت وانەبوو پارتی دیموکراتی کوردستان لەڕێگەی قیادە موەقەتەو سامی عەبدولڕەحمانەوە فێڵێکی سیاسی لەکۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی کوردستان دەکات کە خۆیان وا نیشان بدەن ئەوان ڕەوتێکی مارکسین نەك ڕاستڕەو؟

-تێگەیشتنی سیاسی قیادە موەقەتە تێگەیشتنێکی مارکسیانە بوو ، دواتر بینیمان سامی عەبدولڕەحمان لەسەر ڕەگ و ڕیشەی قیادە موەقەتە (پارتی گەل )ی دروست کرد کەهەڵگری ئایدیۆلۆژیای مارکسی بوو.

دەمەوێت بێمەوە سەر وەڵامی پرسیارەکەت، بزووتنەوە زیانێکی گەورەی پێکەوت' لەهەمان کاتدا برادەرانی کۆمەڵە کەوتنە بەربەرەکانی ئاشکرای بزووتنەوە ' بۆ نموونە کاك مەلا بەختیار فشاری خستە سەر حەمەی مامە سەلام و تەقەی لەپێشمەرگەکانی کرد ئەویش شەڕی نەکردو وازی لەپێشمەرگایەتی هێنا، هەروەها کەوتنە ڕاوەدوونان و فشاربردن

بـۆ سـەر کادرەکانـی بزووتنـەوە تـا واز لـە بزووتنـەوە بهێنـن، لەلایەکی تـر هەندێك جیـاوازی زەق بـەدی دەکـرا کـە مەکتەبـی سیاسـی یکێتـی دەیکـرد لەنێـوان کۆمەڵـەو بزووتنـەوەدا بـۆ نموونـە لـە پێـدان و دابـەش کردنـی چـەك و فیشـەك و پێداویسـتیەکانیان بەشـی هـەرە زۆری دەدرا بـە برادەرانـی کۆمەڵـەو بەشـێکی کـەم دەدرا بـە بزووتنـەوە، ئەمانـەو چەندیـن هـۆکاری تـر باوەڕێکـی تـازەی لای سـەرکردایەتی بزووتنـەوە دروسـت کـرد کـە لەیەکێتـی بچنـە دەرەوەو حزبێکـی نـوێ بەنـاوی حزبـی سۆسیالسـتی دیموکراتـی کوردسـتان ڕابگەیەنـن ' بۆیـە شـەوی ۲۱-۳-۱۹۷۹ بەڕەسـمی بزووتنـەوە جیابوونـەوەی خـۆی ڕاگەیانـد، برادەرانـی یەکێتیـش ئـەم جیابونەوەیـان پـێ قبـووڵ نەدەکـرا، نزیـك مانگێـك دوای جیابوونەوەمـان ' لەنێـوان کۆیـەو خەلـەکان کاك شـێرکۆی شـێخ عەلـی و کۆمەڵێـك پێشـمەرگەی ئێمـە لـە کانیـەك خۆیـان دەشووشـت بـەڵام مەفرەزەیەکـی یەکێتـی چوونـە سـەریان و لەسـەر کانیەکـە دوو پێشـمەرگەی سۆسیالسـتیان شـەهید کـرد کـە نـاوی یەکێکیانـم لەبیـر مـاوە بـە نـاوی عەلـی مـام عـەولا ' ئەمـە یەکـەم تەقـەو پێکدادانـی شـەڕی ناوخـۆ بـوو کـە ڕوویـدا. دوای ئـەو ڕووداوە لەگـەڵ یەکێتیـی جۆرێـك لـە پێکهاتنـمان کـردو داوامـان لـێ کـرا بچینـە لیبیـا بـۆ بەشـداری کـردن لـە کۆبوونەوەیەکـی فراوانـی ئۆپۆزسـیۆنی عێراقـی، کۆبوونەوەکـە

بـه ئـاگاداری  هەریەکـە لـە عەبدولحەلیـم خـەدام و  عەبدولسـەلام جەلـوود  بەڕێـوە چـوو  کـە نوێنـەری  هەمـوو هێـزە کوردسـتانی و عێراقیەکانـی  تیـا بـوو  جگـە لەپارتـی  دیموکراتـی  کوردسـتان، لـەوێ بڕیـار درا  بــەرەی  نیشــتیمانی عێراقــی ( جەوقــەد ) پێکبهێنرێــت بەجۆرێـك  هەمـوو هێـزەکان  هەوڵیسـتیان  یـەك بخـەن  بەرانبـەر بــە ڕژێمــی عێــراق، لــە ڕێککەوتــی ١٢-١١-١٩٨٠  بــەرەی جەوقــەد ڕاگەیەنـرا  کـە ئێمە  وەك  حزبی  سۆسیالسـت و یەکێتیی  نیشـتیمانیی کوردســتان و حزبــی شــیوعی  عێــراق و چەنديــن  حــزب و لایەنــی تـری عێراقـی  تیایـدا  بوونـە  ئەنـدام، بـەرەی جەوقـەد  لێژنەیەکـی باڵای  پێکهێنـا  بـۆ  ڕاهـی کـردن و  بەڕێوەربردنـی  تـەواوی کاروبـاری بەرەکـە،  دەبـوو  هـەر حزبـەو نوێنەرێکـی  لـەو لێژنـە  باڵایـە هەبێـت بـەڵام  یەکێتیـی  ڕێگـر بـوو لـەوەی  نوێنـەری  ئێمـە  لەلێژنـەی  بـاڵای جەوقــەد  ئەنــدام بێــت  تەنانــەت  لەپێدانــی  ئمتیازاتــی  مــاددی و چــەك و کەلوپەلــی  ســەربازیش  حزبــی  سۆسیالســتیان مەغــدوور کــرد، ســەرکردایەتی حزبــی سۆسیالســت  بــەم  هەلوێســتانە  زۆر نیگـەران بـوون  کـە بەبـڕوای  ئێمـە  کاردانـەوەی  یەکێتیـی  بـوو بەرانبەرمــان  لــەدوای  جیابوونــەوەو  ڕاگەیاندنــی حزبێکــی  نــوێ، زۆری  نەخایانـد  سـەرکردایەتی حزبـی  شـیوعی  پێشـنیاری  دروسـت کردنــی  بەرەیەکــی نوێــی کــرد ، داوای  لەسۆسیالســت و پارتیــش کـرد  کـە پێشـنیارەکەیان  جێبەجـێ  بکرێـت، ئـەوە بـوو  بەهـاوکاری

ئێران لە ڕاژان بەرەی ( جوود )مان ڕاگەیاند، ئەوانەی ئیمزایان کرد نوێنەری پارتی بریتی بوون لە کاك مەسعوود بارزانی و خوالێخۆشبوو عەلی عەبدولا ' نوێنەری حزبی شیوعی کاك ئەحمەدی بانی خێلانی و ئەبوو حیکمەت ' نوێنەری ئێمەش تاهیری عەلی والی و خوالێخۆشبوو ڕەسووڵ مامەند بوون. لەڕاستیدا ئێمە دەمانویست هەردوو بەرەی جەوقەد و بەرەی جوود یەکبخرێن و هێزو تواناکانمان یەك بخەین بەڵام وا دەرنەچوو بەڵکو بوون بە دوو سەنگەری دژ بە یەك، جەوقەد لەلایەن سوریاو لیبیاوە پشتیوانی لێ دەکرا هەروەها بەرەی ( جوود )یش لەلایەن ئێرانەوە پشتیوانی دەکرا.

-دەگوترێت ئێران ڕۆڵی گەورەی بینیوە لە جیابونەوەی بزووتنەوە لە یەکێتی و هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ، تا چەند ئەم بۆچوونە ڕاستە ؟

-دەربارەی جیابوونەوەی بزووتنەوە ' ئێران هیچ ڕۆڵێکی نەبینیوە چونکە ئێرانیەکان لەو ساڵەدا خۆیان کێشەیان زۆر بوو نەدەپرژانە سەر ئەوەی بزووتنەوە هان بدەن بۆ جیا بوونەوە بەڵام بۆ مێژوو دەیڵێم هۆکارێکی تری جیابوونەوەی بزووتنەوە لە یەکێتی ' حزبی دیموکراتی ئێران و دکتۆر قاسملوو بوو کە هانی بزووتنەوەی دەدا لە یەکێتیی جیا ببەوە ' تەنانەت بڕێك پارەی مانگانەشی بۆ حزبی سۆسیالست تەرخان کرد

کـە شـێروان شـێروەندی وەك نوێنـەری حزبـی سۆسیالسـت وەریدەگـرت .

-حزبـی دیموکراتـی ئێـران بۆچـی ختوکـەی بزووتنـەوەی دەدا بـۆ ئـەم لێکترازانـە؟

- پەیوەنـدی حزبـی دیموکراتـی ئێـران و یەکێتیـی زۆر خـراپ بـوو، قاسـملوو دژی یەکێتـی و جەنابـی مـام جـەلال کاری دەکـرد هۆکارەکەشـی ئـەوە بـوو یەکێتـی پشـتیوانی لـە کۆمەڵـەی ئێـران دەکـرد کـە لـەو کاتانـەدا پەیوەنـدی کۆمەڵـەی ئێـران و حزبـی دیموکـرات زۆر خـراپ بـوو ئەمـەش حزبـی دیموکراتـی هـان دەدا تـا هەوڵـی لێکترازانـی ڕیزەکانـی یەکێتیـی بـدات و پشـتیوانی جیابوونـەوەی بزووتنـەوەی دەکـرد لـە یەکێتـی[1].

لەبارەی فاکتەرەکانی هەڵگیرسـانی شـەڕی ناوخۆ لەسـەرەتای سـاڵی هەشـتاکان دا ، کاکل ئەحمـەد مەعـرووف ( کاکلـە ڕەش ) مامۆسـتای زانکـۆ ، لەهەمـان کاتـدا کادری ئـەو سـەردەمەی یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان گوتـی :

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەدی حاجی مەحموود لەڕێککەوتی ٢٦-٢-٢٠٢١

نـاوی تـەواوی محەمـەد مەحمـوود محەمـەدە، لـە سـاڵی ١٩٥٣ لەگونـدی گوڵەخانـە لەدایـك بـوە، لەسـەرەتای سـاڵی ١٩٧٦ بـوە بەپێشـمەرگە، ئێسـتا سـکرتێری حزبـی سۆسیالسـت دیموکراتـی کوردسـتانە.

-هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی کوردستان لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو بۆ سێ هۆکار دەگەڕێنمەوە،

یەکەم | دووژمنانی کورد هەمیشە هەوڵیان داوە هێزە سیاسیەکانی کوردستان بە ململانێی و شەڕی براکوژیەوە سەرقاڵ بکەن تا بیر لەڕزگارکردنی کوردستان نەکەنەوە ' گەر بیریشیان لێ کردەوە بەهۆی لاواز بوونیان توانای بەدیهێنانی ئەم ئاواتەیان نەبێت، لەم هەوڵەشیاندا سەرکەوتوو بوون و توانیان تەواوی هێزو لایەنەکانی کوردستان بەشەڕ بهێنن و هێنانە دی ئامانجە نەتەوەیی و نیشتیمانیەکانیان دوا بکەوێت .

دووەم | پارتی دیموکراتی کوردستان لە دوای هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلوول خۆی بەمیراتگری شۆڕش دەزانی و پێی وا بوو نابێت هیچ هێزێکی تر جگە لەپارتی لەگۆڕەپانی سیاسی کوردستان بوونی هەبێت و شۆڕش هەڵگیرسێنێت، یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانیش لەدوای هەرەس بوو بە ئەمری واقع (دیفاکتۆ) ' هەر بۆیە پارتی هەر لەسەرەتاوە کەوتە پەلاماردانی یەکێتیی تا بیپوکێنێتەوە، هەموو هەوڵ و تەقەڵلاکانی خستە گەڕ بەڵام پێی نەکرا بۆیە پەنای بۆ هێزە دەرەکیەکان و ناوخۆییەکانی تری وەك حزبی سۆسیالست و حزبی شیوعی و پاسۆك برد تا بتوانن یەکێتی بسڕنەوە، ئەم تێڕوانینە کوێرانەیەش بە یەك لە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ دادەنرێت .

سێیەم | هەرێمی کوردستان و پارتەکانی بەدەر نەبوون لەو ململانێ ئایدیۆلۆژییەی ئەو سەردەمە کە جیهانی گرتبووەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان نوێنەرایەتی کۆنە پارێزەکانی دەکردو هەوڵی دەدا ململانێی ئایدیۆلۆژی لە ڕێگەی شەڕ کردنەوە بباتەوە[1].

بە بڕوای من پێکهێنانی بەرەی جوود و یەکخستنی سیاسەت و هەڵوێستی چوار حزبەکە دەرهەق بە چۆنیەتی مامەڵەو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یەکێتیی ' بە فاکتەری هەرە سەرەکی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ دادەنرێت لە شەڕی ناوخۆی دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەمدا، ئاڵۆز بوون و تێکچوونی پەیوەندی نێوان یەکێتیی و حزبەکانی ناو بەرەی جوود شەڕو پێکدادانی چەکداری بەدوای خۆیدا هێناو لە ماوەی پێنج ساڵدا سەدان پێشمەرگەی هەموو لایەنەکان لەو پێکدادانەدا کوژران و سەدانی تر بریندار بوون:

-لە ڕێککەوتی ٢٢-٦-١٩٨١ لە گوندی مامەخەلان مەفرەزەیەکی پاسۆك و مەفرەزەیەکی یەکێتیی پێکدا هەڵپڕژان بەو هۆیەوە پێنج پێشمەرگە لە هەردوولا کوژران.

-لە ڕێککەوتی ٢٣-٦-١٩٨١ لە گوندی گەڕەدێ یەکێتیی و پاسۆك کەوتنە شەڕەوە، لەوێشدا شەش پێشمەرگەی هەردوولا کوژران.

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ کاکل ئەحمەد مەعرووف لە ڕێککەوتی ٢٠-٢-٢٠٢١

-لـه ڕێککەوتـی ٢٣-٨-١٩٨١ لەنزیـك گونـدی سـێکانیان هێزەکانـی حزبـی سۆسیالسـتی کوردسـتان و یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان بەشـەڕ هاتـن، لەئەنجامـدا سـیانزە پێشـمەرگەی هـەردوولا کـوژران.

-لـه ڕێککەوتـی ١٢-٩-١٩٨١ لـه خۆشـناوەتی مەفرەزەیەکـی حزبـی سۆسیالسـتی کوردسـتان و یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان لەنـاو دووکانێکـی سـاردەمەنی بـوو بەشـەڕیان ' لەئاکامـدا سـێ پێشـمەرگەی هـەردوولا کـوژران.

-لە ڕێککەوتـی ٤-٩-١٩٨١ لـه دەرگەڵـه مەفرەزەیەکـی حزبی شـیوعی عێـراق و مەفرەزەیەکـی یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان لەئەنجامی سـەرهەڵدانەوەی کۆنـه قیـن دەبێتـه شـەڕیان، بەهۆیـەوە سـێ پێشـمەرگەی هـەردوولا کـوژران.

-لـه ڕێککەوتـی ١٠-١٠-١٩٨١ لەشـارباژێڕی سـەخت لەنێـوان مەفرەزەیەکـی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و مەفرەزەیەکـی یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان شـەڕ ڕوویـدا لـه ئەنجامـدا چـوار پێشـمەرگە لـه هـەردوولا کـوژران.

-لـه ڕێککەوتـی ١٩-١١-١٩٨١ مەفرەزەیەکـی حزبـی سۆسیالسـتی کوردسـتان و یەکێتیـی نیشـتیمانیی کوردسـتان لـه گونـدی نێرەگیـن پێکـدا هەڵپـژان لەئاکامـدا چـوار پێشـمەرگەی هـەردوولا برینـدار بـوون .

لە٢٨-٧-١٩٨٢ بە ناوبژیوانی فاتح ڕەسووڵ سەرکردەی حزبی شیوعی عێراق هەردوولا ( یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان ) گەیشتن بە ڕێککەوتنێك، بەپێی ڕێککەوتنەکە هێزەکانی پارتی و یەکێتیی بێ هیچ ڕێگریەك بۆیان هەبێت لە تەواوی کوردستان جەولەو کاری پێشمەرگانە ئەنجام بدەن، لە چوارچێوەی ئەو ڕێککەوتنەدا لە ماوەیەکی کەم هێزەکانی پارتی گەیشتنە ناوچەی باڵەکایەتی و خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر و هێزەکانی تریان کە لەناوچەی سنەو حەسەناوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون گەیشتنە ناوچەی شارەزورو شارباژێر. ئەم ڕێککەوتنە لە کاتێکدا ئەنجام درا لە نێوان یەکێتیی و دوو لایەنەکەی تر ( سۆسیالست ، پاسۆك ) هیچ ڕێککەوتنێك بۆ ئاشتبوونەوە نەکرابوو و لەشەڕی یەکتردا بوون، تەنها لەگەڵ حزبی شیوعی گرژیەکان خاو کرابوونەوەو هاتوچۆو پەیوەندیەکانیان ئاسایی کرابووەوە، بەڵام زۆری نەخایاند جارێکی تر پەیوەندیەکانی یەکێتیی - شیوعی گرژی و ئاڵۆزی تێکەوتەوەو بەرەی جوودیان چالاك کردەوە.

پایزی ساڵی ١٩٨٢ مەفرەزەکانی پارتی و حزبی شیوعی و سۆسیالست و پاسۆك کە لەبەرەی جوود هاوپەیمان بوون بەهاوبەشی و پێکەوە جەولەیان دەکرد، لەم جەولە هاوبەشانە یەکێتیی نیگەران بوو، نیگەرانی یەکێتیی لەوەوە سەرچاوەی

گرتبوو کە سێ لایەنەکەی تر (شیوعی، سۆسیالست، پاسۆك) لە ناخافڵ و بەهۆی تێکەڵ بوونی پێشمەرگەکانی پارتی لەگەڵیان و لەپەنای پارتیەوە پەلاماری مەفرەزەکانی یەکێتیی دەدەن، یەکێتیی بە نامەیەك داوای لە پارتی کرد کە مەفرەزەکانیان جەولەی هاوبەش ئەنجام نەدەن لەگەڵ سێ حزبەکەی تر، یان ئەگەر جەولەی هاوبەشیشیان ئەنجامدا بتوانێت گرەنتی ئەوە بکات لەو جەولە هاوبەشانە هێزی سێ لایەنەکەی تر پەلاماری یەکێتی نەدەن، ئەگەر پارتی نەتوانێت یان نەیەوێت پەلاماری ئەو سێ لایەنە لەکاتی جەولەی هاوبەشیاندا رابگرێت ئەوا یەکێتیی ناچار دەبێت لەکاتی پەلاماردانیدا بەرگری لە خۆی بکات، بەڵام پارتی هەم بەردەوام بوو لە جەولە هاوبەشەکانی هەم هیچ دڵنیاییەکی نەدایە یەکێتیی بەمەش سەرلەنوێ پەیوەندی نێوان یەکێتی و پارتی گرژی تێکەوتەوە ' بەتایبەتی لەدوای ئەوەی هێزێکی هاوبەشی هەر چوار لایەنەکە لەباڵەکایەتی سێ پێشمەرگەی یەکێتیان چەك کرد.

مامۆستا بەکر مستەفا کادری ئەو سەردەمەی یەکێتیی لەبارەی جمووجۆڵەکانی بەرەی جوودەوە گوتی: لەسەرەتای زستانی ساڵی ١٩٨٣ چوار حزبەکەی ناو بەرەی جوود سەرکردایەتیەکی سەربازی هاوبەشیان پێکهێناو بڕیاریاندا بەهەر نرخێك بێت

یەكێتیی لاواز بكەن بە جۆرێك توانای بەرگری لە خۆ كردنی نەمێنێت، بۆ ئەمەش پلانێكی سەربازی هاوبەشیان دارشت كە یەكەم پەلاماریان بۆ سەر مەڵبەندی چواری هەولێری یەكێتیی بێت لە بالیسان، چونكە پێیان وابوو بە گرتنی مەڵبەندی چواری هەولێر ' هێزەكانی یەكێتیی لە دەشتی هەولێرو خۆشناوەتی و باڵەكایەتی بەتەواوی هەڵدەوەشێتەوەو كۆتایی دێت[1].

لەماوەی یەك مانگدا بەرەی جوود هێزەكانیان خزاندە دۆڵی بالیسان و دۆڵی خانەقاو دۆڵی مەلەكان كە ژمارەیان هەزار پێشمەرگە دەبوو، لەرێككەوتی ١٩-٤-١٩٨٣ لە نێوان هێزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان و حزبی سۆسیالستی كوردستان و حزبی شیوعی عێراق و پاسۆك لەلایەك و هێزەكانی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان لەلایەكی تر شەڕ هەڵگیرسا لە شارباژێر، بە گوێرەی لێكدانەوەی ئەوسای بەرپرسانی یەكێتی مەبەست لەپەلامارەكەی بەرەی جوود بۆ سەر شارباژێر غافڵگیركردنی یەكێتی بوە تا بیر لە توندوتۆڵ كردنی ناوچەی بالیسان و مەڵبەندی چوار نەكەنەوە .

لەبارەی ئەو هێرش و پەلامارە ' كادری ئەو سەردەمەی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان مامۆستا بەكر مستەفا گوتی :

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ مامۆستا بەكر مستەفا لەرێككەوتی ٧-٧-٢٠٢٠

هێزەکانی بەرەی جوود کە پێکهاتبوون لە نزیك هەزار چەکداری هەریەکە لە حزبی سۆسیالستی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعی عێراق و پاسۆك کە بە گوندەکانی شێخ وەسانان و توتمەو دەراش و شیرەی سەروو و خوارو و شاخەکانی ناوچەکە دابەش بووبوون، هێزەکانی ئێمەش ۳۰۰ تا ۳۵۰ پێشمەرگە دەبوو لەناو گوندی بالیسان و شاخ و گردەکانی دەوروبەری دابەش بوون، بەرەبەیانی شەوی ۲۷-٤-۱۹۸۳ لە هەموو لایەکەوە دەستیان کرد بە هێرش و پەلاماردان، ئەو شەڕە تا درەنگانی شەوی خایاند بەڵام بەداخەوە لەو شەڕەدا حەوت پێشمەرگەی یەکێتی شەهید بوون لەناویاندا فەرماندەی کەرتی دوو کاك ئەحمەد قەمبەری بوو کە هەرگیز نەماندەویست پێشمەرگەکانمان لەشەڕی ناوخۆ بکوژرێن.

لەبارەی ئەو دەنگۆیەی کە دەگوترا گەلەکۆمە لە یەکێتیی کراوە، ئایا ڕاست بوو؟ مامۆستا بەکر مستەفا گوتی : ئەو سەردەمە یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بەهێزترین حزبی چەکداری کوردستان بوو' خاوەنی هەزاران پێشمەرگەی خوێندەوارو ڕاهێنراو و خاوەن ئەزموونی سیاسی و دسپلینی سەربازی بوو، بۆیە لەسەر ئاستی ناوخۆیی و ناوچەیی دژایەتی دەکرا ئەم دژایەتیەش تەنها بواری ڕاگەیاندن و وتاری ڕادیۆو ڕۆژنامەو گۆڤارو بەیاننامەی نەگرتەوە بەڵکو بواری پەلامار

و هێرشی سەربازیشی گرتەوە، نامەوێت لە نرخ و سەنگی هیچ حزب و پارتێکی تر کەم بکەمەوە بەڵام هیچ هێزێکی کوردستانی بەقەد یەکێتیی زیانی لە دووژمنانی کورد نەداوەو نەکەوتوونەتە ناو چوارچێوەی حیساباتی سیاسی و سەربازیان، ئەمە وای لە حزبەکانی تر کرد بیر لە لاواز کردنی یەکێتیی و دوورخستنەوەی یەکێتیی بکەنەوە لە گۆڕەپانەکە، جگە لەوەی دەستی دەوڵەتانی ناوچەکەشی تیا بوو تا هان بدرێن و هاوکاری بکرێن بۆ دژایەتی کردنی یەکێتیی، هۆکاری هەرە سەرەکیش لەم گەلەکۆمەیەی سەر یەکێتی ئەوە بوو هەر سێ حزبەکەی ناو بەرە جگە لە پارتی لە ڕووی فکرو ئایدیۆلۆژیەوە خاوەنی هەمان ئاراستەی سیاسی بوون بەڵام گەشەی یەکێتی بەراورد بەوان زۆر خێراتر بوو، بگرە سێ حزبەکە لە ڕووی جەماوەریەوە پاشەکشەی گەورەیان کردبوو و ئەندامانیان کۆمەڵ کۆمەڵ وازیان دەهێنا و پەیوەندیان دەکرد بە یەکێتییەوە، هەربۆیە هەر سێ حزبەکەو پارتیش هاوڕابوون لەسەر لاواز کردنی یەکێتیی و دەرپەڕاندنی لەگۆڕەپانەکە' ئەمەش یەك لەئامانجە هەرە سەرەکیەکانی دەوڵەتانی ناوچەکە بوو تا بەرەی جوود بکەن بە لەمپەر لەبەردەم گەشەکردنی یەکێتیی ' بەلایەنی کەم بۆ ئەوەی یەکێتیی سەرقاڵ بکەن بەبابەتی ناوخۆیی و ململانێی حزبەکانی کوردستانەوەو نەپرژێتە سەر

ئەرکـە نیشـتیمانی و نەتەوەیـی و چینایەتیەکانـی، بۆیـە دەتوانیـن بڵێیـن بـەرەی جـوود بـەرەی گەلەکۆمـە بـوو لـە یەکێتیـی[1].

پێشـمەرگەیەکی تـری کەرتـی دوو کـە بەشـدار بـوە لەشـەڕی بالیسـان ' شـەریفی کوێخـا سـاڵحە، لـە بـارەی چۆنیەتـی ڕوودانـی شـەڕەکەو شـەهید بوونـی فەرماندەکەیانـەوە گوتـی : ئێمـە وەك پێشـمەرگەکانی کەرتـی دوو بەفەرماندەیـی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری لەلایـەن فەرمانـدەی تیپـەوە نێردرایـن بـۆ ئـەو تیشـە شـاخەی کـە بەرانبـەر شـاخی دەڕڕاشـە، بەرەبەیانـی ڕۆژی ٢٧ی نیسـان نـم نـم بـاران دەبـاری لەلایـەن هێزەکانـی بەرەی جـوودەوە لەبەرزاییەکانـی شـاخی دەڕڕاشـەوە پەلامـار درایـن و شـەڕ دەسـتی پـێ کـرد، کاك ئەحمـەد هەمـوو پێشـمەرگەکانی دابـەش کردبـوو لەسـەر زنجیرە شـاخەکە ' خۆیشـی دوای بەسـەرکردنەوەی برادەران لەسـەنگەرێك دەسـتی کـرد بـە تەقـە کـردن، لەگـەڵ ڕۆژهەڵاتنـدا هێرشـەکانی بـەرەی جـوود تونـدو زیاتـر بـوو، ئامانجـی ئـەوان ئـەوە بـوو بـارەگای مەڵبەنـد بگـرن کـە لەبالیسـان بـوو بۆیـە هەمـوو هێزەکانیـان خزاندبـوە ئـەو ناوچەیـە، بەداخـەوە لـەو شـەڕەدا کاك ئەحمـەد قەمبـەری و شـەش پێشـمەرگەی تـر شـەهید بـوون و نزیکـەی چـل برینداریشـمان هەبـوو[2].

---

١- گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ مامۆستا بەکر مستەفا لە ڕێککەوتی ٧-٧-٢٠٢٠

٢- گفتوگۆ لەگەڵ مام شەریف گەرمکی لە ڕێککەوتی ١٤-١٢-٢٠٢٠

لوقمانی حاجی عەزیز یەکێك بوە لەپێشمەرگەکانی کەرتی دوو و بەشداربوی شەڕی بالیسان، لەبارەی چرکەساتی شەهید بوونی ئەحمەد قەمبەریەوە گوتی: سەعات چواری بەیانی ڕۆژی ٢٧-٤-١٩٨٣ چەکدارانی بەرەی جوود لە قۆڵی شێخ وەسانانەوە پەلاماری سەنگەرەکانی ئێمەیان دا کە لەتیشە شاخەکانی نزیك بالیسان بووین، ئەوان مەبەستیان بوو ئەو تیشە شاخە بگرن چونکە زاڵ بوو بەسەر گوندی بالیساندا کە بارەگای سەرەکی هەڵبەندی چواری هەولێری یەکێتی لێ بوو، کاك ئەحمەد لەبەر ئەوەی فەرماندەی کەرت و بەرپرسی ئەو پێشمەرگانە بوو کە لەو تیشە شاخە دابەش بوو بووین بەردەوام سەنگەرەکانی پێشمەرگەی بەسەر دەکردەوەو ورەو ئازایەتی بەهەموومان دەبەخشی، دوای چەند سەعاتێك بەرگری کردن فیشەکمان کەم بوو وو، شەهید ئەحمەد لەگەڵ ڕۆژهەڵاتندا منی نارد بۆ ناو بالیسان بۆ لای کاك سەید کەریم، پاش سڵاو کردن پێم گوت کاك ئەحمەد منی بۆ لای تۆ ناردوە فیشەکمان بۆ بنێری، کاك سەید بە جیهاز قسەی دەکرد هەر بەدەم قسە کردنەوە بانگی پێشمەرگەیەکی کردو ڕایسپارد تا فیشەکمان بداتێ، گونیەیەك فیشەکی هەمەچەشن لە کلاشینکۆف - برنۆ- ژێرسە- بیکەیسیم لێ وەرگرت و بەلای کاك سەید دا هاتم ویستم سوپاسی بکەم و خواحافیزی لێ بکەم کاتێك فیشەکێك

بەر جیهازەکە کەوت خەریك بوو کاك سەید بپێکێت، دیاربوو لە هەموو لایەکەوە هێرش کرابوە سەر مەڵبەند، بە شاخەکەدا هەڵزنام و فیشەکەکانم گەیاندە سەرشاخ و تەسلیمی کاك ئەحمەد کردم ئەویش دوو پێشمەرگەی ڕاسپارد فیشەکەکان دابەش بکەن، کات بەرەو چێشتەنگاو دەڕۆیشت نم نم باران دەباری، لەو بارودۆخەدا کە پەلاماری چەکدارانی بەرەی جوود توندتر دەبوو کاك ئەحمەد جارێکی تر سەردانی سەنگەرەکانی کردەوە، لە سەنگەرەکانی ڕۆژهەڵاتەوە پێدا هات و سەری لە کاك دلێر کانی لەلەیی و کاك شەریفی کویخا ساڵح دا ' دواتر بەتەنیشت سەنگەرەکەی ئێمەدا تیپەڕی و لە هەواڵی ئێمەشی پرسی ئنجا گەیشتە سەنگەرەکەی کاك حوسێن پەڵکانەیی و کاك لاوەی کوێخا یابەو قسەی لەگەڵ ئەوانیش کرد، چەند مەترێك لە دووری کاك لاوەو کاك حوسێن چەند بەردێکی خستە سەر یەك لە شێوەی سەنگەر ڕێکی خست، لوولەی تفەنگەکەی خستە نێوان دوو بەردو لێی دامەزراو دەستی کرد بە تەقە کردن، هێرش و پەلامارەکان بۆ سەر سەنگەرەکانمان تا دەهات چڕتر دەبوو و لە هەموو لایەکەوە تەقە بوو، کاتێك گوێم لە دەنگی یەکێك لەپێشمەرگەکانمان بوو گوتی کاك ئەحمەد پێکرا، سەرەتا کاك لاوەو کاك حوسێن گەیشتنە سەری دواتر

منیش چووم، بەداخەوە فیشەکێك سەری پێکابوو[1].

یەکێکی تر لەپێشمەرگەکانی کەرتی دوو کە بەشدار بوە لەشەڕی بایسان شەماڵ قەرەبەگە، دەربارەی شەڕەکەو چۆنیەتی شەهید بوونی ئەحمەد قەمبەری گوتی : چەند ڕۆژێك بەر لەشەڕی بالیسان برووسکەیەکی بەپەلە گەیشتە کاك ئەحمەد قەمبەری، ئەویش پێشمەرگەکانی کەرتی دووی کۆ کردەوەو هەموو ئەوانەشی هێنایەوە کە مۆڵەت درابوون، ناوەرۆکی برووسکەکە ئەوە بوو بەزووترین کات تەواوی فەرماندەو پێشمەرگەکانی کەرتی دوو بگەنە مەڵبەندی چوار لە بالیسان، دوای گەیشتنمان ' واجبی سەر تیشە شاخەکانی پشتەوەی بالیسانمان پێ سپێردرا، هێزەکانی بەرەی جوود لەهەموو لایەکەوە خۆیان ئامادە کردبوو بۆ هێرشێکی بەربڵاو بۆ سەر بالیسان بەمەبەستی گرتنی مەڵبەند، هێزەکانی ئێمە لە تەواوی ناوچەکە لە ٣٠٠ تا ٤٠٠ پێشمەرگە زیاتر نەبوو بەڵام هێزەکانی بەرەی جوود بەپێی زانیاریەکان لەهەزار کەس زیاتر بوو. ئەوسا من فەرماندەی مەفرەزە بووم ' کاك ئەحمەد شوێنی

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ لوقمانی حاجی عەزیز لە ڕێککەوتی ١٢-٢-٢٠٢٠

ناوی تەواوی لقمان عەزیز قادرە لە ساڵی ١٩٦٥ لە گوندی کانی لەلەی سەر بەناحیەی تەق تەق لە دایك بوە، لە ئازاری ١٩٨٢ لەکەرتی دووی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر دەبێت بەپێشمەرگە، ئێستا خانەنشینی دێرینەو لەناحیەی تەق تەق نیشتەجێیە.

مەفرەزەکـەی ئێمـەو پێشـمەرگەکانی تـری دیـاری کـردو خـۆی دەگـەڕا بەسـەر پێشـمەرگەکاندا، بەرەبەیـان بـاران دەبـاری هەمـوو پێشـمەرگەکانمان لەئامادەیـی تـەواودا بـوون ' کاتێـك هێزەکانـی بـەرەی جـوود لەهەمـوو لایەکـەوە هێرشـیان هێنـا و شـەڕ دەسـتی پـێ کـرد، هێزەکانـی جـوود چەندیـن هێرشـیان هێنـا بـەڵام بەشـکاوی دەگەڕانـەوە، هێزەکانمـان ئەوپـەڕی ئازایەتیـان نوانـدو بەرگریـان دەکـرد هەرچەنـدە نەماندەویسـت شـەڕی براکـوژی بکەیـن بـەڵام چارەمـان نەبـوو چونکـە دەیانویسـت مەڵبەنـدی چـوار بگـرن بۆیـە بەرگریـمان دەکـرد، دوای ڕۆژهـەڵات هەواڵیـان پێدایـن کـە کاك ئەحمـەد شـەهید بـوە، بەڕاسـتی هەمووومـان تاسـاین و بەچـاوی پـڕ لەفرمێسـکەوە شـەڕمان دەکـرد، تـا دەمـەو عـەسر شـەڕ بـەردەوام بـوو بـەڵام لەسـەر بڕیـاری سـەرکردایەتی تـەواوی هێزەکانمـان پاشەکشـەمان کـرد بـۆ گونـدی شـیرێ و لـەوێ هەمـوو هێزەکانمـان یەکـمان گرتـەوەو خۆمـان کـۆ کـردەوەو واجبـمان دابـەش کـرد و جارێکـی تـر سـەنگەرەکانمان توندوتـۆڵ کـردەوە[1].

---

١- نـاوی تـەواوی شـەماڵ محەمـەد نامقـە، لەسـاڵی ١٩٦٢ لەگونـدی قەرەبـەگ لـە دایـك بـوە ' لەسـاڵی ١٩٨٢ لەکەرتـی یەکـی تیپـی ٨٦ ی دەشـتی هەولێـر بـوە بـە پێشـمەرگە دواتـر گوازراوەتـەوە بـۆ کەرتـی دوو، ناوبـراو ماسـتەری هەیـە لەزانسـتی کۆمپیوتـەر، ئێسـتا لەوڵاتـی بەریتانیـا نیشـتەجێیە.

ئـەرکان عەزیـز دانیشـتووی ئێسـتاو ئەوسـای بالیسـان سـەبارەت بـە شـەڕی بالیسـان و شـەهید بوونـی ئەحمـەد قەمبـەری و هاوڕێکانـی گوتـی : چەنـد ڕۆژێـك پێـش هێـرش و پەلامـاری بـەرەی جـوود پێشـمەرگەکانی مەڵبەنـدی چـوارو تیپـی ٨٦ ی دەشـتی هەولێـرو کـەرت و مەفرەزەکانـی خۆشـناوەتی لەدەوروبـەری بالیسـان دابـەش بووبـوون و سـەنگەریان لـێ دابـوو و دەیانزانـی بـارەگای مەڵبەنـد و ناوچەکـە دەکەوێتـە بـەر پەلامـاردان. بەپێـی مەزەندەکانـی ئێمـە هێزەکانـی یەکێتـی لـە ١٥٠ پێشـمەرکە تێنەدەپـەڕی بـەڵام هێزەکانـی بـەرەی جـوود زیاتـر لـە هـەزارو دووسـەد پێشـمەرگە دەبـوون ، بەرەبەیانـی ڕۆژی ٢٧-٤-١٩٨٣ نـم نـم بـاران دەبـاری لەگـەڵ گرمـەی ئاربیجـی بەخەبـەر هاتیـن ، دواتـر دەسـڕێژی کلاشـینکۆف و بیکەیسـی بـەدوادا هـات و تەقـە بـەردەوام بـوو، زانیـمان هێرشـە چاوەڕوانکراوەکـە دەسـتی پـێ کـرد، برادەرانـی بـەرەی جـوود لـە تووتمـەو خەتـێ و بیـرۆ و بالـوکاوەو شـاخی چەقـەرێ سـپی و گـردی نزرۆکـەو قۆپـی گۆربەسـماقەو میـران و پاوانـی مـام عەلـی هێرشـیان هێنـا، ئێمـە وەك خەڵکـی گونـد دڵتەنـگ بوویـن بـەوەی بـراکان دەسـتیان ناوەتـە یەخـەی یەکـتر بـەڵام چارەمـان نەبـوو، لەگـەڵ ڕۆژهەڵاتدا هەمـوو خەڵکـی گونـد لەچاوەڕوانیەکـی ناخـۆش دا بوویـن و نـاوە نـاوە برینـداری بەرەکانـی شـەڕیان دەهێنایـە نەخۆشـخانەکە

کـە دکتـۆر زریـان و جێگـر پزیشـکێکی ژنـی لـێ بـوو بەنـاوی ژوان ' چارەسـەری برینداره‌کانیـان دەکـرد، کاتژمێـر نـۆ تـا نـۆو چارەگـی بەیانـی هەواڵیـان هێنـا کـە فەرمانـدەی کەرتـی دوو کاك ئەحمـەد قەمبـەری شـەهید بـوە ' گەرچـی بەشـەهید بـوون و برینـدار بوونـی هەموویـان دڵتەنـگ بوویـن بـەڵام شـەهید بوونـی ئەحمـەد قەمبـەری زۆر کاری لێـمان کـرد چونکـە کاك ئەحمـەد فەرماندەیەکـی زۆر خۆشەویسـت بـوو لای خەڵکـی ناوچەکـەو بەکۆمەڵێـك ڕەوشـت و ئـاکاری بـاش بەناوبانـگ بـوو وەك دەسـت و دەم و داوێــن پاکــی ' زۆری لــە خەڵــك نەدەکـرد بــۆ هیــچ کارێـك' قسـە خـۆش و نـەرم و نیـان بـوو، هـەر کات کەرتەکـەی شـەهید ئەحمـەد هاتبێتـە بالیسـان لەلایـەن خەڵکـەوە پێشـوازی گەرمـی لـێ دەکـراو خەڵـك خۆیـان پێشـمەرگەکانیان دابـەش دەکـرد بـۆ نـان خـواردن، هـەر ئـەو کات تەرمەکـەی شـەهید ئەحمەدیـان لەسـەر شـاخ هێنایـە خـوارەوەو لـە گـردی قەراتیلـۆك بەشـێوەی کاتـی نێـژرا.

هێزەکانـی یەکێتـی تـا دەمـەو ئێـوارە لـە سـەنگەرەکانیان مانـەوە بـەڵام دواتـر برووسـکەی مەڵبەندیـان بەدەسـت گەیشـت کـە بگەڕێنـەوە بـۆ گونـدی شـیرێ. دوای ئـەوەی هێزەکانـی بـەرەی جـوود هاتنـە نـاو بالیسـان دەسـتیان کـرد بەپشـکنینی ئـەو ماڵانـەی گومانیـان لـێ بـوو و هەڕەشـەیان لـە دانیشـتوانی گونـد

کـرد کـە ئەگـەر هـەر کەسـێك پێشـمەرگەی یەکێتـی حەشـار دابێـت مامەڵـەی چەکـداری لەگـەڵ دەکرێـت[1].

یـەك لـەو کەسـانەی کـە شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری لەنزیکـەوە ناسـیوەو لـە هەمـان بـەرەی شـەڕ دا بـوە فەقـێ شـێخ وەسـانیە، دەربـارەی شـەڕەکەو چۆنیەتـی شـەهید بوونـی ئەحمـەد قەمبـەری گوتـی : سـاڵی ۱۹۸۳ بەسـاڵی بڵێسـە سـەندنی ئاگـری شـەڕی ناوخـۆ دادەنرێـت ' ناوچـەی خۆشـناوەتیش بەکـوورەی جۆشـخواردوی ئـەو ئاگـرە ئەژمـار دەکرێـت، لـە ناوەڕاسـتی مانگـی نیسـانی ۱۹۸۳ هەسـت بەجموجۆڵـی هیزەکانـی بـەرەی جـوود دەکـرا لـە ناوچەکـەو زانیاریـەکان ئەوەیـان لـێ دەخوێنرایـەوە کـە هێزەکانـی جـوود بیانەوێـت بالیسـان و مەڵبەنـدی چـواری یەکێتیـی بگـرن ' بـۆ ئـەوەی پێـش لـەو شـەڕە بگیرێـت و خوێنـی کـورد بەدەسـتی کـورد نەڕژێـت دکتـۆر کەمـال خۆشـناو کـە ئـەو کاتـە لێپـرسراوی مەڵبەنـدی چـوار بـوو لەگونـدی دەراش ئەنجومەنـی هەمـوو گوندەکانـی ئـەو دەووبـەرەی بانـگ کـردو لەگەڵیـان کـۆ بـوەوەو داوای لـێ کـردن کـە ڕۆڵـی ناوبـژی ببینـن و سـەردانی هێزەکانـی بـەرەی جـوود بکـەن و داوایـان لـێ بکـەن شـەڕ نەکـەن، چەنـد ڕۆژێـك دوای ئـەوە هێزەکانـی بـەرەی جـوود لـە جیاتـی ئـەوەی

---

۱- گفتوگۆ لەگەڵ ئەرکان بالیسانی لە ڕێککەوتی ۱۰-۲-۲۰۲۱

ناوی تـەواوی ئـەرکان عەزیـز عوسـمانە، لەسـاڵی ۱۹٦۰ لەگونـدی بالیسـان لەدایـك بـوە، لـە سـاڵی ۱۹۸۰ بـوە بـە پێشـمەرگە، ئێسـتا لـە ناحیـەی بالیسـان نیشـتەجێیە

پێشنیاری ئاشتەواییان قبووڵ بوایە هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر بالیسان و لە هەموو لایەکەوە بوە شەڕ، ئەو شەڕە لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٧ ی نیسانی ١٩٨٣ دەستی پێ کرد و تا دەمەو ئێوارەی خایاند کە لەئەنجامدا ئێمە حەوت شەهیدو چل بریندارمان دا ' هێزەکانی ئەوانیش دەیان کوژراو و برینداریان هەبوو، لەناو شەهیدەکانی ئێمە کاك ئەحمەد قەمبەری بوو کە باشترین فەرماندەی کەرتی ئەو سەردەمەی یەکێتیی بوو و هەمووومان پێی دڵتەنگ بووین. ئەوەی شایەنی گێڕانەوەو باس کردن بێت دەربارەی شەهید پیرۆت گرجانیە کە یەك لەو حەوت شەهیدەی بالیسان بوو ' ئێوارەی ٢٦-٤-١٩٨٣ واتە ڕۆژێك پێش پەلامارەکەی بەرەی جوود شەهید پیرۆت پێی گوتم : نامەیەك بەناوی منەوە بۆ باوك و دایکم بنوسە ' لە نامەکە داوایان لێ بکە بێنە سەردانم لە بالیسان چونکە بریندارم. منیش بەپێکەنینەوە گوتم : کاك پیرۆت تۆ کوا برینداری ؟ نامەی وا چۆن بنوسم ؟ ئەویش گوتی : براڵە گەر هەواڵی وایان پێ نەگات نایەنە سەردانم. منیش بەناچاری و لەبەر خاتری ئەو نامەکەم بەو شێوەیە نوسی کە خۆی دەیویست، ئەوەی هەمووومانی تاساند ئەوە بوو باوك و دایکی پیرۆت گرجانی عەسری ڕۆژی ٢٧ - ٤ بەهۆی نامەکەوە هاتن' بەڵام چۆن هاتنێك ؟ هاتنە دیار جەنازەی شەهید پیرۆتی

کوڕیـان کـە لـەو شـەڕەی بالیسـان شـەهید بـوو[1].

حاجـی سـەلام بالیسـانی ئـەو پیاوەیـە کـە تەرمەکـەی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری شوشـت و کفنـی کـرد[2] لەچاوپێکەوتێکی کورت دا گوتـی : دوای ئـەوەی هەواڵـی شـەهید بوونـی کاك ئەحمـەد قەمبـەری گەیشـتە کاك دکتـۆر کەمـال خۆشـناو بەرپرسـی ئـەو کاتـەی مەڵبەنـدی چـوار[1] هەندێـك کفنـی نـاردو منـی ڕاسـپارد تـا بچـم تەرمەکـەی بشـۆم و بەخاکـی بسـپێرم، چێشـتەنگاو نـم نـم بـاران دەبـاری جەنازەکـەی کاك ئەحمەدیـان لەسـەر شـاخ هێنایـە خـوارەوەو لەگـەڵ خوالێخۆشـبوو حەمـەدی مـام عەزیـز پێکـەوە تەرمەکەمـان شووشـت و کفنـمان کـردو لـە گـردی قەراتیلـۆك لـە خـواروی بالیسـان بەئامانـەت ناشـتمان[2].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ فەقێ شێخ وەسانی لە ڕێککەوتی ١٠-٢-٢٠٢١

نـاوی تـەواوی مسـتەفا ڕەسـووڵ محمـد ئەمینـە، لەسـاڵی ١٩٦٤ لەگونـدی شـێخ وەسـانان لـە دایـك بـوە، لـە سـاڵی ١٩٨٠ بـوە بـە پێشـمەرگە، ئێسـتا پلـەی عەقیـدەو لێپـرسراوی بنکـەی ئاسایشـی ناحیـەی بالیسـانە.

٢- گفتوگۆ لەگەڵ سەلام بالیسانی لەڕێککەوتی ١٠-٢-٢٠٢١

نـاوی تـەواوی سـەلام حوسـێن عەزیـزە، لەسـاڵی ١٩٦٧ لەگونـدی بالیسـان لەدایـك بـوە، لەسـاڵی ١٩٨١ بۆتـە پێشـمەرگە، ئێسـتا لـە بالیسـان نیشـتەجێیە.

# وەرینی گەڵایەك لەدرەختی شۆڕش

کاتژمێـر نـۆو پانــزە دەقیقــەی ســەرلەبەیانی ڕۆژی ٢٧-٤-١٩٨٣ ئەحمـەد قەمبـەری فەرمانـدەی کەرتـی دووی تیپـی ٨٦ ی دەشـتی هەولێـر بـۆ دوا جـار ماڵئاوایـی لـە ژیـان کـردو شـنەبای ئـەو بەهـارە دوا هەناسـەی گواسـتەوە بەسـەر گوڵـە نیسـان و مێـلاق و گژوگیـای گـردو تەپۆلکەکانـی بالیسـاندا و ئاوێتـەی کـرد لەگـەڵ نمەبـاران و شـەونمی ئـەو چێشـتەنگاوەدا و خـاك و گوڵەکانـی پـێ ئـاودا.

هاوڕێکانـی لەنێـوان خـەم و گریـان لەلایـەك و پێکەنیـن و شـادی لەلایەکـی تـر نەیاندەزانـی کامیـان هەڵبژێرن، پێکەنیـن و دەربڕینی شـادی بـۆ ئـەوەی نـۆرەی شـەهید بونیـان لـەدوای فەرمانـدەکەیـان نزیـك بۆتـەوە تـا فەرهـاد سـەنگاوی ژیاننامەیـان بخوێنێتـەوەو بسـتێك لـە هەواڵـی ڕزگار بوونـی نیشـتیمان لەداگیرکـەران نزیـك ببنـەوە' گریـان و خەمیـش بـۆ لەدەسـتدانی کـوڕە جوتیارێـك کـە هەمـوو تەمەنـی پـڕ بـوە لـە کوێـرەوەری و ڕەنـج و تەقەڵـلاو شـوانی و گاوانـی و هەمـوو تەمەنـی گەنجـی خـۆی بەپارتیزانـی و پێشـمەرگایەتی بەخشـی کـە خۆڕسـکانە ببـوو بەکادرێکـی پـاك و لێوەشـاوە.

ئەو ڕۆژە حەوت ڕۆڵەی ئەم وڵاتە لەشەڕی براکاندا ژیانیان بەخشی و هاوڕێکانیان بەدەروونی پڕ لە خەم و پەژارەو چاوی پڕ لەفرمێسکەوە جەستەکانیان لەسەر تیشە شاخەکانەوە گواستەوە بۆ ناو بالیسان و دایانە دەستی خەڵکی ناوچەکە تا ئەوانیش جەستەی تمام ئاسایان لە ناو جەرگەی خاکی بالیسان بنێژن.

چوار ڕۆژ دوای ئەوە هەواڵێکی جەرگ بڕو ناخ هەژێن گەیشتە هەموو لایەکی کوردستان و خەڵکی دەڤەرەکەیان ' هەواڵەکە خێرا وەك تیشکی خۆر دەم بە دەم گەیشتە دایك و خوشك و براو خزم و هاوڕێکانی و تەواوی ڕێکخستنەکان و خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی تازیەدارو ڕەش پۆش کرد، لەبارەی گەیشتن و بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵەو چۆنیەتی هێنانەوەی تەرمەکەی ' محەمەدی برای شەهید ئەحمەد بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی : ئەو ڕۆژگارە حکومەتی عێراق تەماشاچی شەڕی ناوخۆی کورد بوو' لە جیاتی ئەوەی سوپاو لەشکر بنێرنە سەر هێزەکانی پێشمەرگەو لەناویان ببەن ' خۆیان خەریکی کوشتنی یەکتر بوون و گردو تەپۆلکەیان لە یەکتر گرتبوو و پێویستی بە حکومەتی عێراق نەبوو تا لەشکریان لەدژ ڕێکبخات و شۆڕش و هێزی پێشمەرگە لاواز بکات.

هەواڵ بڵاو بووبووەوە کە لەبالیسان شەڕێکی گەورە لەنێوان یەکێتی و لایەنەکانی تر ڕوویداوە، تەنانەت هەواڵەکان وا بڵاو بووبووەوە کە بالیسان لەلایەن قیادە موەقەتەوە گیرابێت و کووژراو و بریندارێکی زۆر لەهەموو لایەنەکان هەبێت ' ئێمەش دەمانزانی ئەحمەد لە بالیسانە چونکە چەند ڕۆژێك بەر لەوەی بۆ بالیسان بەڕێبکەون زۆربەی ماڵە خزم و دۆستەکان گەڕابوو و خواحافیزی یەکجارەکی لەزۆربەیان کردبوو دەتگوت دڵی خەبەری داوە کە نایانبینێتەوە، ئێمە بەهەواڵەکان توشی دلەڕاوکێ و ترس بووین بۆیە بۆ دەسکەوتنی هەواڵی ئەحمەد پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ١-٥-١٩٨٣ ڕۆیشتم بۆ گوندی ئاومال ' لەوێ خەڵکێکی زۆرم بینی بەڵام هەموویان عاجز و مەلوول دیار بوون و تەماشای منیشیان دەکرد و لە ڕووخساریان خەمێکی گەورەم خوێندەوە، لێیانم پرسی : گوتم چی بوە بۆ وا هەمووتان عاجزن ؟ گوتیان : هیچ نیە، نەیاندەویست لە زاری ئەوانەوە هەواڵی شەهید بوونی ئەحمەد بزانم. هێندەی پێ نەچوو ئامۆزایەکم بەناوی عومەر حەمە حەبیب ئەحمەد هاتە ئاومال ' بەبینینی ڕووخساری زانیم کارەساتێك ڕوویداوە، جیای کردمەوەو گوتی : ئەحمەد لە بالیسان بریندار بوە ' هەرکە وایگوت لەوە تێگەیشتم کە شەهید بوە نەك بریندار، دواتر خۆی ڕانەگرت دەستی کرد بە گریان ' ئنجا گوتی

شـەهید بـوە، ئـەو دەقیقەیـە بـۆ مـن ناخۆشـترین ڕۆژی ژیانـم بـوو و نەمتوانـی خـۆم ڕابگـرم و دەسـتم کـرد بەگریـان، دواتـر ئـەو خەڵکانـەی لـەوێ بـوون دەوریـان دام و دڵیـان دەدامـەوە بـەڵام بێسـوود بـوو چونکـە شـەهید بوونـی ئەحمـەدی بـرام بـۆ ئێمـە کارەسـاتێکی گـەورە بـوو، عـەسری هەمـان ڕۆژ لەگـەڵ خزمەکانی ئاومـاڵ و تـازەدێ و قەمبــەر لـە ماڵــی کاك عەبــدوڵای مـام ئۆمـەری تـازەدێ دانیشـتین و تەگبیـری هێنانـەوەی تەرمەکەیـمان کـرد بـۆ بەیانـی لەگـەڵ خەڵکێکـی زۆر بـەرەو بالیسـان کەوتینـە ڕێ، دەمـەو نیـوەڕۆی ڕۆژی ٢-٥-١٩٨٣ گەیشـتینە گونـدی بالیسـان و مــەلای گوندەکــە کەناوەکەیــم بیــر نەمــاوە لەگەڵــمان هاتــە سـەر گۆڕسـتان و گۆڕەکـەی پـێ نیشـانداین و گوتـی بـە ئامانـەت ناشـتومانە، لــە مــاوەی نیــو کاتژمێــردا تەرمەکەیــمان لەگۆڕەکــە دەرهێنــاو خســتمانە نــاو ئۆتۆمبیلەکــەی کاك قــادر عەبــدوڵای تـازەدێ و بەڕێکەوتیـن، لـە بازگـەی ئەمنـی هیـزۆپ بـۆ ماوەیـەك ڕایانگرتیـن و بـە تـکاو پاڕانەوەیەکـی زۆر مۆڵەتیـان دایـن بڕۆیـن، بـەڵام لەبازگـەی ئەمنـی کۆیـە کە کەوتبـوە دامێنی هەیبەتسـوڵتان ئێمەیـان گێڕایـەوە ' هەرچەنـدە زۆر تکامـان کـرد بـەڵام بێسـوود بـوو و نەیانهێشـت تەرمەکـە ببەینـەوە ' دواتـر ڕێگایەکـی خۆڵـمان دۆزیـەوەو بـەرەو دەشـتی کۆیـەو داوداوە هاتیـن، لـە ناحیــەی تـەق تەقیـش بـۆ ئـەوەی کێشـەمان بـۆ دروسـت نەبێـت بـەدەم

زێدا هاتین و بەهەر جۆرێك بوو دەمەو ئێوارە گەیشتینەوە قەمبەرو تەرمەکەمان بردە گۆڕستان، سەر گۆڕستان پڕ بوو لە خەڵکی ناوچەکەو بەگریان و مەلوولەوە چاوەڕوانی هێنانەوەی تەرمەکەیان دەکرد.

محەمەدی برای شەهید ئەحمەد قەمبەری لەدرێژەی گێڕانەوەکەی گوتی: تا بیست ڕۆژ پرسەکەی بەردەوام بوو و لە هەموو شارو شارۆچکەو گوندەکانی کوردستانەوە چین چین خەڵك دەهاتن بۆ پرسەکە تا دڵمان بدەنەوەو هاوخەمی خۆیان دەرببڕن[1].

هەر لەبارەی بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە دڵتەزێن و غەمگینە عەبدوڵای برای شەهید ئەحمەد کە ئەوسا تەمەنی تەنها سێنزە ساڵ بوە بەم شێوەیە گێڕایەوە: دوای ئەوەی بالیسان و مەڵبەندی چوار لەلایەن هێزەکانی بەرەی جوودەوە دەستی بەسەردا گیرا ئێمە هیچ زانیاری و هەواڵێکی شەهید ئەحمەدمان نەدەزانی ئایا لە ژیان ماوە یان نا، هەموومان عەوداڵی هەواڵێك بووین کە لەبالیسانەوە بگاتە دەستمان بەتایبەتی دایکم، دوا نیوەڕۆی ڕۆژی ١-٥-١٩٨٣ لە ماڵەوە وا بڕیارمان دا کاکم محەمەد بە تراکتۆرەکەمان بڕوات بۆ گوندی ئاوماڵ تا لەوێ هەواڵی شەڕەکەی بالیسانی دەست بکەوێت

١- گفتوگۆ لەگەڵ محەمەد ئۆمەر ئەحمەد لە ڕێککەوتی ٧-٢-٢٠٢١

و لـه سـەلامەتی کاکـم دڵنیـا بێـت ' بـۆ ئەمـەش گاسـنی جـوت کردنمـان خسـتە دوای تراکتۆرەکـە تـا خەڵـك وا تێبـگات کاکـم بـۆ جـوت کـردن دەچێتـە دەشـت و دەر نـەك هـەواڵ پرسـینی کاکـم ' هەڵبەتـە ئەمـەش لەبـەر ئـەوە بـوو تـا جاسـووس و سـیخوڕەکان خەبەرمـان لـێ نـەدەن و نەگیرێیـن.

عـەسری هەمـان ڕۆژ چوومـە لای ئـەو گـردەی کـە خەڵکـی ئاوایـی ڕۆژانـە لـە نزیکـی دادەنیشـتن ' پـری بـوو لـە گەنـج و پیاوانـی ئاوایـی، کاتێـك تراکتۆرێکـمان بینـی لـە گـەرووی قەبرسـانەوە ڕوەو نـاو ئاوایـی هـات ، زۆری پێنەچـوو کوڕێـك بەنـاوی محەمـەد مـام سـەعید گوتـی : ئـەو تراکتـۆرە چـوە مـاڵ ئێـوە، منیـش بـە خێرایـی چوومـەوە مـاڵ ' ئـەوەی لـەوێ بـوو کاکـم مەجیـد بـوو کـە لـە گونـدی نێرەگینـەوە هاتبـوو و هەواڵـی بریـندار بوونـی کاکـم ئەحمـەدی پـێ ڕاگەیاندبـوون، دایکـم و منداڵـەکان دەگریـان و پێیـان وابـوو شـەهید بـوە نـەك بریـندار، کاکـم مەجیـد دەیزانـی کاکـم محەمـەد شـەهید بـوە بـەڵام نەیدەویسـت کتوپڕ ئـەو هەواڵەمـان پـێ بگەیەنێـت، دایکـم حاڵـی زۆر خـراپ بـوو و ڕەنگـی تێکچـوو بـوو لێـم پرسـی : ئـەوە چـی بـوە ؟ بـەدەم گریـان و لاوانـەوە گوتـی : کـوڕم بەخـوا کاکـت لـە ژیـان نەمـاوە، دواتـر گوتـی : بـڕۆ خزمـەکان ئـاگادار بکـەوە، منیـش چوومـە ماڵـی کاك عومـەری ئامـۆزام تەنهـا زارای کچیـان لەمـاڵ بـوو '

بەوم گوت کاکم شەهید بوە، ئەویش دەستی کرد بە گریان و لەخۆدان، دواتر چوومە ماڵی مامم ڕەشید و بەگریانەوە هەواڵە دڵتەزێنەکەم بەوانیش ڕاگەیاند، دوای ئەوە من هاتمەوە ماڵی خۆمان بەڵام پڕ بوو لە خزم و خەڵکی ئاوایی، لە ماوەی کاتژمێرێکدا خزم و دۆست و خەڵکی گوندەکانی تریش هاتنە قەمبەر ، ماڵمان پڕ بوو لە خزم و خەڵك، زۆری پێ نەچوو لە گوندی سێکانیەوە کۆمەڵێك لەخزمەکانمان هاتن کە بینیم ڕەحیمی خوشکم بە بێهۆشی لەسەر دەستیان بوو، عەسرێکی درەنگ کاکم محەمەد بە تراکتۆرەکەوە هاتەوە ماڵ بەڵام چاو بەگریان و ڕووخسارێکی شێواوەوە بینیم، نەیتوانی بە قسە کردن سڵاو بکات و بەخێرهاتنی ئەو خەڵکە بکات تەنها بە دەست سەلامی کردو چوە ژوورەوە، زۆربەی ئەو خەڵکەی لەوێ بوو دەگریان و پرچیان دەڕنیەوە.

ئەو کاتەی ئەم چاوپێکەوتنەم لەگەڵ عەبدوڵای برای شەهید ئەحمەد قەمبەری ئەنجام دا توانای گێڕانەوەی ئەو ڕووداوەی نەبوو لەبەر گریان، دوای هێور بوونەوەی درێژەی دایە گێڕانەوەکانی و گوتی : چەند شەوێك بەر لەوە خەونێکم بینی، لەخەونمدا کاکم ئەحمەد لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی کەرتەکەی بەناو شاری تەق تەق دا هاتن، لەخەوەکەمدا پێم سەیر بوو کە کاکم پێشمەرگەیەو چۆن دەتوانێت بەناو شاری تەق تەق دا بێت ؟

بـۆ بەیانـی ڕۆژی ٢-٥-١٩٨٣ کاکـم محەمـەد و کۆمەڵێـك لـە خـزم و کەسـوکارو ئەوانـەی شـەهید ئەحمەیـان خۆشدەویسـت بـە چەنـد ئۆتۆمبیلێکـەوە بـەرەو بالیسـان کەوتنـە ڕێ بـۆ هێنانـەوەی تەرمەکـەی ' هەرچەنـدە مـن زۆر هەوڵـم دا تـا لەگەڵیـان بچـم بـەڵام نەیانهێشـت، عـەسری هەمـان ڕۆژ تەرمەکەیـان هێنایـەوە قەمبـەرو بـۆ مـاوەی چەنـد دەقیقەیـەك لەبـەر دەرگای حەوشـە هێشـتیانەوە تـا دایکـم و خوشـکەکانم تەرمەکـە ببینـن و کەمێـك فەرامۆشـیان پـێ بێتـەوە، حەوشـەکەمان و تەنانـەت هەمـوو کۆڵانـەکان و سـەر قەبرانیـش پـڕ بـوو لـە خەڵـك' زۆرینـەی ئەوانـەی لـەوێ بـوون دەگریـان، دواتـر تەرمەکەیـان گواسـتەوە بـۆ سـەر گۆڕسـتان ' لـەوێ لەسـەر پێداگـری مـن و کاکـم محەمـەد بـۆ چەنـد چرکەیـەك کفنەکەیـان لەسـەر دەمووچـاوی لا دا تـا ببینیـن، تـا ئێسـتاش پـاش ٣٨ سـاڵ لـە شـەهید بوونـی هێشـتا ڕووخسـاری لەبـەر چـاوم لا نەچـوە، دەمووچـاو و ڕوومـەت و شێوەی لەکەسێکی مـردوو نەدەچـوو بەڵکـو دەتگـوت لەشـیرینی خەودایـە، حـەزم دەکـرد بـۆ دواجـار ماچێـك لـە ڕوومەتـی بکـەم و بەفرمێسـکی خۆشەویسـتیم دەمووچـاوی تـەڕ بکـەم،

بـۆ ڕۆژی دواتـر لـە مزگـەوت پرسـەمان بـۆی دانـا، پرسـەکەی تـا چەنـد ڕۆژێـك لەمزگـەوت بـەردەوام بـوو، تـا بیسـت ڕۆژ زیاتریـش لەماڵ پرسـەمان بـۆی دانـا بەهـۆی ئـەوەی لـە هەمـوو

شـارو شـارۆچکەکانی کوردسـتان و ناوچـە جیـا جیاکانـەوە خەڵـك بـەردەوام دەهاتـن بـۆ ماڵـمان بەمەبەسـتی دڵدانەوەمـان[1].

مـام قـادر عـەولا خەڵکـی گونـدی تـازەدێ بـە ئۆتۆمبیلەکـەی خـۆی تەرمـی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری هێنابـووەوە، لەبـارەی چۆنیەتـی هێنانـەوەی تەرمەکـەو ئـەو ئاستەنگانەی هاتبـوە ڕێگەیـان گوتـی: بەیانـی ڕۆژی ٢-٥-١٩٨٣ لەگـەڵ بنەماڵـەی شـەهید ئەحمـەدو خەڵکێکـی زۆری ناوچەکـە کەوتینـەڕێ بـەرەو بالیسـان، بـەر لەنیـوەڕۆ گەیشـتینە سـەر گۆڕسـتانی بالیسـان ' لـەوێ هەندێـك خەڵکـی ترمـان بـەدی کـرد کـە ئەوانیـش تەرمـی شـەهیدەکانیان دەردەهێنایـەوەو دەیانـبردەوە زێـدی خۆیـان، یـەك لەوانـەی لەسـەر گۆڕسـتان بـوو مـەلای گوندەکـە بـوو' کـە چـاوی پێـمان کـەوت هاتـە لامـان و زانـی ئێمـە کەسـوکاری شـەهید ئەحمەدیـن ' گۆڕەکـەی پـێ نیشـان دایـن و گوتـی ئێمـە بەئامانـەت ناشـتوومانە، لەماوەیەکـی کـەم دا گۆڕەکەمـان هەڵدایـەوەو تەرمـی شـەهید ئەحمەدمـان خسـتە نـاو ئۆتۆمبیلەکـەی ئێمـەو بەڕێکەوتیـن، لـە بازگـەی هیـزۆپ کەمێك ڕایانگرتیـن دواتـر هێشـتیان بڕۆیـن بـەڵام لـە بازگـەی کۆیـە بەڕێوەبـەری ئەمـن لـەوێ بـوو ڕێگەیـان پـێ نەدایـن بەناچـاری گەڕاینـەوە، لەپێچـی یەکەمـی هەیبەسـوڵتان لامـان دایـە نـاو دارەکان کاتێـك مـام حاجـی عەزیـزی کانـی لەلـە

---

[1] - گفتوگۆ لەگەڵ عەبدولا قەمبەری لە ڕێککەوتی ٧-٢-٢٠٢١

گەیشتە ئەوێ پرسی بۆ وەستاون؟ گوتمان تەرمی شەهید ئەحمەدمان هێناوەتەوە بەڵام ڕێگەمان نادەن بیبەینەوە، ئەویش ڕێگایەکی خۆڵی پێ نیشان داین و لەوێ بەرەو دەشتی کۆیەو داوداوە بەڕێکەوتین، دواتر هاتینە ناحیەی تەق تەق و لەوێوەش بۆ گوندی قەمبەر، نزیك ڕۆژئاوا گەیشتینەوە قەمبەرو تەرمی شەهید ئەحمەدمان ناشت. ئەوەی جێگەی باس کردنە خەڵکێکی ئێجگار زۆر لە قەمبەر لەچاوەڕوانی گەیشتنەوەی تەرمی شەهید ئەحمەد بوون کە لە هەشت نۆ گوندەوە هاتبوون بۆ قەمبەر[1].

---

١- گفتوگۆ لەگەڵ مام قادر عەولا تازەدێ لە ڕێککەوتی ٧-٢-٢٠٢١

ناوی تەواوی قادر عەبدولا ڕەسوولە، لە ساڵی ١٩٥٠ لە گوندی تازەدێی سەر بەناحیەی سێگردکان لە دایك بوە، خزمایەتیان لەگەڵ بنەماڵەی شەهید ئەحمەد هەیە، ئێستا لە گوندی تازەدێ نیشتەجێیە.

# دوو ڕاچەنین

عەبـدوڵای بـرای شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری ڕووداوێکـی گێڕایـەوەو گوتـی : لەئایـاری سـاڵی ٢٠١٠ لەشـاری مانجسـتەری وڵاتـی بەریتانیـا سـەردانی فرۆشـگایەکم کـرد ، بەڕێکـەوت توشـی کوردێـك هاتـم و کەوتینـە گفتوگـۆو یەکـتر ناسـین. ئـەو نـاوی ئەحمـەد وەلـی بـوو ، لێـم پرسـی :

-خەڵکی کوێی :

گوتی :

-خەڵکی گوندی بالیسانم .

لەبـەر ئـەوەی کاکـم ئەحمـەد لەبالیسـان شـەهید بـوە هەرکەسێك و لەهـەر بۆنـەو بەهـەر هۆکارێکـەوە بێـت نـاوی بالیسـان بهێنێت توشـی ڕاچەڵەکیـن دەبـم، هـەر بەڕاسـتی ڕاچەڵەکیـم و خەیـاڵ و بیرکردنـەوەم چـوەوە سـەر ئـەو ڕۆژگارەی کاکـم لـەوێ شـەهید بـوو، مـن لەنـاو بیرکردنـەوەو ڕامـان و داڵغەیەکـی قـووڵ دا بـوم، کاتێـك ئەویـش پرسـی :

-تۆ خەڵکی کوێی ؟

منیش بەدەم ئازارەوە گوتم :

-خەڵکی گوندی قەمبەرم .

پیاوەکە ووردتر تەماشای کردم.

-هەر بەڕاستی خەڵکی قەمبەری ؟

ئەو بە سەر سوڕمانێکی زۆرەوە وای گوت، منیش گوتم :

-دڵنیابە خەڵکی گوندی قەمبەرم.

هەردووکمان بۆ ماوەیەکی کەم بێدەنگ بووین، دواتر پرسی :

-شەهیدێکتان هەبوو بەناوی ئەحمەد قەمبەری، دەتناسی ؟

-بەڵێ دەمناسی، ...................... برام بوو .

پیاوەکە ڕاچەنی، یەکسەر دەستی کرد بەگریان، ئەو منیشی هێنایە گریان، دەتگوت بەر تەزوی کارەبا کەوتوە، دڵی پڕ بوو لە خەم و ئازار، هێواش هێواش فرمێسك لە چاوانی هاتەوە خوارەوە ، دواتر باوەشی پیا کردم. ئنجا گوتی:

-لەبەر ئەوەی ئەحمەد قەمبەری پیاوێکی بەڕێزو خاوەن ئەدەب و ڕەوشتی بەرز بوو هەموو خەڵك خۆشیدەویست، وەك کوڕی ماڵەکەمان وا بوو.

# ئەو وشانەی لەسەر ئەحمەد قەمبەری نوسراوە

**ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان:**

کتێبێکی قەوارە گەورەیەو لە ٨٧٠ لاپەڕە پێکهاتوە، سەرپەرشتیاری گشتی ئینسکلۆپیدیاکە نوسەرو ڕووناکبیر فەرید ئەسەسەردە، سکرتێری نوسینیشی کەیوان سەعیدە. ئەندامانی دەستەی کارا بریتین لە ئاوات کۆکەیی، ئیبراهیم هەورامی، خالد هەرکی، ڕەنج جەعفەر. ئەم کتێبە بەپیتی ئەبجەدی وێنەو ژیاننامەی سەرکردەو کادرە باڵاکان و گێڕانەوەی شەڕو داستان و نەبەردی و بەشێك لەکارەساتەکانی بڵاو کردۆتەوە، لەلاپەڕە ٣٩ یدا وێنەو ژیاننامەی شەهید ئەحمەد قەمبەری بڵاو کردۆتەوە.

**پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن**

نوسەری ئەم کتێبە نەوشیروان مستەفا ئەمینە، بەرگی دووەمی یادەوەریە مێژووییەکانی خۆیەتی لەماوەی ساڵانی ١٩٧٩ بۆ ١٩٨٣، لەساڵی ١٩٩٧ بەچاپی گەیاندوە. نوسەر لە چەند شوێنێك ناوی شەهید ئەحمەد قەمبەری دەهێنێت و بەکادرێکی ئازاو دڵسۆزو پاك و خاکی ناوی دەبات.

## بیرەوەری ڕۆژانی سەختی خەبات

نوسەری ئەم کتێبە پێشمەرگەی دێرین ئەحمەد عەزیز ڕەسووڵە کە بە ئەحمەد کوردە ناسراوە، ناوەڕۆکی کتێبەکە یادەوەریەکانی خۆیەتی لەسەردەمی پێشمەرگایەتی، لەلاپەڕە ١٢٦ی کتێبەکەی باس لەشەڕەکەی دەواجنی تەق تەق دەکات کە ڕاستەوخۆ شەهید ئەحمەد قەمبەری سەرپەرشتی ئەو چالاکیەی کردوە. ئەحمەد کوردە لەچەند شوێنێکی تری کتێبەکەی، باسی ڕۆڵ و ئازایەتی شەهید ئەحمەد قەمبەری دەکات.

## فەرموودەکانی ترس

شەماڵ عەبدولاّی نوسەرو شاعر لە دیوانە شعرێکی خۆیدا بەناوی فەرموودەکانی ترس دەقە شعرێکی بەبالاّی شەهید ئەحمەد قەمبەریدا نوسیوە بەناونیشانی ئەوە دیسان هەگبەی پشکۆی ئەم شارە خۆی لە ڕووباری خەم دەخوات.

فەرموودەکانی ترس ' ١٧٨ شعری سەردەمی جیاجیای لە خۆ گرتووەو لە ١٨٤ لاپەڕەدا جێیان کراوەتەوە، شەماڵ عبدلاّ ئەم شعرەی لە ساڵی ١٩٨٣ دا نوسیوەو لە هەمان ساڵدا لەگۆڤاری پێشمەرگە کە ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتیی دەری دەکرد بڵاوکردۆتەوە، ئەمەی لای خوارەوە قەسیدەکەی شاعیرە :

هەر کەزانیت  وا خەریکن

دەست بنێنە بینەقاقای نیشتیمانت

بۆ جاری تر ، تفەنگەکەت کردەوە شان

پشتت کردە قەمبەرو

بەرەو هەڵۆی کوێستانەکان بەڕێکەوتی

هەر کە زانی  وا خەریکن

گەرووی شمشاڵ پەپوی لەسەر هەڵنیشێنن

چاوت کردە نەستێرەو

لەسەر سێرەی خەم ڕەوێنی تفەنگەکەت

مۆمی تەمەنت بۆ داگیرساند

پەنجەت کردە گەڵای سەوزی هیواکانی ئەم سەدەیەو

لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەت ڕەگی ژیانت بۆ داکوتاند

هەر کەزانیت  وا خەریکن

نیشتیمانت بسوتێنن

خوێن چۆڕایە دەمارتەوە،

وەك ژیلەمۆ

بە کزەبایەکی شەماڵ خۆت تەکاندو

سەرت لەناو خۆڵەمێشی کارەساتا دەرهێناو

بووی بەپشکۆ

نەتهێشت قەندیل غەمبار بێت و

مەندیلەکەی بۆر هەڵگەڕێ

هێندە شەیدای نیشتیمان بووی

زیکری عشقت تەنیا لەسەر گوێسەبانەی هەژارانا ئۆقرەی دەگرت

تۆ نەتتوانی لەپێشانگای ئەم خاکەدا خۆ ببوێری

کەژانی هەژارانی تێ دەکوڵێ

ئازارەکەی بێ حەجمانە لەحەژمەتا

سمکۆڵ لەداو بەرد دەگری

کازیوە بوو

کاتێ لەگەڵ ڕێژنە بارانی ئەم بەهارەدا

لەگەڵ گرمەو ناڵینی،

پەلە هەوری روخسار ڕەش هەڵگەڕاودا

لێزمەی گوللە پاساریەکانی هەڵفڕاند

سوڕان ........ سوڕان

هەرکە چاویان بەبرینی  بێ قەتماغەی

خەم لێنیشتووی تۆیا کەوت

وەك باشوکە هاتنە خوارێ

خۆیان لەناو قوڕو لیتەی

ژێر تەرمەکەت هەڵێناو فڕینەوە

تا لەقوڵایی ئاسمانا لەناویەکدا توانەوە

بوون بە ئەستێرەیەکی سوور.

گەر لەمەودوا لێم بپرسن کوانێ ئەحمەد ؟

پێیان دەڵێم :

ئا ئەو ئەستێرە سوورە گیانی ئەوە

وەکو جاران لەم دێیەیان بۆ ئەوی تر

هەنگاو دەنێ

وەکو جاران ،

تەنها لەبەردەرگای ماڵە هەژارەکان ئۆقرە دەگرێ

وەکو جاران ،

بەرووخساری پڕ لەخەندەو ئاواتەوە

بەهێمنی دەرگای ماڵە جوتیارەکان دەکاتەوە .

## ئینسکلۆپیدیای شەهیدانی (ی.ن.ک) لە هەولێر

کتێبێکـی قەبـارە گەورەیـەو لـە هـەزار لاپـەڕە پێکهاتـوە، نوسـەری ئـەم کتێبـە ڕۆژنامەنـوس حەیـدەر مەنتکـەو لـە دوو بەرگـدا جێـی زۆرینـەی شـەهیدانی یەکێتیـی کردۆتـەوە لـە سـنوری پارێـزگای هەولێـر، نوسـەر لەبەرگـی یەکەمـی ئینسـکلۆپیدیای شـەهیدانی (ی.ن.ك) بـە دیکۆمێنـت ژیاننامـەو مێـژووی خەباتـی شـەهید ئەحمـەد قەمبـەری خسـتۆتە ڕوو. نووسـەر هەمـان نوسـین و ژیاننامـەی لـە ڕۆژنامـەی کوردسـتانی نـوێ ژمـارە ٦٨٩٢ لـە ڕێککەوتـی ٨-٢-٢٠١٦ بـڵاو کردۆتـەوە.

# سوپاس و پێزانین

بۆ لە چاپدانی ئەم کتێبە چەندین کەس و دامەزراوە هاوکارییان کردیوین کە بەپێویستی دەزانم ئاماژەیان پێ بدەم:

-کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، لقی هەولێر.

-کوڕەکانی کاك محەمەد ئۆمەر برای شەهید ئەحمەد قەمبەری .

-کاك عەبدوڵای برای شەهید ئەحمەد قەمبەری .

-بەشێك لە هاوڕێ و هاوسەنگەرانی شەهید ئەحمەد قەمبەری.



شەهید ئەحمەد قەمبەری لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان
**گوندی مالیمۆس، بەهاری ساڵی ١٩٨١**

**کەسی یەکەم شەهید ئەحمەد قەمبەری، ئەو کەسەی خەریکی نووسینەوەیە سدیق ڕەنجبەرە، ئەوەی تر کاک یوسف زۆزانیە، ئەوەی تریش محەمەد تۆفیق ڕەحیم تۆزێک دیارە.**



**وێنەی شەهید ئەحمەد قەمبەری لە (گوندی بانیماران)**

**دانیشتووەکان لە لای ڕاستەوە: شەهید حەمە زیاد تاڵەبانی، شەهید ئەحمەد قەمبەری، شەهید جەعفەر، قارەمان شینە، عەلی پۆریجە.**

**وەستاوەکان لە لای ڕاستەوە: شەهید فواد گۆمەشینی، ئاشتی، شەهید دەشتی موهەندیس، شەهید مەلا عەزیز، کوردۆ.**



**له لای ڕاستەوە: شەهید ئەحمەد قەمبەری، عەولی ڕێکخستن، مەلا خدری قەرەبەگ**



**گوندی کاموسەک ۱۹۸۲**

**وەستاوەکان لە لای ڕاستەوە: دلێر کانی لەلەیی، شەهید ئەحمەد قەمبەری، خارە جەلال کۆیی، تەڵعەت هیدایەت، د. ڕەفعەت هیدایەت، شەهید خارە فاروق.**

**دانیشتووەکان لە لای ڕاستەوە: ئەکرەم موهەندیس، فەرهاد کادیر، شەهید عەریف ئەکرەم، شەهید چەتۆ، عەولی ڕێکخستن.**



پۆلێک پێشمەرگەی کەرتی دووی شەهید ئەحمەد قەمبەری



وەستاوەکان لە لای ڕاستەوە: شەهید ئیبراهیم، مەلا هاوکار، جووتیار جەبار، نەناسراو، خالید حاجی

دانیشتووەکان لە لای ڕاستەوە: خوا لێی خۆشبوو خارە قاسم، سەفین مەلا قەرە، شەهید مەلا عەزیز بەردەسپی



ڕیــزی دواوە لای ڕاســت: شــەهید فەرهــاد، نەنــاسراو، ســولە قۆڕیتانــی، غەفــوری حاجــی ئەحمــەد قۆڕیتانــی، شــەهید یاســین موعەلیــم، فــازڵ کرمانشــانی، جەعفــەر خورمەڕەیــی، کامــەران بانەمــوردی

ڕیــزی پێشــەوە لــە لای ڕاســت: شــەهید زەعیــم، نەنــاسراو، جووتیــار، شــەهید ڕەمــەزان، ســەعید سیاســی، نەنــاسراو



پۆلێک پێشمەرگەی کەرتی دووی شەهید ئەحمەد قەمبەری



پۆلێک پێشمەرگە





یادی ۳۲ ساڵەی شەهیدبوونی ئەحمەد قەمبەری - هەولێر - هۆڵی میدیا





یادی ٣٢ ساڵەی شەهیدبوونی ئەحمەد قەمبەری - هەولێر - هۆڵی میدیا




**وێنەی دایک و باوکی شەهید ئەحمەد قەمبەری**



**عەبدوڵا ئۆمەر**

برای شەهید ئەحمەد قەمبەری



**حاجی محەمەد**

برای شەهید ئەحمەد قەمبەری



حاجی محەمەد (برای شەهید ئەحمەد قەمبەری) و ڕەحیمە حەمە ڕەشید (براژنی شەهید ئەحمەد قەمبەری).



**برازاکانی شەهید ئەحمەد قەمبەری**

لای ڕاست: دانا محەمەد، مەسعود محەمەد، م. هیمداد محەمەد، هێمن محەمەد، پارێزەر بیلال محەمەد.



لـە لای ڕاسـتەوە: ناهیـد عومـەر (براژنـی شـەهید) کۆرپەکـەی ئامێـزی؛ تۆڵـە عەبـدوڵا (بـرازای شـەهید)، عەبـدوڵا ئۆمـەر (بـرای شـەهید)، زێنـەب خـدر (دایکـی شـەهید)، هێمـن محەمـەد (بـرازای شـەهید).



لـە لای ڕاسـتەوە: عەبـدوڵا ئۆمـەر (بـرای شـەهید)، توێـژەر عەبـدوڵا (بـرازای شـەهید)، تۆڵـە عەبـدوڵا (بـرازای شـەهید)، ناهیـد عومـەر (براژنـی شـەهید(، توانـا عەبـدوڵا (بـرازای شـەهید).





ڕەحیمە ئۆمەر خوشکی شەهید

خوا لێ خۆشبوو
مریەم ئۆمەر خوشکی شەهید



خوا لێ خۆشبوو فاتم ئۆمەر خوشکی شەهید







هاوسەنگەرانی شەهید ئەحمەد قەمبەری لەسەر مەزاری شەهید ئەحمەد، لە گوندی قەمبەر



لەسەر مەزاری شەهید ئەحمەد قەمبەری



نووسەر لەگەڵ مەلا سەلام بالیسانی ئەو کەسەی تەرمی شەهید ئەحمەدی

بە خاک سپارد لە گردی قراتیلۆک-بالیسان



نووسەر لەگەڵ محەمەدی حاجی مەحموود

سکرتێری حزبی سۆسیالستی کوردستان



تیشە شاخی ئۆخزبەگ ئەو شوێنەی ئەحمەد قەمبەری لێی شەهیدبوو، ئێستا خەڵکی ناوچەکە ناویانناوە تیشە شاخی شەهید ئەحمەد قەمبەری.

